پرۆژەی ئیشک 43

دەروازەیەک بۆ

# زانستەکانی قورئان

ئیکرام کەریم

# دەروازەیەك بۆ زانستەكانی قورئان


نووسینی:

ئیكرام كەریم



١٤٣٠ كۆچی

٢٠٠٩ زایینی

ناوی کتێب: دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان

نووسینی: ئیکرام کەریم

ژمارەی سپاردن: (٢٤٥١) ساڵی (٢٠٠٨)

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٨

نەخشەسازی ناوەوە: ئیدریس سیوەیلی

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (٤٣)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆری ئینتەرنێت : www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە: info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

**الحمد لله وكفى وسلام على عباده الذين اصطفى وبعد.**

ئیمامی "ترمیذی" له حارسی کوڕی عەبدوڵڵای هەمەدانییەوە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: چوومە مزگەوتو سەیر ئەکەم خەڵکی ڕۆچوون لە دەمەتەقە کردندا و منیش چوومە لای عەلی (خوای لێ ڕازی بێت)و ئەم هەواڵەم پێ گەیاند، فەرمووی: باشە خەڵکی دەستیان داوەتە شتی وا؟ وتم: بەڵێ! فەرمووی: بەڵام من جارێکیان لە پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وآله وسلم) بیست فەرمووی: ئاگادار بن، لەمەودوا فیتنە زۆر ئەبێت، عەرزم کرد جا چارمان چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (چارتان) قورئانە... **كتاب الله فيه نبأ ماقبلكم، وخبر مابعدكم، هو الفصل ليس بالهزل، من تركه من جبار قصمه الله، ومن ابتغى الهدى في غيره اضله الله، وهو حبل الله المتين وهو الذكر الحكيم وهو الصراط المستقيم، وهو الذي لا تزيغ به الأهواء ولا تلتبس به الألسنة ولا يشبع منه العلماء، ولا يخلق على كثرة الرد ولا تنقضي عجائبه، هو الذي لم تنته الجن إذ سمعته حتى قالوا: (.. إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآناً عَجَباً * يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ..) (الجن: ١ـ ٢) من قال به صدق ومن عمل به أجر، ومن دعا اليه هدي الى صراط مستقيم".**[1]

واتە: دەنگوباسی پێش خۆتان و هەواڵی پاش خۆتانی تێدایە، دادوەریی نێوانتان ئەکات، ئەم قورئانە قسەی کار بڕ ئەکاتو شۆخی ناکات، هەرکەسێك لە ترسی خەڵکی زۆردار وازی لێ بهێنێ خوا پشتی ئەشکێنێو هەرکەسیش عەودالی هیدایەت بێتو لە جگە لە قورئاندا بۆی بگەڕێ خوا ڕێگەی لێ وون ئەکات، ئەم قورئانە (حبل)ی پتەوی خوای گەورەیە لە ئاسمانەوە شۆڕی کردۆتە خوارەوە بۆ بەندەکانی تا دەستی پێوە بگرن. ئەم قورئانە ئەو یادەوەرییە کە پڕە لە حیکمەتو دانایی، ئەوەیە ڕێگەی ڕاستو دروست.

ئەم قورئانە ئارەزووی خەڵکی ناتوانێ لای بداتو بە زمانی لوس کەس ناتوانێ گومانو دوودڵی تێدا دروست بکات، زانایان لەم قورئانە تێر نابن، زۆر وتنەوەی قورئان کۆنی ناکاتو شتە سەرسوڕهێنەرەکانی کۆتاییان پێنایەت، ئەم قورئانە ئەو قورئانەیە کە کاتێك

---

[1] جامع الترمذي ١٧٢/٥. ورواه إبن الاثير في "جامع الاصول" من حديث عمر. **هەروەها** (الإستقامة/ إبن تيمية ٢٠/١).

پەرییەکان گوێیان لێبوو خۆیان پێنەگیراوو وتیان: بەراستی گوێمان لە قورئان خوێندنێك بوو کە زۆر سەیر بوو، خەڵکی رادەکێشا بۆ روشدو پێگەیشتنو ئێمەش بڕوامان پێی هێنا، هەرکەس بەم قورئانە قسە بکات راست ئەڵێتو هەرکەسیش کاری پێ بکات پاداشت وەرئەگرێت و هەرکەسیش خەڵك بۆ ئەم قورئانە بانگ بکات ئەکەوێتە سەر رێگەیەکی رێكو راست..".

# پێشەکیی

بەراستیی پێغەمبەر  زۆر راست ئەفەرموێ کە قورئان تا دونیا دونیایە شتی سەیروسەرسوڕهێنی لێ نابڕێت، هەر رۆژەی زانایەك نهێنییەك لەم قورئانە دەردەهێنێو هەر رۆژەی دامەزراوەیەك ئایەتێك ئەکاتە جێگەی گرنگیدانی خۆی و لەو سەرەوە بە کۆڵێك ئیعجازەوە دێتەدەرەوە.

ئەگەر لە کۆندا زیاتر بۆ نهێنییەکانی پرسە ئاینییەکان گەڕاون، ئەوە ئەمڕۆ زانایان بۆ نهێنی پرسە گەورەو بچووکەکانی ئەم مرۆڤە ئەگەڕێنو هەرجارەی نهێنییەك سەرنجیان رائەکێشێ. پرۆفیسۆری فەرەنساوی ـ مۆریس بۆکای ـ دەڵێ: "بەبێ هیچ بڕیارێکی پێشوەختو زۆر بابەتییانە دەستم دایە لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەم قورئانە، زیاتر بەشوێن ئەوەدا ئەگەڕام رادەی ڕێکەوتنی قورئان لەگەڵ زانستی تازەدا بەراورد بکەم.. گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە قورئان هیچ قسەیەکی نەکردووە جێگەی رەخنەی زانست بێت لەم سەردەمە تازەدا".[1]

(ول دیورانت) لە کتێبی "قصة الحضارة: ١٣/٦٨-٦٩"[2] دا ئەڵێ: ".. چواردە سەدەیە ئەم قورئانە هەر بە پارێزراوی لە ئەندێشەی موسڵماناندا ماوەتەوەو بیروڕای (خەیاڵ)یان ئەوروژێنێتو رەوشتیان بۆ دروست ئەکاتو عەقڵی سەدان ملیۆن پیاو دەمەزەرد دەکاتەوە، قورئان لە دەروونەکاندا سادەترین بیروباوەڕ دائەمەزرێنێت، کە زۆر کەم ئاڵۆزی تێدا ئەبینیو دوورە لەرێوڕەسمو سرووتە ئاینییەکانەوە، ئەو بیروباوەڕانە لە هەموو بیروباوەڕێکی تر ئازادترەو دوورە لە کەهەنوتی و بتپەرستی، قورئان گەورەترین رۆڵی هەیە لە بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیریو رەوشتی موسڵماناندا، هەر قورئان بنەماکانی سستمی کۆمەڵایەتیو یەك کۆمەڵگەیی دامەزراندووەو موسڵمانان هانئەدات بۆ ئەوەی کار بە بنەماکانی تەندروستی بکەن، قورئان عەقڵی موسڵمانان لە ئەفسانەو گومان و خەیاڵو ستەمو دڵڕەقی رزگار کردووە، قورئان باری کۆیلەی زۆر چاك کردووەو لە دەروونی خەڵکە سەرکزەکاندا رێزو سەربەرزی ئەچێنێت و لەناو موسڵماناندا میانڕەویو خۆدوورگرتنێکی

---

[1] عماد الدین خلیل (قالوا عن الاسلام) ص٤٧.

[2] قصة الحضارة، ول دیورانت (١٣/٦٨ - ٦٩).

وای  له ئارەزووبازیی دروست کردووە کە هاوشێوەی ئەوە لە هیچ پارچە زەوییەکی ئەم دونیایەدا نابینی کە پیاوە سپی پێستەکانی تێدا نیشتەجێن.."

(مۆنتیگمری وات) راگری پسپۆڕی بەشی لێکۆڵینەوە عەرەبییەکان لە زانکۆی (ادنبرا) ئەڵێت: "بەرای من هەڵوێستمان لە ئاین هەرچۆن بێت ئەرکی سەرشانمانە دان بەوەدا بنێین کە پەیامی قورئان لە دۆخی مەککەیدا پرۆژەیەکی بیانکەرو گەورەیە، بەبێگومان (ئەوکاتە) کۆمەڵێك کێشە هەبوو چارەسەریان ئەخواستو چەندان قەیران هەبوون کە هەندێك هەوڵی سووککردنی ئەو کێشەو قەیرانانەیان داوە، بەڵام ئەوە "موستەحیل"ە کە لە ریگەی بیرکردنەوەی لۆژیکانەوە بتوانرایە بگەیتە ئەو پەیامەی کە قورئان پێیگەیشت! گومان لەوەدا نییە کە پەیامی قورئان چارەسەری گرفتە کۆمەڵایەتییو رەوشتیو فیکرییەکان ئەکات، بەڵام دیارە هەموو بەیەکجار چارەسەر ناکاتو بەشێوەیەکی بەڵگەنەویستانەش نا، لەوانەیە مێژوونووسێکی دونیاپەرست بڵێت: موحەممەد بەرێکەوت کەوت بەسەر ئەم بیروڕایانەدا کە وەك کلیل وابوون بۆ گیروگرفتە بنەرەتییەکانی ئەو سەردەمە، ئەمە عەقڵ نایبڕێت، نەك ئەمە، بەڵکو عەقڵ ئەوەش نابڕێ کە هەوڵە ئەزمونییەکان و بیرە تیژەکانیش بتوانن وەك پێویست پەیامی قورئان پووچ بکەنەوە". [1] ئەمە رای زانایان لەم سەردەمە تازانەدا و زانایانی سەردەمە کۆنەکانیش هەمان رایان هەبووە لەسەر قورئانو گەورەیی قورئان، تەنانەت قاضي ئەبوبەکر ئیبن ئەلعەرەبی لە کتێبی (قانون التأويل)دا ئەفەرموێت: قورئان (٧٧٤٥٠) زانستی لەخۆگرتووە و ئەو ژمارەیەش هەڵدەگرێ چوار جار بکرێتەوە، چونکە هەموو رستەیەکی قورئان هەڵدەگرێ مانایەکی دیارو مانایەکی نادیاری لێوەربگیرێو مانایەکی وەك پێناسەو مانایەکی وەك پارچە پارچە لێوەربگیرێ، ئەمە بەشێوەیەکی رەها جگە لەو مانایانەی پەیوەندی و هەماهەنگی وشەو رستەکان هەموو پێکەوە ئەیدەن کە ئەوە نایەنە هەژمارو خوا (**سبحانه** وتعالى) نەبێت کەس نایزانێت. [2]

هەروەها لە کتێبی (**أسرار ترتيب القرآن**)دا ئەفەرموێ: "هەماهەنگی ئایەتەکانی قورئان لەگەڵ یەکتریدا بە شێوەیەك وەك یەك وشەی تەنیا بنوێنێو مانایەکی یەکگرتوو و دەستەواژەیەکی رێکخراو بدەن بە دەستەوە، ئەوە زانستێکی گەورەیە و تەنیا یەك زانا شك

---

[1] عمادالدين خليل: قالوا عن الاسلام، ص١١٥.

[2] القسطلاني: ارشاد الساري (٢/٧).

ئەبەم کە باسی لێوە کردبێت و تەنیا کاریشی لە سورەتی (**البقرة**)دا کرووەو خوای گەورەش دەرگایەکی گەورەی لە ئێمە کردۆتەوە لەو بوارەدا، بەڵام کە سەیرم کرد کەس نییە بتوانێت هەڵیبگرێتو بۆم دەرکەوت خەڵکی تەمەڵ بوونو هەر حازرخۆریان ئەوێت، سەری ئەو زانستەمان داخستەوەو کردمانە نهێنییەك لە نێوان خۆمانو خوای گەورەداو گەڕاندمانەوە بۆ لای خۆی".[١]

زانایان ئەفەرموون: مەبەست بە زانیارییەکانی قورئان هەموو ئەو زانستانەیە کە پەیوەندن بە قورئانەوە وەك زانستی (هۆیەکانی دابەزینی قورئان، کۆکردنەوەو نووسینەوەو بڵاوکردنەوەی قورئان، چۆنێتی ریزبەندی ئایەتو سورەتەکان، مەککیو مەدەنی لە قورئانداو ناسخو مەنسوخو موحکەمو موتەشابیهو رەهاو تایبەتو .. هتد). بەزانستەکانی قورئان ئەشوترێت "زانستی بنەماکانی تەفسیر"، چونکە باس لە هەموو ئەو باسانە ئەکات کە پێویستە کەسی موفەسیر ئاگای لێیان بێت.

ماوەیەك بوو برایانی پرۆژەی تیشك داوای نووسینێکیان لێ ئەکردم دەربارەی "علوم **القرآن**"، منیش جگە لەو داوایەی ئەوان خۆشم هەندێ هاندەری ترم لابوو کە دەست بە نووسینێکی لەو بابەتە بکەم کە یەکێك لەو هاندەرانە ئەوەبوو خەڵکی وا هەیە چۆن سەیری (ئینجیل) و (تەورات) و کتێبەکانی تری میللەتان ئەکات واش سەیری قورئان ئەکاتو ئەشیەوێت کە ئەو جۆرە روانینە بۆ قورئان لە رێگەیەکەوە، یان زیاتر بسەپێنێ بەسەر میللەتی کورددا.

زیاد لەوە قورئان بە پێی ناساندنی خوای گەورە (**جل جلاله**) و پێغەمبەری خوا ئەم قورئان "مکنون"ە، واتە "مستور"و "مصون"و "پڕ نهێنییە"، چونکە صیغەی "مکنون" صیغەی ئیسمی مەفعولە، "مکنون" یانی "مفعول"و "فعل"ەکەی بەرانبەر (كنَّ)ەیەو ماناکانی (كنَّ)ەش لە زمانی عەرەبیدا بە دەوری "داپۆشین" و "پاراستن"و "شاردنەوە"و "بە نهێنی کردن"دا ئەسوڕێتەوە کە هەمووی لە یەك وشەدا جێی ئەبێتەوە کە "خەزێنەی ئەسرار"ە.[٢]

---

[1] العلواني، الوحدة البنائية للقرآن المجيد، ص٤٤و٤٥.

[2] زانایانی زانستی (تجويد) ئەڵێن: پیتەکانی سەرەتای سورەتەکان وەك: "الم، المر، كهيعص، حم.."، ئەگەر بدەیتە دەم یەکتری بەبێ دووبارە کردنەوە ئەوا ئەم رستیە دەردەچێت: "لفظ حكيم قاطع لە سر" واتە: دەقێکی پڕ حیکمەتی قسەبڕەو خاوەنی نهێنییە".

ئەم خەزێنە پارێزراوەو دەستی ناحەزو ناپاکی پێ ناگات وەك لە دێرەی ئەو مەدحەدا ئەفەرموێ: **(فِي كِتَابٍ مَّكْنُونٍ * لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ * تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ)** (الواقعە: ٧٨ـ ٨٠).[1] كتێبێكی پارێزراوە و ئاخنراوە بە نهێنی، كە جگە لە پاكەكان كەس دەستی بەری ناكەوێ و لە لایەن "خاوەنی هەموو جیهانەكانەوە" دابەزیوە.

بۆیە منیش حەزم كرد چەند نهێنییەكی ئەو قورئانە سەرسوڕهێنەرە بە زمانی كوردی بنووسم بۆ ئەم نەوە تازەیە كە كەوتووەتە رۆژێك ئەوەی بە كوردی نەنووسرێت دەربارەی قورئانو دین ـ مەگەر بە دەگمەن ـ نایخوێنێتەوەو لێی تێناگات، لەبەرئەوە من بەئەركی سەرشانی ئەزانم گۆشەكانی ئەم دینەو ئەم قورئانە بەپێی توانا بدەمە بەر تیشكو ویژدانم ئاسودە بكەم.

بۆ كۆكردنەوەی ماددەكانی ئەم نووسینە دوو شێوازم گرتە بەر:

یەكەمیان: كۆكردنەوەی ئەو كتێبانەی لەسەر زانستی قورئان **(علوم القرآن)** نووسراون.
دووەمیان: ئەو كتێبانەی لەسەر نهێنیو گەورەیی قورئان نووسراون. دوای ئەوە دەستم بە خوێندنەوەی سەرلەنوێی ئەو كتێبانە كردەوەو ئەم هێڵكارییەم پێشنیار كرد كە ببێتە بەرنامەی نووسینەكە:

ـ ئەم پێشەكییەو لە پێش هەموو بەشێكیشدا دەروازەیەكم كردوەتەوە لە بەشەكەو باسەكانی.

ـ بەشی یەكەم: باسی چۆنییەتی نووسینەوەی قورئان دەكات، لەسەردەمە جیاجیاكانداو كردومەتە چوار سەردەم، سەردەمی پێغەمبەر **(صلی الله علیه وآله وسلم)** و سەردەمی ئەبوبەكرو سەردەمی عوسمان و ئەم سەردەمە تازانە.

---

[1] العالمین: كۆی (العالم)ە، واتە : جیهان، كەواتە (عالمین) واتە: چەند جیهانێك، زانایان ئەفەرموون: جیهان چەند جۆرێكە، جۆرێكیان پێی ئەوترێت (مولك)و جۆرێكیان پێی ئەوترێت "مەلەكوت"، موڵك جیهانی مادەیە كە سێ جۆر خولقاوی تێدایە، ماددەی تەنیا (مادة مجردة)، مادەكە ژیانی بۆ زیاد كرابێت، مادەكە ژیان و گیانی بۆ زیاد كرابێت، مەلەكوت جیهانێكە پڕ طوهرو پاكی، گەورەمان حەزرەتی عیسا (علیه السلام) ئەفەرموێ: "لا یلج ملكوت السماء من لم یولد مرتین"، ناچێتە ناو جیهانی مەلەكوتەوە كەسێك دوو جار لەدایك نەبێت، جارێك ئەمەی كە هەموو كەس ئەیبینێ، جارێك لە دونیای گوناهو ماددیانەوە بێیتە دەرەوە بە سورشتی مرۆڤانەوە بچیتە دونیای طوهرو پاكیو شوێنی خۆت بگری لە جیهانی مەلەكوتدا..

- بەشی دووەم: باسی بابەتە زۆرەکانی ناو قورئان ئەکات و وەك زانایانی پێشوو کردوومانە بە دوو بابەت: یاساو ئەحکامەکانو جگە لە یاساکان.

- بەشی سێیەم: باسی زانستەکانی قورئان ئەکات کە بە گەورەترین بەشی ئەم کتێبە دادەنرێ و تێیدا باسی "دە" جۆر زانستی قورئانیمان کردووە، کە بە زانستی چاك خوێندنەوەی قورئان دەستمان پێ کردووەو بە باسی چەند زانستێکی تازەی دەرهێنراو لە قورئاندا کۆتاییمان پێ هێناوە.

- بەشی چوارەم: باسی هەندێ هەڵسوکەوتمان کردووە لەگەڵ قورئاندا کە لای هەندێك جێگەی مشتو مڕەو تا ئێستا نازانێ لە رووی شەرعەوە ئەو هەڵسوکەوتانە چەندێك دروستەو چەندێك نادروستە وەك هەستان لەبەر قورئان، یان ماچکردنی، یان خوێندنی بۆ مردوو، یان خوێندنەوەی بەبێ دەستنوێژ.. هتد، کە (١٠) بڕگەمان باس کردووە لەم بەشەداو زۆر باسو خواستی تر هەبوو لەبەر گەورە نەبوونەوەی کتێبەکە چاومان لێ نوقاند، بەو هیوایەی کە کتێبو دەرفەتی تر بیانگرێتە خۆی.

لە کۆتاییشدا باسێکی ئەم گەشتەی خۆم ئەکەم کە بەناو ئەم کتێبەدا کردوومە کە من بۆ خۆم زۆر نهێنی هەبوو پێم نەزانیبوو، بەرەکەتی قورئان بۆمی دەرخستو تێگەیشتم کە تا لە قورئان نزیك ببیتەوە لە خواو لە عەقڵو لە رۆشنبیریو بەرەکەتو زانیاری نزیك ئەبیتەوەو هەرکەسیش بستێك لە هاوڕێکەی زیاتر نزیك بێت لە قورئان خەزنەیەکی زیاتری نهێنییەکانی ئەم دینەی لا دەست ئەکەوێتو کێش ئەیەوێ لەم دینە زۆرتر و زیاتر شارەزا ببێت با شەووڕۆژ ئەم قورئانە لە ئامێز بگرێو دەمی با هەمیشە لە کانیاوی قورئاندا بێت، ئەوجا بۆی دەرئەکەوێ کە قورئان چۆن سەرچاوەی بەرکەتو رۆحیاتە، واش سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی رۆشنبیریو فکرو زانستە. کێش بڕوای وانییە با تاقی بکاتەوە.

سوپاسو پێزانینشم هەیە بۆ هەموو ئەوانەی ئەم ئەرکە پیرۆزەیان خستە سەرشانم و داواکارم کە بەچاوی سۆزەوە بڕواننە نووسینەکەو بە دیاری هەڵەکانم بۆ بنێرنەوە، چونکە وەك حەزرەتی عەلی ئەفەرموێ: **"ولست في نفسي بفوق أن أخطيء ولا آمن ذلك من نفسي"**. ئەم نووسینەش هەندێك ئیجتیهاداتی شەخسی تێکەوتووە کە سروشتی نووسینەکە خواستوویەتیو داواکارم لە هەموو خوێنەرێکی بەڕێز کە لەسەرو خۆمەوەیە یان لوتفی هەیەو بەهاوشانی خۆیم ئەزانێ، ئاگادارم بکاتەوە لە هەموو هەڵەو کەموکوڕتییەك تا ئەویش بەشداریی خێری چاککردنەوەیان بکات لە چاپەکانی داهاتوودا.

خێری ئەم نووسینەشم ئەنێرم بۆ نامەی کردەوەکانی دایكو باوکم کە سوپاس بۆ خوا ڕێزی قورئانو شەریعەتیان لەسەر سەریان دانابوو، ئەگەر بە شایەنم بزانیایە ئەمکردە دیاری بۆ سەروەرو نوری چاوم، ڕێبەرو هێزی هەناوم حەزرەتی موحەممەد **(صلی الله علیه وآله وسلم)**، بەڵام واباشە بۆم پابەندی ئەدەب بمو سنوور بفامم، بۆیە پێشکەشی ئەکەم بە صەحابە بەڕێزو نەجیبزادەکانی کە وێنەیەکی خۆی بوونو بەدەستپاکییەوە ئەم قورئانە و ئەم ئاینیەیان گەیاندە ئێمەو فێری (توحید)و فەرزو سوننەتو ئەدەب و تەبلیغاتیان کردین، کە پێنج ئەرکە گەورەکەی ئاینین.

(وَعَلَى اللّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ وَمِنْهَا جَآئِرٌ وَلَوْ شَاء لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ) (النحل: ٩).

**أقول قولي هذا واستغفر الله لي ولكم**

**ئیکرام کەریم**

**هەڵەبجە/ چواری ڕەبیعی دووەمی/ ١٤٢٧كۆچی**

**٢٠٠٧/٤/٢١ زاینی**

# بەشی یەکەم:
# قورئان چییەو چۆن نووسرایەوە؟

## دەروازەیەك

ئەم قورئانە کە قسەو و راسپاردەکانی خوای گەورەیە بۆ هەموو مرۆڤەکان ئەفەرموێ: **(وَلَوْ أَنَّ قُرْآناً سُيِّرَتْ بِهِ الْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ الأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ الْمَوْتَى بَل لِّلّهِ الأَمْرُ جَمِيعاً..)** **(الرعد : ٣١ )**. واتە: ئەگەر قورئانێك ببوایە کە بخوێنرایەتەوە بەسەر شاخەکاندا بیخستنایەتە رۆیشتن یان زەوی لەت لەت بکردایە یان مردووی بهێنایەتە قسەکردن، ئەبوو ئەم قورئانە بوایە، بەڵکو هەموو کارەکان لە دەستی خودایە". زانایان ئەفەرموون: وەڵامی (لو) واتە: ئەگەر **(محذوفە)** و تەقدیرەکەی بریتییە لە **(لکان هذا القرآن)** وەك لەسەرەوە تەفسیرەکەیمان کرد. ئەمە یانی چی ؟

ئەمە یانی ئەوە کە ئەگەر خوا بیویستایە ئەو سروشتەی ئەدا بە قورئان، کاتێك بتخوێندایە بەسەر ئێسكو پرسوکی مردوویەکدا خێرا هەڵئەسایەوەو دەستی ئەکردە قسەکردن، یان بتخوێندایەتەوە بەسەر شاخێکدا خێرا ئەیخستە جوڵەو رێکردن، یان بەسەر دەشتو دەرێکدا بتخوێندایەوە شەق شەق ئەبوو لە سامو کاریگەریی‌و هێزی نوری ئەم قورئانە، بەڵام قورئان بۆ ئەمە نەهاتووەو ئەمە کاری ئەو نییە، بەڵکو کاری قورئان بریتییە لەوەی ببێتە کتێبی هیدایەت و خۆراکی رۆحی‌و میتۆدی پرسە جۆربەجۆرەکانی ژیانو ئەم مرۆڤە تا دونیا دونیایە زیاد لەو بەرەکەتو پیرۆزییەی کە هەیەتی سستمە جۆربەجۆرەکانی خۆی‌و ژیانی خۆی لێ وەربگرێ". [1]

هەرئەمەشە هەندێ لە زانایان بەراورد لە نێوان گرنگی موعجیزەی قورئانو گرنگی موعجیزە ماددیەکانی تردا بکەن کە خوا بە پێغەمبەرە پێشووەکانی داوەو باوی ئەم موعجیزە قورئانییە بدەن بەسەر ئەوانی تردا کە دیارە ئەو موعجیزانە بۆ نەوەی خۆیان

---

[1] اضواء قرآنية (فتح الله گولن)، ص٢٠٧.

کاریگەر بوونو کاریگەرییان بۆ ئێستا نەماوە، بەڵام موعجیزەی قورئان تاقیامەت بەردەوامەو هەر کاریگەری ئەمێنیو ئەبێتە سەرچاوەی ئیلهامو سەرچاوەی بیروباوەڕ بۆ خەڵکی لە هەموو بەر مرۆڤایەتییەکاندا.

ئیمامی بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) فەرموویەتی: **"ما من الأنبياء الا اعطى من الآيات مامثله آمن عليه البشر، وانما كان الذي اوتيته وحيا اوحاه الله الي فأرجو أن أكون أكثرهم تبعا يوم القيامة"**.[1] هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە خوای گەورە ئەوەندە ئایەتی بۆ نەناردبێ کە خەڵکی بەوانە بڕوایان هێنا بێ، بەڵام ئەوەی خوای گەورە داویە بەمن (وحی) سروشێکە و بۆی ناردوم، ئومێد دەکەم لە قیامەتدا لە هەموو پێغەمبەران شوێنکەوتووم زۆرتر بێ.

## باسی یەکەم: پێناسەی قورئانی پیرۆز

زانایان باوێك لە نێوانیاندا هەیە لە کاتێکدا کە زاراوەیەك ئەناسێنن دوو جۆر مانای بۆ ئەکەن، لە رووی زمانی عەرەبیو لە رووی بەکارهێنانی ئەو زاراوانە لە لایەن پسپۆڕو زانایانەوە. ئێمەش هەروا دەکەین.

قورئان لە زمانی عەرەبیدا لەسەر وەزنی (فُعلان)ە، ئەم صیغەیەش لە زمانی عەرەبیدا پێی ئەوترێ صیغەی مەصدەر، واتە سەرچاوەیە بۆ کردارەکە کە خوێندنە. و (قرأ)و (اقرأ)و (تقرأ) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای (**نطق بالمكتوب والقى النظر عليه وطالعه**)، (**وجمعه وضم بعضه الى بعض**) و (**حملت وولدت**) و (**دنا**) و (**رجع**) و (**غاب**) و (**هبت**) و (**تنسك**) و (**تعبد**)..[2] دێت کە ئەتوانی هەموویان لە سێ مانای پەیوەندی بەیەکەوە کورت بکەیتەوە:

١ـ سەیرکردنو تێڕوانینو خوێندنەوەی شتێك

٢ـ خوێندنەوەکە بدەیتە دەم یەكو نزیکی بکەیتەوە لە یەکتریو "حامله"ی بکەی بە مانا شاراوەکانییەوە.

٣ـ هەڵکردنی شەماڵی مانای جوانو پڕ نهێنی کە ملکەچی و عەبدایەتی لەو مانانەوە لە دایك ئەبێت.

---

[1] مختصر صحيح البخاري/ الزبيدي/ كتاب فضائل القرآن، باب كيف نزل الوحي، رقم الحديث ١٨٠٦ ص٥١١.

[2] المنجد: وشەی (قرأ).

بەوپێیە بێت قورئان پشکی هەموو ئەو مانانەی تێدایە، یانی: قورئان کتێبێکە و سەیر ئەکرێتو ئەخوێنرێتەوەو خوێنەرەکەی ئەبێت وشەو ئایەتو سورەتەکانی بداتە دەم یەكو نزیکی بکاتەوە لە یەکتری تا مانا شاراوەکانی بۆ دەربکەوێتو پەی بە نهێنییەکانی بەرێت، ئەوکاتە هەست بە شنەی و شەماڵە ئەکات کە لە قورئانەوە لیٚ هەلئەکاتو سەرسامی ئەکاتو زیاترو زیاتر ملکەچ ئەبێت بۆ خوای گەورەو سەری بەندایەتی بۆ ئەخاتە سەر زەوی. بۆ نموونە با ئەم ئایەتە (بخوێنینەوە)و (بیدەینە دەم پێشو پاشەکەی)و چاوەڕوانی (شەماڵی مانای جوانو بەرەکەت) بکەینو بزانین چەندە (چێژی بەندایەتی) دروست ئەکات تێماندا. خوای گەورە ئەفەرمووێ: (**وَلَوْ يُعَجِّلُ اللّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُم بِالْخَيْرِ لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ فَنَذَرُ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ**) (يونس: ١١). واتە: هەروەها ئەگەر خوا وەك چۆن ئەوان داوای خێر ئەکەن بەپەلە ئەیانداتێ هەرواش بەپەلە شەڕ[1] یان بۆ بنێرێ کە ئەوان پەلەی لیدەکەن ئەوە ئەبوو ئەجەلی خۆیانی بۆ بناردنایە، جا ئێمە دەست لە ئەو کەسانەی ئومێدیان بە دیداری ئێمە نییە بەرئەدەین تا لەناو یاخیبوونی خۆیاندا بە دوو دڵییەوە هەر گێژو لول بخۆن".

با ئەم ئایەتە جوان بخوێنینەوە و هەموو پارچەکانی بدەینە دەم یەكو پاشان چاوەڕوانی شەماڵی بەرەکەتو مانای جوان بکەین. مانای ئایەتەکە بە تەواوەتی ئەوەیە:

"ئەگەر سونەتو باری خوا وادامەزرایە کە بە گوێی خەڵکی بکردایە کاتێ داوای سزاو شەڕێك دەکەن و بۆی بناردنایە وەك چۆن کە داوای خێرێك ئەکەن بۆیان ئەنێرێت بەپەلە، ئەوە ئەبوو بە پەلە سزای بۆ ئەمانبناردایە، بەڵام باوی خوا وادەمەزراوەو ناشگۆڕێت لەبەرئەوان، خوا مۆڵەتی ستەمکاران ئەداتو تا کاتی خۆی نەیەت حساباتیان لەگەڵ ناکات، جا بە پێی ئەو بەرنامەیە کە باوی خوا لەسەری دامەزراوە مۆڵەتی ئەمانە ئەدات و لێیان ئەگەڕێت تا کاتی خۆیان دێت.

جا دوای ئەمە با ماناکانی تری ئایەتەکەو پێشو پاشەکانی بدەینە دەم یەكو بزانین چی لیٚ ئەکەوێتەوە، ئەم ئایەتە لە سیاقی ئەو ئایەتانەدا هاتووە کە هەندێك هەن نکوڵی لە

---

[1] لە قورئاندا سزای خوایی دوو ناوی تریشی لیٚ نراوە: (شەڕ)و (خراپە)، خوای گەورە بۆ یەکەمیان ئەفەرموێ: (وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاء أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ) (الأنفال: ٣٢). و بۆ (خراپە) ئەفەرموێ: (وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ)، بۆیە ئێمە هەرسێکیانمان بەکارهێناوە.

زیندبوونەوە دەکەن‌و کە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) پێیان ئەڵێ من پەیامبەری خوام‌و بۆ لای ئێوەی ناردوم‌و ئاگادارتان ئەکەمەوە کە سزایەکی سەخت لە پێشتانەوەیە، ئەوان بە گاڵتەکردن و رابواردنێکەوە ئەڵێن: (**وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ**) (**الأنفال: ٣٢**). واتە: خوایە ئەگەر ئەمە ئەو راستەقینەیە لە لای تۆوە هاتووە، بەردەبارانمان بکە لە ئاسمانەوە، یان سزایەکی سەختمان بۆ بنێرە، کە خوای گەورە وەڵامی ئەم پێشنیارەیان ناداتەوە و سزایان دوائەخات بۆ ئەو کاتەی دیاری کردووە بۆیان، "هێمنی‌و ئاسایش‌و خۆشگوزەرانی کاتی" یاخییان ئەکەن‌و ئەگەنە ئەوەی لە عادزی‌و سزای خوا بێخەم ئەبن‌و دەست ئەدەنە پەلەکردن لە خوای گەورەو ئەڵێن: جا کەی ئەم سزایە دێت؟! وا ئەزانن ئەو سزایە نایەتە سەریان‌و خوای گەورەش ئەیەوێ لەوەڵامی ئەم پەلە پەلەکردنیاندا پێیان بڵێ: ئەگەر سونەت‌و باوی خوا وادامەزرایە بەگوێی پەلەپەلی خەڵکی بکردایە "ئەگەر سونەت‌و باری خوا وادامەزرایە کە بە گوێی خەڵکی بکردایە کاتێ داوای سزاو شەرێك دەکەن و بۆی بناردنایە وەك چۆن کە داوای خێرێك ئەکەن بۆیان ئەنێرێت بەپەلە، ئەوە ئەبوو بە پەلە سزای بۆ ئەمانبناردایە، بەڵام باوی خوا وادەمەزراوەو ناشگۆرێت لەبەرئەوان، خوا مۆڵەتی ستەمکاران ئەدات‌و تا کاتی خۆی نەیەت حساباتیان لەگەڵ ناکات، جا بە پێی ئەو بەرنامەیە کە باوی خوا لەسەری دامەزراوە مۆڵەتی ئەمانە ئەدات و لێیان ئەگەرێت تا کاتی خۆیان دێت.

جا ئەگەر سەیری ئەم ئایەتە بکەین لەم سیاقەدا ئەمانەمان بۆ دەرئەکەوێت:

١ـ ئەم قسەیە لە سێ پەرەگراف دروست بووە، دوانیان وەك سەرەتا دامەزراندن‌و سێیەمیان وەك ئەنجام بۆ ئەو دوو سەرەتایەیە، کەچی قورئان (سەرەتایەکیانی) پێچاوەتەوە.

٢ـ سەرەتای یەکەم لە چوار برگە پێکدێت: (پەلەکردنی[1] خوا لە خێرو لە شەردا)، (پەلەپەلکردن[2] بە خوا لە خێرو لە شەردا لەلایەن خەڵکەوە)، کەچی لێرەدا قسەکە تەنیا (پەلەکردنی خوا لە خێردا)و (پەلەپەلکردنی خەڵك لە خوا بۆ شەر) باس دەکات.

---

[1] (پەلەکردن)م بۆ ـ تعجيل ـ بەکارهێناوە.

[2] (پەلەپلێکردن)م بۆ ـ إستعجال ـ بەکارهێناوە.

٣ـ بەراوردکارییەکی سەیر لە ئایەتەکەدا هەیە لەو لێچواندنەدا کە باسی کراوە، لێچواندن لە نێوان "پەلەکردنو پەلەپەلێکردن" باسکراوە نەك لە نێوان (پەلەکردنو پەلەکردن) دا یان لە نێوان (پەلەلێکردنو پەلەپەلێکردن)دا. ئەمە چۆن روویداوە ؟!

١ـ (ئەمما بۆ خاڵی یەکەمیان) بەڵێ سەرەتایەکیانی پێچاوەتەوە، بەڵام دوو بەیداخی شەکاوەی لە هەردوو لای سەرەتاکەدا داچەقاندوە تا خەڵکی بگەڕێن بۆیو لەودیو پەردەکەوە ببینن، لەلای راستەوە وشەی (لو)ی داناوە، کە لە زمانی عەرەبیدا بۆ (نەکردن)و ئیمتیناع بەکاردێتو لە پێشەوەی سەرەتای یەکەمینەکەدا دایناوە، تا بەڵگەبێت کە پەلەکردنەکە لە خوای گەورەوە رووی نەداوە، لەلای راستی سەرەتاکەشەوە پیتی (ف)ی داناوە کە لە زمانی عەرەبیدا بۆ خاڵیکردنەوە (تفریغ) بەکاردێت، (**فنذر**) تا خەڵکی ئەوە تێبگەن کە خوا باوی وایە کە لە خەڵکی ئەگەڕێت، بۆیە لەمانەش گەڕاوەو مۆڵەتی داون.

لێرەدا یەك وردەکاری تر هەیە ئایەتەکە کردوویەتی ئەویش ئەوەیە (ف) جاری وا هەیە بۆ (**عطف**)یش بەکاردێت، جا بۆ ئەوەی کەس زیهنی بەلای ئەوەدا نەچێت کە ئەم (ف)یە بۆ (**عطف**)ە، هاتووە دوو کاری تری کردووە، یەکەمیان: صیغەی فعلەکەی لە (رابردوو = **ماضي**)یەوە کردووە بە (رانەبردوو = **مضارع**)، دووەمیان: لە (**غائیب**)ەوە بۆ (**متکلم**)، نافەرموێ: (**فترك الذين لايرجون لقاء الله**) بۆ نموونە یان بڵێ: (فیترك..)، بەڵکو ئەفەرموێ: (**فنذر**)، صیغەی (**متکلم**)و (**مضارع**)یش، ئەوەش بۆ ئەوەیە خوێنەر بزانێ ئەم دەستەواژە لەوەی پێشوو دابڕاوە لە رووی ماناوەو ئەبێت سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێو بەوشێوەیەش دەروونی خوێنەر هیچ جۆرە شپرزەییو سەرلێتێکچوونێکی تێدا دروست نەبێت.

٢ـ (سەبارەت بە خاڵی دووەمیشیان) لەو چوار بڕگەیە کە باسمان کردن لە خاڵی (٢)دا، ئایەتەکە هاتووە لەهەریەکەیان بڕگەیەکی (سڕیوەتەوە = **حذف**) کردووە، بەڵام نەك لە یەك (جنس)، بەڵکو لەهەر (جنس)ەی بڕگەیەکی سڕیوەتەوە کە وەك ئەوەی بەرانبەریەتی تا ئاماژە بکات بۆ بڕگە سڕاوەکە (**محذوف**)ەکە. واتە: وشەی (**تعجل**) ئاماژە بە هاوشێوەکەی ئەکات لە (پێچوێنراوەکە = **مشبه به**)کەدا و وشەی (إستعجال)یش ئاماژە بۆ هاوشێوەیەکی خۆی ئەکات لە (چوێنراو = **مشبه**)ەکەدا.

ئەمە تۆزێك روون بکەینەوە، چونکە بە راستی رەوانبێژی عەرەبی سانا نییە و پێویستی بە روونکردنەوەی زیاتر هەیە، بۆ ئەو بەرە گەنجەی ئەمڕۆ کە ئەم کتێبەی بۆ نووسراوە..

چوار بڕگەکە ئەمەیە:

ـ پەلەپەلکردن لە خوا بۆ خێر.

ـ پەلەپەلکردن لەخوا بۆ شەڕ.

ـ پەلەکردنی خوا لە ناردنی خێردا

ـ پەلەکردنی خوا لە ناردنی شەڕدا.

ئەنجامەکەی:

ـ خوا لە نادرنی خێردا پەلە ئەکات.

ـ خوا لە نادرنی شەڕدا پەلە ناکات.

جا ئایەتەکە لەهەر یەك لەو چوار بڕگەیە، بڕگەیەکی سڕیوەتەوە (**حذف**) کردووە، نەك لە هەمان ڕەگەز، بەڵکو لەهەر ڕەگەزەی بڕگەیەكو تەنیا ئەمەندەی هێڵاوەتەوە.

ـ (خەڵکی داوا ئەکەن خوا بەپەلە شەڕ (سزاو تۆڵە)یان بۆ بنێرێ، بەڵام خوا لەناردنی شەڕدا پەلە ناکاتو لێدەگەڕێ ئەوەی ئومێدی بە دیداری خوا نییە لەناو سەرگەردانییو دژایەتی خۆیدا هەر گێژو لول بخوات).

٣ ـ (سەبارەت بە خاڵی سێیەمیش) ئایەتەکە ئاماژەیەکی تەواو شەفاف ئەدات و مانایەکی ورد ئەگەیەنێ ئەویش دەرخستنی هۆی لێگەڕانەکەو حیکمەتی پەلەنەکردنە لەناردنی سزاو شەڕەکەدا، ئایەتەکە وێنەی ئەو کەسانەی پەلەپەل لە خوا ئەکەن (سزایان بۆ بنێرێ) وادەکێشێ وەك کەسانێکن بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی ئارەزوویان داوای ئەم خێرە، یان ئەم شەڕە ئەکەن، جا ئەگەر خوا بە گوێیان بکات ئەوە وەك ئەوە وایە کە خواش (جل **جلاله**) ئیستفزاز ئەبێت و وەك ئەوان پەلەپەلکردن لە زاتیدا هەیە (**حاشا وکلا**)!!

شتی زۆرتریش لەم ئایەتەدا هەیەو با زۆر بە کورتی ئاماژەی پێبدەین:

١ـ وشەی (لو) سروشتی ئەبێت بچێتە سەر کرداری ڕابردوو (**فعل ماضي**) کەچی لێرەدا چووتە سەر (**فعل مضارع**) ـ (لو یعجل)ـ هۆکەشی ئەوەیە دوو ئامانج بپێکێ: باوی خوا لە ڕابردوودا و لەمەودواش هەروایە پەلەپەلکردنی خەڵك بۆ ناردنی سزا وای لێ ناکات، بەپەلە سزایان بۆ بنێرێ، کە ئەگەر فیعلەکە (**ماضي**) بوایە ئەو ئامانجانەی نەئەپێکاو خوێنەر هەر پرسیاری ئەما.

٢ـ خوای گەورە نافەرموێ: (**فنذرهم**) یان (**فنذر هؤلاء**) کە سیاقەکە هەڵدەگرێ وابڵێت، بەڵکو ئەفەرموێ: (**فَنَذَرُ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ**) (یونس: ١١). تا

دوو ئامانج بپێکێ، یەکەمیان: بەخەڵکی بگەیەنێ کە سەرچاوەی ئەم پەلەپەلکردنەیان بریتییە لە باوەڕنەبوونیان بە زیندووبونەوە، دووەمیان: بەخەڵکی رابگەیەنێ کە ئەمە باوی خوایە بۆ ئەوان و بۆ هەموو ئەوانەش کە وەك ئەوانن.

**٣ـ** خوا نافەرموێ: "ولو يعجل الله للناس الشر استعجالهم بالخير (لعجّله)"، بەڵکو ئەفەرموێ: (**لقضي اليهم أجلهم**) کە سیاقەکە بە شێوەی سروشتی یەکەمیان هەڵدەگرێ، کەچی خوای گەورە ئەمی تریان ئەفەرموێ، بۆ؟ چونکە شایەن بە سزایەکی لەو جۆرەن کە لە رەگو ریشە بیانهێنێتە دەرو کۆتاییان پێ بهێنێت، بەڵام خوای گەورە وا ناکات و لێیان ئەگەڕێت تا کاتی خۆیان دێت.[1]

ئەمەی رابورد، بۆ ئەوەبوو بزانین کرداری (قرأ)و لێوەرگیراوەکانی کورت ئەبنەوە لە (خوێندنەوە)و (کۆکردنەوە)و (دۆزینەوە)ی ماناو مەبەستی جوان کە بەرەکەتو بەندایەتی لە مرۆڤدا ئەخولقێنێ و خوێنەری بەرێز ئەتوانی بەسەر هەموو (پەرەگرافێکی) قورئاندا ئەم پرۆسەیە جێبەجێ بکاتو ئەو کات تێبگات خوای گەورە بۆ کتێبەکەی خۆی ناوناوە (قورئان)و ناوی نەناوە تەورات، یان زەبور، یان شتی تر.

هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: خوای گەورە بۆیە قورئانی ناو ناوە (**قرآن**)، چونکە بەروبوومی هەموو کتێبە پێشووەکانی تری خوای گەورەی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، بەڵکو بەرهەمی هەموو زانستەکانی لە خۆگرتووە ئەوەتا ئەفەرموێت: (**وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَاناً لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ**)[2]* (النحل: ٨٩). واتە: ئەم کتێبەمان ناردووەتە سەرت تا (هەرچی شت هەیە) رۆشنی بکاتەوە.

ئەوەی رابورد مانای قورئان بوو بەپێی زمانی عەرەبی کە (**قرآن**) و (**قراءة**)و (**قُرء**) لە فیعلی (قرأ) وەردەگیرێو ئەوترێ (**قرأته، قرءاَ، وقراءة وقرآنا**)و چاوگەکە بە مانای ئیسمی مەفعول دێت، واتە (**قرآن**)ی بە مانا (**مقروء**)ە،[3] لەمانەوە ئەگەینە ئەوەی کە

---

[1] بۆ زیاتر ئاگادار بوون بەو نموونەیە سەیری (النبأ العظيم: عبدالله دراز) ص١٣٧تا ١٤١ بکە.

* محمد عبدالله دراز ئەفەرموێت: کە ئەوترێ قورئان تەنیا مەبەست ئەوەنییە هەندێ ئایاتو سورەتی لەخۆی گرتووە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە هەموو زانستەکانی لە خۆگرتووە، واتە وەك ئەوە وایە بڵێ: "الكتاب الجامع للعلوم" یان "العلوم المجموعة في الكتاب"ز. النبأ العظيم، ص١٣.

[2] مباحث في علوم القرآن / مناع القطان، ص١٥.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٥.

کاتێك ئەوترێ قورئان مانای (خوێندنەوەی) تێدایە، چونکە چەند لەفزێکەو بە زمان ئەوترێ، ئەوترێ قورئان مانای (حامیلە بوونە) مەبەست پێی نهێنیو مانا هەڵگرتنە لەناو لەفزەکانیدا وەك خوای گەورەش ئەفەرموێ: (**إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلاً ثَقِيلاً**) (**المزّمِّل: ٥**) دیارە قورسە بەو هەمووە مانایەوە کە هەڵی ئەگرێت ئەووترێ (فڕێدانە)، چونکە وشەکان بەدەمو زمان فڕێئەدرێنە دەرەوە، ئەوترێ قورئان مانای کۆکردنەوەی تێدایە، چونکە ئەو چەند لەفزو ئایەتانە کۆکراونەتەوە لە (مصحف)ێکدا، ئەوترێ قورئان مانای (خواناسینو بەندایەتی کردنی تێدایە)، چونکە هۆیەکە بۆ چاندنو ناشتنی گیانی بەندایەتی لەهەستو نەستو دڵو مێشکی قورئان خوێندا... هەرچەندە کتێبەکانی (علوم قرآن) تەنیا مانای (خوێندنەوەو کۆکردنەوەو دەربڕینو فڕێدان (لەدایکبوون) یان باس کردووەو پشکی ئەو مانایەشیان نەهێناوە بۆ ناوو وشەکە.*

لە زاراوەی زانایاندا پێناسەی قورئان بەم شێوەیە دەکرێت: "قورئان ئەو فەرمودانەی خوایە کە ناردوویەتییە سەر ـ **محمد صلى الله عليه وآله وسلم** ـ کە بۆ عیبادەتکردن ئەخوێنرێتەوە".[1] هەرچەندە هەندی لە زانایان وائەفەرموون: "ئەو فەرمودە موعجیزانەیە کە خوای گەورە ناردوویەتییە سەر موحەممەد کە بۆ عیبادەتکردن ئەخوێنرێتەوە". واتە: وشەی "موعجیز" ئەخەنە سەر پێناسەکە.

بەپێی پێناسەکە وشەی "فەرمودەی خوا" فەرمودەی فریشتەو خەڵکی لە مرۆڤو پەرییەکانی لێدێتە دەرەوە، وشەی "ناردویەتە سەر" ئەو فەرمودانەی خوای نایەتە ناو کە لای خۆیەتی یان لە (**لوح المحفوظ**) دایە، وشەی "**محمد**" (**صلى الله عليه وآله وسلم**)یش هەموو ئەو کتێبانەی تر کە هاتوونەتە سەر (حەزرەتی موساو عیساو ئیبراهیم.. ) دێنە دەرەوەی پێناسەکەو بە موعجیزەو (بۆ عیبادەتکردنیش) چەمکی جگە لە موعجیز و فەرمودە و حەدیسە قودسیەکان لە نێوانەکە هەڵدەوێرێن.

بەهەرحاڵ خوای گەورە قورئانی ناوناوە "قورئان" و ناویشی ناوە "کتێب" لەبەرئەوەی لە لایەك ئەخوێنرێتەوەو لە لایەکیش ئەنووسرێتەوە، ئەم دوو ناوەش ئاماژەیەکی وردی تێدایە جێگەی خۆیەتی باسی بکەین، ئاماژەکە ئەوەیە کە ئەم قورئانە شایان بەوەیەکە لە

*سەبری : (المدخل في فقه القرآن، فرج توفيق ص ٩ـ ١٤) بکە.

[1] مباحث في علوم القرآن مناع القطان، ص١٦.

دوو شوێندا هەڵبگیرێتو بپارێزرێت، نەك لە یەك شوێندا، لەبەر بکرێتو لەسەنگدا هەڵبگیرێتو لە کتێبدا بنووسرێتو بپارێزرێت، تا ئەمیان ببێتە پشتیوانی ئەویانو بەمیان ئەویان بناسرێتەوەو هەمیشە دەست لە ملانی یەکتری بن.

## باسی دووەم: دابەزینەکانی قورئانی پیرۆز

بەو پێیەی قورئان فەرمودەی خوایە واتە "کلام الله"یە، زانایان بیریان لەوە کردوەتەوە ئەم "کلام الله"یە چۆن بووەتە قورئانو دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**)؟ بۆیە ئەفەرموون: قورئان سێ دابەزینی بەخۆوە بینیوە:

**١ـ** لەزاتی خواوە دابەزیوەتە سەر (**لوح المحفوظ**) کە پێرستو تەرجەمەی هەموو بوونی تێدایەو خوای گەورە بەرنامەی تەواوی بوونەوەری تێدا تۆمار کردووەو هەر (هاردێك) لە (**لوح المحفوظ**)ا تایبەتە بە شتێکەوە.

**٢ـ** لە یەکێك لەو هاردانەوە قورئان کۆپیەکی لێوەرگیراوە و هێنراوەتە ئاسمانی یەکەمی دونیا کە پێی ئەوترێت (**بيت العزة**)و وادیارە مەڵبەندێکی زانیاری بێت لەو ئاسمانەدا و ئیشی پاراستنی زانیارییە خوداییەکانە.

**٣ـ** لەو مەڵبەندە پارێزراوەیشەوە بەپێی پێویست هەرجارەی کۆپی چەند ئایەت یان سورەتی لێ گوازراوەتەوە بۆ سەر زەویو گەیاندراوەتە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**)، ئیتر ئەوە لە توانای ژیری ئێمەدا نییەو بەبێ زانیاری راست نییە بە دوای ئەوەدا بگەڕێین ئایا ئەو دابەزینانە بە (پیتو دەنگەوە) بووە یان هەر یەکێکیان بووە، ئەوە جێگەی باسی ئێمە نییە ئەگەر "کلام" ببێتە "کتاب" چی رووئەدات، چونکە ئەوانە غەیبین و (تأمل) و فەلسەفە ناتوانێ پەی بە حەقیقەتیان بەرێت و بەسە بۆ ئێمە کە خوای گەورە هەر بەم قورئانەیە ئەفەرموێ: (**وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَعْلَمُونَ**) (**التوبة: ٦**). و مەبەستیشی پێی ئەم قورئانەیە.. بەهەرحاڵ، قورئان سێ جۆر دابەزینی بەخۆیەوە بینیوە: لە زاتی خواوە بۆ (**لوح المحفوظ**)و لەوێشەوە بۆ (**بيت العزة**)و لەوێشەوە بە بەش بەش بۆ سەر دڵی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**).

ـ ئیمامی حاکم لە ئیبن عەباسەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: **"فصل القرآن من الذکر فوضع في بیت العزة من السماء الدنیا، فجعل جبریل فینزل به علی النبي (صلی الله علیه وآله وسلم)**. واتە: قورئان لە **"ذکر"** (واتە: لوح **المحفوظ**) جیاکرایەوەو لە (**بیت العزة**)دا دانرا، کە لە ئاسمانی دونیادایە، لەوێشەوە جوبرەئیل (بەش بەش) ئەیهێنا بۆ سەر پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**).

ـ خوای گەورە بۆ یەکەم دابەزینیان ئەفەرموێ: (**بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَّجِيدٌ * فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ**) (**البروج: ٢١ـ ٢٢**) ئەمە قورئانێکی خاوەن شکۆیەو لە (لەوحێکی) پارێزراودا تۆمارکراوە.[١] ئیتر ئەو دابەزینە چ چۆنیەتییەکەی و چ کاتەکەی غەیبەو خوا خۆی نەبێت کەس نایزانێ.[٢]

هەروەها (**لوح المحفوظ**) خۆشی شتێکی غەیبەو لە ڕێگەی عەقڵو بیرکردنەوەوە ناتوانین بینشێکی وای دەربارە کۆبکەینەوە کە دووربێت لە دوودڵی، بەڵێ زانایانی زانستی (کلام) ئەڵێن: **"اللوح شيء یلوح للملائکة فیقرؤنه"**.[٣] واتە: **"لوح"** شتێکە لە فریشتەوە دەردەکەوێتو دەست بە خوێندنەوەی ئەکەن.. کەوا دیارە لە لەفزی **"لوّحَ"**، یان **"لاح"** وەرگیراوە. بەڵام ئەو جۆرە راستیانە پێویستە ئێمە کە لە ڕێگەی گوێچکەوە وەریاندەگرین بڕوایان پێبکەینو بیانسەلمێنین با وەك پێویستیش حەقیقەتەکانیان نەزانین.

ـ ئیبن عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەفەرموێت: **"أول شيء کتبه الله في اللوح المحفوظ" "أني أنا الله لا اله الا انا.. محمد رسولي، من استسلم لقضائي وصبر علی بلائي، ولم یشکر نعماني، فلیتخذ الها سوایي"**.[٤] واتە: یەکەمین شتێك خوای گەورە لەناو (**لوح المحفوظ**)دا نووسی ئەمەبوو: "بە دڵنیاییەوە من "الله"م و جگە لە من هیچ خوایەکی تری راست نییە، موحەممەدیش پێغەمبەری منە، هەرکەس ملکەچی بڕیارەکانی من ببێتو ئارام بگرێ لە سەر بەڵاو تاقیکردنەوەکانی منو سوپاسی من بکات لە سەر ئەو هەمووە نازو نیعمەتەی داومەتێ ئەو ناوی بە راستگۆ ئەنووسم و لە ریزی

---

[1] هەندێ لە زانایان وشەی (**محفوظ**) بە (مرفوعی) و هەندێك بـە (**مجـرور**)ی ئەیخوێننـەوەو مانـای یەکـەمیان **"محفـوظ"** ئەبێتە صیفەت بۆ قورئانەکەو لە دووەمیاندا ئەبێتە صیفەت بۆ "لوح"ەکە.

[2] القرآن منهل العلوم، خالد العبیدي، ص٢٤٣.

[3] التفسیر المنیر، وهبة زحیلي، (١٥/٥٤٥).

[4] تفسیر الامام القرطبي، (١٩/٢٩٨).

راستگۆیەکانیشدا زیندووی ئەکەمەوەو هەرکەسیش مل بۆ بڕیارەکانی من نادات و لەسەر تاقیکردنەوەو بەڵای من ئارام ناگرێ و سوپاسی ئەو هەمووە نازو نیبعمەتە ناکات کە رشتوومە بەسەریدا، با بڕوات خوایەکی تر بۆ خۆی پەیدا بکات. پێغەمبەریش (**صلی الله عليه وآله وسلم**) ئەفەرموێ: "**إن الله خلق لوحا محفوظا من درة بيضاء، صفحاتها من ياقوتة حمراء، قلمه نور، وكتابه نور، لله كل يوم ستون وثلاث مئة لحظة، يخلق ويرزق، ويميت ويحيي، يعز ويذل ويفعل مايشاؤه**".[1] واتە: خوای گەورە لەوحێکی پارێزراوی دروست کردووە لە مرواری سپی، پەڕەکانی لە یاقوتێکی سور دروستکراوە، قەڵەمەکانی نوورو روناکییەو کتێبەکەی نوورو روناکییە، خوای گەورە هەموو رۆژێ (سێ سەدو شەست جار) سەیری ئەو لەوحە ئەکات، خولقاو بڕیار ئەداتو رۆزی بریار ئەداتو بڕیاری مردنو بڕیاری ژیان ئەداتو بڕیاری سەربەرزیو بڕیاری سەرکزکردن ئەداتو ئەوەی بیەوێ بڕیاری کردنەکەی ئەدات".[2]

## باسی سێیەم: قۆناغەکانی کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئانی پیرۆز

زانایان کە باسی کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان ئەکەن دوو مەبەستیان هەیە:

یەکەمیان: کۆکردنەوە بە مانای (لەبەرکردنو پاراستنی) دێت، ئەوترێ: (جامعي قورئان) واتە ئەو کەسانەی کە قورئانیان لە سنگیاندا کۆکردووەتەوەو لەبەریان کردووە، خوای گەورە ئەفەرموێ: (**لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ** (١٦) **إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ** (١٧) **فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ**) ( ١٨) واتە: لە کاتی قورئان خوێندندا زمان بەپەلە ئەجوڵێنە بۆ

[1] مجمع الزوائد، الهيثمي، ١٩١/٧).

[2] لەبەرئەوە نەبوایە کە (لوح المحفوظ) یەکێکە لە شتە غەیبەکانو بۆمان نییە سنووری (دەقەکان) ببەزێنن لە ناساندنیاندا بە دڵنیاییەوە ئەمووت: ئەو شوێنە مەڵبەندێکی گەورەی زانیارییەو ئەو وەسفانەی پێغەمبەریش ئەیفەرموێت ئاماژەیە بۆ قەڵەمی لێزەریو شاشەی لێزەریو ئەو فەرمانانەی خواش بەو قەڵەمە لێزەرییانەش "کلیك ئەکرێت بۆ دابەزاندنی ئەو جۆرە زانیارییانە.."، چونکە مانای نوور رووناکیو رۆشنایی و تیشکە و دوور نییە ئەمە ئاماژەو رەمز بێت.

ئەوەی پەلەپەلی پێبکەی، ئێمە لەسەرمانە کە لە سنگی تۆدا کۆی بکەینەوەو پاشان بیخوێنینەوە، جا کاتێك کە ئەیخوێنینەوە بەسەرتا تۆش بە دواییدا بیخوێنەرەوە.[1]

عەبدوڵلای کوڕی عەباس (خوای لێ رازی بێت) ئەفەرموێ: "پێغەمبەر **(صلی الله علیه وآله وسلم)** سەرەتا زەحمەتی زۆری ئەبوو بە دەست قورئان لەبەرکردنەوە ئەوەبوو بەپەلە زمانی ئەجوڵاندو لێوەکانی ئەجوڵاند لەترسی ئەوەی نەوەك لەدەستی دەربچێتو لەبیری بچێتەوە (مەبەستی ئەوەبوو لەبەری بکات) خوای گەورە فەرمووی: **"لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ ( ١٦ ) إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ ( ١٧ ) فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ ( ١٨ )"**. ئەفەرموێ: ئێمە لەسەرمانە کە لە سنگی تۆدا کۆی بکەینەوەو پاشان بیخوێنینەو، **(فَإِذَا قَرَأْنَاهُ)** واتە: کە ناردمانە سەرت، **(فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ)** گوێی بۆ بگرەو بێدەنگ بە، **(ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ)** واتە: لەسەر ئێمەیە کە لە پاشاندا بە زمانی تۆ بە روونی دەری ببڕین، لە لەفزێکی تردا (ئیبن عەباس) ئەفەرموێ: پێغەمبەر دوای ئەمە کە جوبرەئیل ئەهاتە لای سەری دائەخستو گوێی لێ ئەگرت، کە جوبرەئیل ئەڕۆیشتەوە، وەك خۆی ئەیخوێندەوەو هەرچۆنێك کە خوای گەورە پەیمانی پێدا.[2]

هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: خوای گەورە سروشێکی بە سنگی پێغەمبەر **(صلی الله علیه وآله وسلم)** ئەبەخشی لە کاتێکدا کە قورئانی بەسەردا ئەخوێنرایەوە، قورئانەکەی تێدا نەخش ئەبوو، بۆیە ئەڵێن: **"جمعه لك صدرك"** یەکێکە لە ریوایەتەکانی ئیبنو عەباسو (صدر) مەرفوعە لەبەر فاعیلەکە.[3] واتە: سنگت قورئانەکەت بۆ کۆئەکاتەوە، ئەوەش شتێکی سروشییە خوای گەورە بیکات بۆ پێغەمبەر **(صلی الله علیه وآله وسلم)** و بڕوا کردن بە شتی لەو بابەتە لەم رۆژی کۆمپیوتەرو ئینتەرنێتەدا سانایە کە لە سەنتەرێکی گەورەی زانیارییەوە بە (فلاشێك) کام زانیاری وردت هەیە ئەیگوازیتەوە و ئەیخەیتە سەر هاردی کۆمپیوتەرێکی تر ئەگەر خواش سروشی کۆمپیوتەرێك بداتە سنگی پێغەمبەر

---

[1] هەندێك ئەڵێن: ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە ئەرکی قورسی (لەبەرکردنی قورئانی) لە کۆڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) هەڵگرتووەو پێی فەرمووە: خۆت مەرەنجێنە ئێمە لە دڵتا تۆماری ئەکەین.

[2] إرشاد الساري و مختصر صحيح البخاري، الزبيدي، ص١٠، ژمارەی فەرمودەکە(٥).

[3] إرشاد الساري، (١/ ٧٠)، شەرحی حەدیسی پێشووی ئیبن عەباس تەنانەت (قسطلانی) ئەفەرموێ: زۆربەی ریوایەتەکان هەروا دەڵێن: واتە (صدر فاعله).

(**صلى الله عليه وآله وسلم**)، یان دڵی، یان عەقڵی و ئەو زانیارییەی بۆ بگوزایێتەوە لە شتی سادەتر ئەبێتو بڕوا کردن پێی گران نییە.

بۆیە مەبەستی زانایان بە کۆکردنەوە بریتییە لە (لەبەرکردن) لە زۆرێك لەو ریوایەتانەدا کە زانایان باسیان کردووە، وەك:

ـ عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ئەفەرموێ: (**جمعت القرآن، فقرآت به كل ليلة، فبلغ النبي ، فقال: اقرأه في الشهر**).[1] واتە: قورئانم لەبەرکردو هەمو شەوێك جارێك خەتم ئەکرد، کە ئەمە گەیشتە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) فەرمووی: مانگی جارێك خەتمی بکە.

ـ یان ئەفەرموێ: (**لم يجمع القرآن غير أربعة**).[2] واتە: تەنیا چوار کەس هەموو قورئانیان لەبەر بوو.

دووەمیان: کۆکردنەوە بە مانای (نووسینو تۆمارکردنی قورئان) دێت، کە زیاتر زەینی مرۆڤ بۆ ئەمەشیان ئەچێت لە کاتێکدا باس لە کۆکردنەوەی قورئان ئەکرێت، ئەم کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان بەم مانایە بە چوار قۆناغدا تێپەڕیووە:

١ـ قۆناغی سەردەمی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**).
٢ـ قۆناغی سەردەمی ئەبوبەکر (خوای لێ رازی بێت).
٣ـ قۆناغی سەرەدەمی عوسمان (خوای لێ رازی بێت).
٤ـ قۆناغی سەردەمەکانی دوای عوسمان (خوای لێ رازی بێت).

## ١. قۆناغی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم):

شتێکی بەڵگەنەویستو سەلماوە کە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) هەر لە ژیانی خۆیدا نزیکەی (٦٠) کەسی دانابوو بۆ نووسینەوەی قورئان، هەر جارێك (وحی) بهاتایە سەری، ئەینارد بەشوێن یەکێك یان زیاتر لەو شەست کەسەداو ئەو ئایەتانەی بۆ ئەخوێندەوە کە بۆی هاتبوو، پێشی ئەفەرموو، لە فلانە شوێنو لە لای فلانە ئایەتو سوورەتدا بینووسە. پاشان کە ئەینووسی پێی ئەخوێندەوەو ئەگەر هەڵەیەکی کردبایە بۆی

---

[1] مباحث في علوم القرآن، القطان، ص١١٦.
[2] مباحث في علوم القرآن، القطان، ص١١٦.

راسته ئەکردەوە.[1] ئیمامی بوخاری لە (صحیح)ەکەیدا ئەفەرموێ: بەڕائی کوڕی عازب ئەڵێت: کە ئەم ئایەتە دابەزی: (لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُـلاًّ وَعَدَ اللّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْراً عَظِيماً) (النساء : ٩٥ ). پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم) فەرمووی: **"ادع لي زيدا، وليجيء باللوح، والدواة، والكتف او الكتف والدواة"**. واتە: بڕۆ زەیدم بۆ بانگ بکەو پێشی بڵێ لەگەڵ خۆیدا لەوحو مەرەکەب و ئێسقانێکی دەفەی شان بهێنێ، یان دەفەیەکی شانو مەرەکەب بهێنێ".

"**ئیبن کثیر**" گەورە مێژوونووسی موسڵمان لە کتێبی "البدایە والنهایە"دا ناوی یەکە بە یەکەی نووسەرانی (وحی) کە لەبەردەستی پێغەمبەردا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) (وحی)یان نووسیوەتەوە ئەهێنێتو لە ژێر ناونیشانی (**فصل، أما كتاب الوحي وغيره بين يديه صلوات الله وسلامه عليه ورضي الله عنهم أجمعين**) یەك یەك ناوو ژیاننامەیان باس ئەکات و بۆ نموونە ئەفەرموێ:

**"فمنهم الخلفاء الأربعة: أبوبكر وعمر وعثمان وعلي، .. ومنهم أبان بن سعد بن العاص بن أمية.. منهم أبي بن كعب.. ومنهم أرقم بن أبي الأرقم .. ومنهم ثابت بن قيس بن شماس الأنصاري .. ومنهم، حنظلة بن ربيع .. ومنهم خالد بن سعد بن العاص .. ومنهم خالد بن الوليد .. ومنهم الزبير بن العوام .. ومنهم زيد بن ثابت بن الضحاك .. ومنهم عبدالله بن أبي سرح .. ومنهم عامر بن فهيرة .. ومنهم معاوية بن أبي سفيان .. ومنهم مغيرة بن شعبة الثقفي ..)**.[2]

(ئیبن کەثیر) نزیکەی (٣٠) کەس لەوێدا باس ئەکات کە لە خزمەتی پێغەمبەر دا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) کاری ئەوەبووە کە (وحی) بنووسنەوەو لەسەر ئەو پێستو

---

[1] زەیدی کوڕی ثابت لە ریوایەتێکدا ئەڵێ: (كنت اكتب الوحي عند رسول الله (صلى الله عليه وآله وسلم) وهـو يملـي علي، فاذا فرغت، قال: اقرأه، فاقرأه، فان كان فيه سقط أقامه). علوم القرآن، محسن عيبدالحميدو رشدي عليـان و غانم قدوري: ص٤٣.

[2] البداية والنهاية، إبن كثير، (٥/ ٣٦٤).

تەنکە بەردو پەلی خورمایانەی کە لە وسەردەمەدامانەدا هەبووە، هەندێ لە زانایان وەك تحقیقیان کردووە ژمارەی نووسەرانی وحی شەست کەس بوون).[1]

لە سەردەمی پێغەمبەردا (**صلی الله علیه وآله وسلم**) بەسێ شێوە قورئان ئەپارێزرا:

١ـ بە لەبەرکردن. ٢ـ بە نووسینەوەی لەلایەن نووسەرانی (وحی)یەوە. ٣ـ بە نووسینەوەی لەلایەن خەڵکی ترەوە، جگە لە نووسەرانی (وحی).

پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**) خۆی کە قورئانی بۆ ئەهات وەك نەخشی سەر بەرد لە سنگیدا نەخش ئەبوو، ئەیخوێندەوە بۆ ئەصحاب و ئەوانیش هەریەکەو بەپێی توانای خۆی لێی لەبەرئەکرد یان ئەینووسییەوە بۆ خۆی، (أبوعبیدە) کە زانایەکی ئیسلامییە[2] لە زانستی (**قراءات**)داو لە کتێبەکەیدا بە هەمان ناوەوە، هەندێ لەو صەحابانە ئەژمێرێ کە هەموو قورئانیان لەبەرکردوەو لەوانە: "چوار خەلیفەکانی راشدینو تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵاو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو حوزەیفەی کوڕی یەمانو سالمی کوڕی مەعقەلو ئەبوهورەیرەو عەبدوڵڵای کوڕی سائیبو هەر چوار عەبدوڵڵا ناوەکە (ئیبن عومەر، ئیبن عەباس، ئیبن عەمرو ئیبن زوبەیر) و عائیشەو حەفصەو ئوم سەلەمە (ئەمانە لە کۆچکەران).

لە پشتیوانانیش ئەمانە ئەژمێرێ: "عوبادەی کوڕی صامت، و موعاز و موجەممەعی کوڕی جاریەو فەضالەی کوڕی عوبەیدو مەسلەمەی کوڕی موخەللەد.

باسی گرنگترین حافزی قورئان ئەکات کە بریتین لە: عوسمانو عەلیو ئوبەی کوڕی کەعبو ئەبودەرداو موعازی کوڕی جەبەلو زەیدی کوڕی سابتو ئیبن مەسعودو ئەبوموسای ئەشعەری".[3]

پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**) هەموو ساڵێكو لە رەمەزاندا لەگەڵ جوبرەئیلی مامۆستایدا جارێك دەوری قورئانی ئەکردەوەو ئەم قورئانەکەی بۆ ئەخوێندو جوبرەئیلیش

---

[1] التفسير المنير، وهبة الزحيلي، (٢٢/١).

[2] ناوی قاسمی کوڕی سەلامی ئەزدی خوزاعییە، یەکێکە لە گەورە پیاوانی (حەدیس)و (زمانی عەرەبی) خاوەنی کتێبی بەناوبانگی (الأموال)ە ساڵی ٢٢٤ی کۆچی مردووە.

[3] التفسير المنير، وهبة الزحيلي ٢٣/١.

(**عليه السلام**) گوێی بۆ ئەگرت.[١] ئەو ساڵە کە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) وەفاتی کرد دوو جار لە رەمەزاندا دەوری قورئانی کردەوە لەگەڵێدا،[٢] بەو شێوەیە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) قورئانیشی بەسەر ئەصحابدا ئەخوێندەوەو ئەوانیش لەبەرئەوەی هەر بەوە بەناوبانگ بوون کە هێزی لەبەرکردنیان زۆر بووە[٣] و قورئانەکەیان لەبەرئەکردو بە خەڵك‌و ماڵ‌و منالێشیان لەبەرئەکرد، ئیبنولجەزەری خاوەنی کتێبی (**النشر فى القراءات العشر**) ئەفەرموێ: "**پشتبەستن بە لەبەرکردنی دڵ‌و سنگ (نەك بە نووسین‌و کتێب) لە گواستنەوەی قورئاندا نەوە بە نەوە یەکێکە لە گەورەترین رێزو پلەو پایەیەك کە خوا داویەتی بەم ئومەتی ئیسلامە**".[٤]

شێوەی دەوەمیش: ئەو ژمارەی زۆرەی نووسەرانی (وحی) کە هەریەکەیان لای خۆیەوە ئەوەی بۆی رێکەوتبێت لە قورئان لەسەر ئەو شتانە نووسیویەتییەوە کە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) بۆی خوێندووەتەوە، کە هەندێکیان توانییان هەموو قورئان بنووسنەوەو لە پارچە پارچەی شتدا لای خۆیان هەڵی بگرن‌و بوویانە ئەوەی لەبەری بووە بۆ پێغەمبەری (**صلى الله عليه وآله وسلم**) خوێندوەتەوەو زانایان ئەڵێن (**زەیدی کوڕی ثابت**) ئەوەی لەلای بووە لە قورئان بۆ کۆتا جار لەو ساڵەدا کە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) کۆچی دوایی کرد ـ صوحوفەکانی ـ خۆی نیشانی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) داوەو پێغەمبەریش نزای سەرکەوتنی بۆ کردووە.[٥] جگە لە زەید هەریەکە لە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب‌و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو ئوبەی کوڕی کەعب ـ صوحوفی[٦] ـ زۆریان لە قورئان هەبووە.

---

[1] لەفزی فەرمودەکە ئەفەرموێ: "يعارضني القرآن" کە ماناکەی ئەوەیە یەك بۆ یەکیان خوێندەوە، جارێ ئەم و جارێ ئەو.

[2] هەمان سەرچاوە، (٢٢/١)، هەروەها مختصر صحيح البخاري، ص١٠، رقم الحديث (٦).

[3] عەرەبی جاهیلی و سەردەمی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وآله وسلم) بەناوبانگ بوون بۆ لەبەرکردنی قەسیدەی دووردرێژو (معلقاتی سبع)و ... هتد. هەموو ئەو قەسیدەو شیعرانەیان دەم بە دەم گەیاندووەتە شوێنە دوورەکان.

[4] مباحث فى علوم القرآن: مناع القطان (ص١١٨).

[5] علوم القرآن: أحمد عادل كمال، ص٤٩.

[6] ـ صوحوف ـ کۆی ـ صحيفه ـ یەو بە مانای چەند لاپەڕەو پارچەیەك لە قورئان دێت، وشەی (مصحف) بە بوونی (بۆر) و (سەر)و (ژێر) بۆ میمەکە ئەخوێنرێتەوە، (مَصحف) یش بە شوێنی ئەو صوحوفانە ئەوترێ‌و پاشان بە

شێوەی سێیەمیش: خەڵكانێكی تری ناو صحابەش هەبوون كە بۆ خۆیان قورئانیان نووسیوەتەوەو ماڵو منداڵو خەڵكی تریان فێری قورئان كردووە، چ لە مەككەدا پێش كۆچكردن بۆ مەدینەو چ لە مەدینەدا، ئەوەتا لە چیرۆكی موسڵمانبوونی حەزرەتی عومەردا باسی ئەوە ئەكرێت كە عومەر پارچەیەك قورئانی بە دەستی خوشكەكەیەوە بینی كە سورەتی (**طه**)ی تێدا نووسرابوو، كە خوێندییەوە كاری تێكردو چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) بۆ ئەوەی موسڵمانێتی خۆی رابگەیەنێت.[١]

بەڵێ لە ژیانی پێغەمبەردا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) قورئان لە یەك (مصحف)دا بە كۆیی نەنووسرایەوە (هەرچەندە هەمووی بە نووسراوی و پەرشو بڵاوی هەبوو لای صحابە)[٢]، چونكە بەردەوام قورئان ئەهاتە خوارەوەو هەر جارەی لە شوێنێكەوەو بە جیا لەسەر تەختە بەردێك، یان پارچە پێستێك ئەنووسرایەوە، ئەگەر وانەبوایە ئەبوو بە بەردەوام خەریكی سڕینەوەو گۆڕینی لاپەڕەو ئایەتەكانی بوونایە، بەڵام ئەو كاتەش لەلایەك پشت بە بوونی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) خۆی ئەبەستراو لەلایەكیش پشت بە لەبەركردنی ئەو هەمووە صەحابەیە ئەبەستراو لەلایەكی تریشەوە پشت بە ئەو صوحوفانە ئەبەسترا كە بەردەوام ئەنووسرایەوە، بۆیە پێویستی بەبوونی یەك ـ مصحف ـ نەبوو.

## ٢. قۆناغی سەردەمی حەزرەتی ئەبوبەكر (خوای لێ رازی بێت)

پاش ئەوەی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) كۆچی دوایی كرد و زۆرێك لە "ئەعرابەكان" لە دین پاشگەزبوونەوەو حەزرەتی ئەبوبەكریش جیهادی راگەیاند دژی هەموو ئەوانەی كە:

١ـ وازیان لە ئیسلام بەتەواوەتی هێنابوو.

٢ـ ئەوانەش كە وازیان لە هەندێكی دین هێنابوو "وەك زەكاتدان بۆ نموونە".

---

قورئـان وتـرا (المصحف الـشريف)، ئـەڵێن ئەبوبـەكری صـدیق (رەزای خـوای لەسـەربێت) پـاش نووسـینەوەی قورئـان راوێژی بە صحابە كردووە ناوی بنێین چی؟ رایان وابووە ناو بنرێ (مـصحف)و ئـەویش ئـەو نـاوەی لـێ نـاوە. (التفـسير المنير: وهبة الزحيلي، ١٦/١).

[1] عثمان بن عفان شخصيته وعصره، الصلابي، ص٢٤٥.

[2] عثمان بن عفان شخصيته وعصره، الصلابي، ص٢٤٥.

**٣ـ** ئەوانەش دەستیان دایە راگەیاندنی دینی تازەو پێغەمبەرایەتی درۆییانە..

ئەوەبوو شەڕێکی گەورە لەگەڵ ئەهلی یەمامەدا (سوپای موسیلەمەی درۆزن) روویداو لەو شەڕانەدا، کە هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: "لەو شەڕانەدا نزیکەی هەزارو دوو سەد صەحابەی تێدا شەهید بوون،[١] کە (٣٩) کەسیان و لە ریوایەتێکی تردا ئەفەرموێ: (٧٠) کەسیان لەوانەبوون کە هەموو قورئانیان لەبەربوو. ئەمە وای کرد کە یەکێکی وەکو حەزرەتی عومەر دابچڵەکێو بچێتە خزمەت حەزرەتی ئەبوبەکرو پێشنیاری ئەوە بکات کە با قورئان لەیەك ـ مصحف ـ دا بنوسرێتەوەو لیژنەی شارەزای بۆ دابنرێت نەوەك ئەم جیهادە هەموو حافزەکانی قورئان لەناوبەرێتو بەشێك لەقورئان نەمێنێ.. ئیمامی بوخاری ئەفەرموێت: زەیدی کوڕی ثابت ئەفەرموێ: **"أرسل الي أبوبكر مقتل أهل اليمامة فاذا عمر ابن الخطاب عنده، قال أبوبكر (رضي الله عنه) ان عمرا أتاني فقال: ان القتل قد استحرّ يوم اليمامة بقراء القرآن وإني أخشى أن يستحرّ القتل بالقراء بالمواطن فيذهب كثير من القرآن وإني أرى أن تأمر بجمع القرآن، قلت لعمر: كيف تفعل شيئاً لم يفعله رسول الله ، قال عمر: هذا والله خير، فلم يزل عمر يراجعني حتى شرح الله صدري لذلك، ورأيت في ذلك الذي رأى عمر، قال زيد: قال أبوبكر: إنك رجل شاب عاقل لانتهمك وقد كنت تكتب الوحي لرسول الله (صلى الله عليه وآله وسلم) فتتبع القرآن فأجمعه، فوالله لو كلّفوني نقل جبل من الجبال ماكان اثقل عليّ مما أمرني به من جمع القرآن، قلت: كيف تفعلون شيئاً لم يفعله رسول الله قال: هو والله خير. فلم يزل أبوبكر يراجعني حتى شرح الله صدري للذي شرح له صدر أبي بكر وعمر (رضي اله عنهما)، فتتبعت القرآن أجمعه من العسب واللحاف وصدور الرجال، حتى وجدت آخر سورة التوبة مع أبي خزيمة الأنصاري لم أجدها مع أحد غيره، لقد جاءكم رسول الله من أنفسكم عزيز عليه ماعنتم.. حتى خاتمة براءة، فكانت الصحف عند أبي بكر حتى توفاه الله ثم عند عمر حياته ثم عند حفصة بنت عمر (رضي الله عنها)".**[٢] واتە: ئەبوبەکر دوای کوشتارەکەی خەڵکی یەمامە ناردی بە شوێنمدا، کە رۆیشتم عومەری کوڕی خەتتابیش لای ئەو بوو، ئەبوبەکر (خوای لێ رازی بێت) فەرمووی: عومەر هاتە لامو پێی وتم: کوشتن لە

---

[1] ریوایەتێ ئەفەرموێ حەوتسەد کەس کوژراون (إشارد الساري ٤٤١/٧).

[2] إرشاد الساري: القسطلاني، (٤٤٧/٧و٤٤٨).

ڕۆژی یەمامەدا زۆرێك لە قورئان خوێنەکانی تیابردووەو منیش زۆر لەوە ئەترسم کوشتن لەمەودوا و لەشەڕەکانی تردا هەروا بکات لە قورئان خوێنەکانو زۆرێك لە قورئانمان لەدەست بچێت، بۆیە رام وایە کە فەرمان بدەی قورئان کۆبکرێتەوە (لەیەك "مصحف"دا) منیش بە عومەرم وت: چۆن شتێك ئەکەی کە پێغەمبەری خوا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) نەیکردووە، عومەر ئەیوت: ئەو کارە سوێند بە خوا خێرێکی گەورەیە و عومەر بەردەوام هاتوچۆی ئەکردم (بۆ ئەو کارە)، تا خوای گەورەش سنگی منیشی گوشاد کرد بۆ کارەکەو هەمان ئەو رایەم بۆ دروست بوو کە بۆ عومەر دروست بوو بوو، "زەید" ئەفەرموێ: ئەبوبەکر فەرموی: تۆ پیاوێکی گەنجو ژیری، ئێمەش هیچ تۆمەتێکمان لەسەرت نییە،[1] لە خزمەت پێغەمبەریشدا تۆ هەر (وحی)ت بۆ پێغەمبەری خوا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەنووسییەوە، کەواتە دەست بکە بە گەران بە شوێن هەموو قورئانداو کۆی بکەرەوە، سوێند بە خوا ئەگەر ئەرکی گواستنەوەی شاخێك لە شاخەکانیان بسپاردایە پێم لەوە گرانتر نەئەبوو کە ئەرکی کۆرکردنەوەی قورئانیان پێ سپاردم، وتم: (باشە) چۆن شتێك ئەکەن کە پێغەمبەری خوا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) نەیکردووە، ئەبوبەکر فەرمووی: وەڵڵاهی ئەمە خێرێکی گەورەیە، ئەبوبەکر بەردەوام باسەکەی لەگەڵمدا ئەکردەوە، تا خوای گەورە سنگی منیشی گوشاد کرد بۆ ئەو کارە وەك چۆن سنگی ئەبوبەکرو عومەری بۆ گوشاد کرد (رەزای خوایان لێ بێت) دوای ئەوە ئیتر دەستم دایە قورئان کۆکردنەوە لە هەموو ئەو شتانەدا کە تێیدا نووسرابوویەوە وەك (پەلی پانی دارخورما) و (تەنکە بەرد)و (سنگو دڵی پیاوان).. تا ئەوەی کۆتایی سورەتی (تەوبە)م لای (ئەبی خوزەیمە)ی ئەنصاری دەست کەوت کە لای کەسی تر دەستم نەکەوت کە ئەفەرموێ: (**لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ * فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ اللّهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ**) (التوبة: ١٢٨ـ ١٢٩). ئیتر دوای ئەوە هەموو ئەو صوحوفانە (پارچە قورئانانە) لای ئەبوبەکر هەڵگیران تا کۆچی دوایی کردو پاشان لای عومەرو تا لە ژیاندا بوو، پاش ئەویش خرایە لای ـ حفصەی کچی عومەر ـ رەزای خوای لێ بێ ـ )..

[1] قسطلاني ئەڵێ: "لانتهمك: أشار الى عدم كذبه به وأنه صدوق". واتە: ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە درۆی لێ نەبیستراوەو پیاوێکی زۆر راستگۆیە". هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

ـ ئێستاش موناقەشەیەكی بەردەوام لەناو زانایاندا هەیە لەسەر ئەوەی ئایا دروستە قورئان بە ڕێنووسی ئێستا بنووسرێتەوە یان نا؟ واتە: بەهەمان شێوازو خاڵبەندیو فاریزەوە.. زانایانی ئیسلامیی سێ رایان هەیە لەسەر ئەم پرسەو هۆكەشی ئەوەیە كە هەر لە دێرزەمانەوە ئەو سێ رایە هەیەو لە هەموو سەردەمێكدا هەندێ (یار)و هەندێ (نەیار) بۆ یەكێك لەو رایانە دروست ئەبێت، بناغەی پرسەكەش ئەوەیە (ئایا ئەو ڕێوڕەسمەی مەصحەفی عوسمانی پێ نووسراوەتەوە شتێكی تەوقیفیو خواییە و دروست نییەو لێی لابدرێت، یان شتێكی عورفیو ئیعتبارییە[1]و بۆ خەڵك دروستە لەهەر سەردەمێكدا بەپێی ڕێنووسی ئەوكاتەی خۆیان قورئان بنووسنەوە.

رای یەكەم: ئەڵێت: ڕێنووسی قورئان تەوقیفییەو دروست نییە لێی لابدرێو بگۆڕدرێ ئەمەش رای زۆرینەی زانایانە، و بەڵگەكانیشیان ئەوەیە كە نووسەرانی (وحی) هەر بەم پیتو ڕێنووسانە لە خزمەت پێغەمبەردا قورئانیان نووسیوەتەوەو پێغەمبەریش (**صلى الله عليه وآله وسلم**) بۆی سەلماندوونو پێی رازیبووە، پاشان ئەبوبەكریش بەهەمان ڕێورەسم قورئانی نووسیوەتەوەو عوسمانیش هەر بە هەمان شێوە ئەو هەشت قورئانەی لەبەر قورئانەكەی ئەبوبەكر گرتەوەو هەموو صەحابەش پشتیوانیان لەو نووسەرانەو لە ئەبوبەكرو عوسمان كردووەو پاشان تابعینو شوێنەكەوتەی تابیعینیش هەر لەسەر ئەو ڕێورەسمە ڕۆیشتوونو تەنانەت لە چەرخی زێڕینی دانانو وەرگێڕانیشدا كە پرۆسەی نووسینەوە گەیشتە لوتكە، ڕێورەسمی عوسمانی لە نووسینەوەی قورئاندا هەر سامو ڕێزی خۆی هەبووەو كەس بیری لە گۆڕینی نەكردوەتەوە.

بەكورتی: ڕێوڕەسمی عوسمانی رای پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**)و رای هەموو صەحابەو رای هەموو ئوممەتو رای هەموو پێشەوایانی خاوەن ئیجتیهادو رای هەموو چوار

---

[1] (تەوقیفی) زاراوەیەكی شەرعییەو مەبەست پێی ئەوەیە شەرع ئەو شتەی داناوەو چەقی لەسەر گیراوەو دروست نییە كە بگۆڕدرێ، ئێستاكە ئەوترێ: تەرتیبی ئایەتەكان تەوقیفین، واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم) دایناون، یان بە هەمان شێوە ئەوترێت ریزبەندی سورەتەكان تەوقیفین، بەڵام ئەوترێ دانانی خاڵ لەسەر پیتەكان ئیعتیبارین، واتە: صەحابە دایان ناوە، هەروەها دانانی جوزئەكانو سەروبۆرو ناوی سورەتەكانو دیاریكردنی (مەككی)و (مەدەنی) .. و هەروەها.

مەزهەبە فیقهییەکەی لەسەرەو بەیهەقی و نەیسابوریش ئەمە دەڵێن‌و لەو سەردەمانەدا کەس پێچەوانەی ئەم رایە نەبووە.[1]

رای دووەم: زۆرێك لە زانایان رایان وایە کە رێورەسمی عوسمانی شتێکی تەوقیفی نییەو پێغەمبەر (صلی الله علیه وآله وسلم) داینابێت، بەڵکو شتێکی زاراوەییەو عوسمان پێی رازی بووەو ئوممەتیش لەویان وەرگرتووە بۆیە دروست نییە ئێمەش بیگۆڕین‌و پێچەوانەی ئەو قورئانە بنووسینەوە، (ئەشهەب) کە زانایەکی موسڵمانە ئەڵێ: پرسیاریان لە ئیمامی مالیك کرد ئایا دروستە بەپێی ئەم رێنووسی هیجائییەی ئێستا خەڵکی دایان هێناوەو لەسەری ئەڕۆن، قورئان بنووسرێتەوە؟ فەرمووی: "نەخێر، هەر ئەبێ بە شێوەی نووسینی یەکەمجاری قورئان بنووسرێتەوە". ... ئیمامی ئەحمەدیش ئەفەرموێ: "حەرامە بە پێچەوانەی نووسینی مەصحەفەکەی عوسمانەوە، (واو)، یان (یاء)، یان (ئەلیف)، هەر پیتێکی تر بنووسرێتەوە (لەکاتی نووسینەوەی قورئاندا)".[2]

رای سێیەم: هەندێ لە زانایان رایان وایە ئەم رێورەسمەی عوسمان شتێکی زاراوەیی‌و عورفییەو دروستە بەرێورەسمێکی جیاوازتر لەو رێورەسمە قورئان بنوسرێتەوەو هیچی تێدا نییە، (ئیبن خەلدون) و (عیزەددین کوڕی عەبدولسەلام) لەسەر ئەم رایەن، (ئەبوبەکری باقەلانی) ـ کە زانایەکی گەورەی ئیسلامییە ـ لە کتێبی: "الإنتصار"دا ئەفەرموێ: "سەبارەت بە نووسینەوەی قورئان خوای گەورە هیچ رێورەسمێکی تایبەتی فەرز نەکردووە و داینابێ هەر ئەبێ بەوشێوە خەتخۆش‌و نووسەرانی قورئان کتێبی خوا بنووسنەوەو خۆ بە دووربگرن لە رێنووسی تر، چونکە ئەمە بە رێگەی دەق دائەمەزرێ‌و هیچ دەقێکیش نەهاتووە ئەمەی کردبێتە کارێکی تەوقیفی (نە ئایەتێکی قورئانی‌و نە حەدیسێکی پێغەمبەرو نە ئیجماعێکی ئوممەتی ئیسلامیی‌و نە قیاسێکی شەرعیش).[3] بە کورتی ئەوەی لای ئەوە لێبدات کە واجبە خەڵکی هەر ئەبێت بەرێورەسمی تایبەت قورئان بنووسێتەوە، ئەوە ئەبێت بەڵگە بۆ ئەم لافلێدانەی بهێنێتەوەو لە کوێ ئەشتوانێ بەڵگە

---

[1] أحمد عادل کمال، علوم القرآن، ص٦٤.

[2] القطان، علوم القرآن، ص١٤٠.

[3] ئەو رایەی (باقەلانی)م کورتکردووەتەوە.

پەیدا بکات).[1] هەندێ لەوانەی کە لەم زانستی قورئانەدا کتێبیان نووسیوە رایەکی تر ئەهێنن، گوایە هەندێ لە زانایان رایان وایە کە نەك هەر "جائیز"و دوورستە بەرێورەسمێکی تر قورئان بنووسرێتەوە، بەڵکو "واجبیشە" بەپێی رێنووسی سەردەم قورئان بنووسرێتەوە، چونکە رێورەسمی عوسمانی هەندێ خەڵکی نەزان ئەخاتە هەڵەوە، لەگەڵ ئەوەدا پێویستە رێنووس‌و رێورەسمە عوسمانییەکەش وەك کەلەپورێکی بەنرخ پارێزگاری لێ بکرێت کە لە پێشینە صاڵحەکانمانەوە بۆمان جێماوەو ئەم رایەش ئەدەنە پاڵ یەکێکی وەك عیزەدین عەبدولسەلام.[2]

لە سۆنگەی ئەم رایەو رای پێشووەوە، هەندێك لەم رۆژانەدا داوا ئەکەن کە قورئان بەرێنووسی تازەو وەك هەموو کتێبێکی تر چاپ بکرێتەوە تا خەڵکی بە ئاسانی بیخوێنێتەوەو خوێندکاری هەموو قۆناغەکان لێی تێبگەن‌و هەست بە جیاوازی قورئان‌و کتێبی تر نەکەن‌و سوود لە خاڵبەندی نوێ بکەن‌و بزانن کوێ پرسیارەو کوێ هاوارەو کوێ سەرسوڕمانەو ... هتد.

بەڵام ئەوەی کە رای گشت موسڵمانانی ئەم سەردەمەی لەسەرەو فەتوای کۆڕە فیقهییەکان‌و سەنتەرەکانی زانستی لەسەرە ئەوەیە کە دەستگرتن بەرێورەسمی عوسمانییەوە لە کاتی چاپکردنی قورئاندا کارێکی داواکراوەو نابێ لێی لابدرێت لەبەر چەند هۆیەك:

١ـ هێشتنەوەی ئەو رێورەسمە کە لەو چەرخە ئیسلامییە کۆنانەوە بۆمان ماوەتەوە.

٢ـ رێگەگرتن لە گۆڕین‌و یاری کردن بە وشەکان‌و گاڵتەکردن بە پیتەکان، چونکە ئەم رێنووسە تازانە ئەکەونە بەر گریمانی گۆڕین‌و لەبری دانان‌و رێگەگرتنیش لەوانە سەبارەت بە قورئان کارێکی پێویستە.

٣ـ زیادە ئیحتاتێکە بۆ ئەوەی قورئان هەر لە سەر بناغە بنەڕەتییەکەی خۆی وەك وێنەو وەك نووسینیش بمێنێتەوە.

٤ـ کارێکە تا ئەمڕۆ هەموو ئوممەتی ئیسلامیی لەسەری رۆیشتوون‌و بووەتە رێگەو رێبازی ئیمانداران‌و خوای گەورەش ئەفەرموێ: (**وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ**

---

1 القطان، علوم القرآن، ص١٤١.

2 أحمد عادل كمال، علوم القرآن، ص٦٥.

**الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيراً) (النساء: ١١٥) .**

**٥ـ** ملكەچیکردنی قورئان بۆ ڕێنووسی تازە سەرئەکێشێ بۆ ئەوەی فیتنەیەکی نوێ وەك فیتنەی سەردەمی حەزرەتی عوسمان دروست ببێتو یەکێك بلێ "ڕێنووسەکەی من لەوەی تۆ چاکترە"و یەکێکی تر بلێ: "قورئانەکەی من لەوەی تۆ چاکترەو سەر بۆ بێنەزمیو جۆرێك بێدینی بکێشێ.. حەزرەتی عوسمان ئەوکاتە فەرمووی: ".. **ما تقولون في المصاحف؟ فان الناس قد اختلفوا في القراءة حتى ان الرجل ليقول: قراءتي خير من قراءتك وقراءتي افضل من قراءتك، هذا شبيه بالكفر، قالوا: ما الراي عندك ياأمير المؤمنين؟ قال: الرأي عندي أن يجتمع الناس على قراءة.."**.[1] واتە: خەڵکینە چی ئەڵێن دەربارەی ئەم قورئانەی لای خەڵکی هەیە؟ خەڵکی جیاوازییەکی زۆریان کەوتۆتە ناو لە کاتی قورئان خوێندنەوەدا، وای لێهاتووە ئەم پیاوە ئەڵێ: خوێندنەوەکەی من خێری لە خوێندنەوەکەی تۆ زیاترەو خوێندنەوەکەی من لە خوێندنەوەکەی تۆ باشترەو ئەمەش لە کوفرو بێدینی ئەچێ، وتیان: جا رای جەنابت ئەی گەورەی ئیمانداران چییە؟ فەرمووی: رای من ئەوەیە هەموو خەڵکی لە دەوری یەك خوێندنەوە کۆببنەوە، ئەوەتا حەزرەتی عوسمان ئەو جۆرە قسانە بە جۆرێك لە بێدینی ئەزانێ، چونکە گاڵتەکردن بە ـ مصحف ـ و خوێندنەوەی یەکێکی تر ـ پەنا بە خوا ـ سەر لەو شتانەوە دەرئەهێنێت.

**٦ـ** بە ڕێوڕەسمی عوسمانی سام و تایبەتمەندی قورئان وەك خۆی ئەمێنێتەوەو کەس زات ناکات وەك کتێبێکی تر هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات، بەڵکو وەك کتێبێکی پیرۆز و موعجیزەئامێز سەیر دەکرێ.

**٧ـ** لە ڕێگەی ئەو ڕێورەسمەوە ئەزانرێت ئەو وشەیە چەند جۆر خوێندنەوەی هەیەو کامیان دروستەو کامیان نادروستە".[2]

**٨ـ** بوونی ئەم ڕێورەسمەی قورئان بەو شێوەیەی کە هەیە، هەمیشە ئاماژە بۆ ئەو بەرە نەجیبزادانە ئەکات کە تەمەنیان بۆ خزمەتکردنی ئەم قورئانە دانا، بەردەوام بە کردنەوەی

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٥١ـ ٥٢.

[2] بۆ وەرگرتنی ئەو خاڵانە سوودم لەم کتێبانە وەرگرتوە: (التفسير المنير، جەڵدی یەکەم، مباحث في علوم القرآن، مناع القطان، أحمد عادل كمال، علوم القرآن).

دەمی ئەم قورئانە ئەو سەردەمانە حزور پەیدا ئەکەنەوە و بەرجەستە ئەبنو ئامۆژگاری بەرەی نویٰ ئەکەنو داوایان لیٰ ئەکەن: مەرد بن دەست بەم قورئانەوە بگرن، بیخوێننەوەو کاری پیٰ بکەنو بە دنیادا بڵاوی بکەنەوە، رایبگەیەنن کە ئەم قورئانە پەیامی خوایەو لە ئاسمانەوە هاتووە بۆ سەر دڵی بەرێزترین خولقاوی خوا کە حەزرەتی موحەممەدە (**صلى الله عليه وآله وسلم**)و ئەویش بەبیٰ ئەوەی یەك ئایەت یان یەك وشە چییە لێی بشارێتەوە، گەیاندی بە ئەصحابو ئەوانیش بە تابعینو ئەوانیش بە نەوەکانی دوای خۆیانو تاگەیشتە دەستی ئێوە. ئەم حزورەی ئەو هەمووە سەردەمە ئیسلامییە لە شێوازو رێورەسمی مەصحەفی عوسمانیدا کارێکە زۆر بە نرخو شایەنی ئەوەیە لەسەری بوەستین، بەڵام ئەگەر قورئان بەرێنووسی تازە نووسرایەوەو چووە ریزی کتێبەکانی ترەوە ئەم هەمووە مەشهەدە ون ئەبیٰو وەك ئەوەسە کە تازە هاتبێتە بوون.

زانایانو بە تایبەتی (لیژنەی فەتاوی ئەزهەر) لەگەڵ ئەوەدا کە چاپکردنەوەی قورئان بە دروست نازانن بەپێی رێنووسی تازە، بەڵام نووسینی هەندیٰ ئایات لە کاتی دەرس وتنەوەدا یان لە کاتی بەڵگە هێنانەوەدا لە کتێبێکدا کە ئەنووسریٰ یان لە ناو کتێبەکانی وەزارەتی پەروەردەو فێرکردندا یان پیشاندانی لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنو ئەو شتانەدا، هیچ رێگرییەك نییەو دروستە بکرێت[1]و ئەوەی دروست نییە بکرێت چاپکردنەوەی قورئانە بە رێنووسی تازە.

"**محمد الغزالی**"یش زاناو گەورە نووسەری ئیسلامیی میسریش بەرەحمەت بێت، لە کتێبی (**السنة النبوية بين أهل الحديث وأهل الفقه**)دا ئەڵیٰ: لەبەرئەوە نەبوایە کە ئیجماعی ئوممەتی ئیسلامی لەسەر ئەوە هەیە پارێزگاری لە رێورەسمی عوسمانی بکرێت لە کاتی چاپکردنەوەی قورئاندا ئەموت چاپکردنەوەی قورئانیش بەرێنووسی تازە هیچی تێدانییە.[2]

مامۆستا مەلا کەریمی مودەڕیس ـ بەرحمەت بێت ـ دەربارەی ئەم رێوڕەسمەی قورئان ئەفەرموێت:

---

[1] التفسير المنير ، وهبة الزحيلي، ٢٧/١. لەوێدا ناوو ژمارەی ئەو گۆڤارەی هێناوە کە ئەو فەتوایەی تێدا بڵاوکراوەتەوە.

[2] السنة النبوية بين أهل الحديث وأهل الفقه، محمد الغزالي.

دەخیل سەد دەخیل نەکەونە خەیاڵ
بۆ گۆڕینی خەت بکەونە **ضەلال**
رەسمی **خەط** (سەددە) کاتێ کە شکا
لافاوی نەگبەت عالەمێ ئەبا
با هەر بەو لەهجە لەسەر هەتا خوار
بەوشێوەیە **خەططە** گرتی ئیستقرار
بمێنێتەوە هەتا هەتایە
مایەی مانەوەی دینی خودایە.[1]

[1] نوری قورئان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، ص١١٥.

# بەشی دووەم:
# بابەتەکانی قورئان

دەروازەیەك: خوای گەورە چەند ناوێکی ناوە لە قورئان "زەرکەشی" ئەڵێ: "خوای گەورە پەنجاو پێنج ناوی ناوە لە قورئان".[1] کە ئەو ناوانە وردەکاری زۆریان تێدایەو هەروا شتێکی سادەو بێ بەرنامە نییە، تەنیا هەندێ وەسفو ناساندنیش نییەو ئامانج لێی مەدحکردنی قورئان بێت‌و بەس، بەڵکو ئەو ناوانە لەو کلیلانەن کە دەرگای خەزێنە نهێنییەکانی ئەم قورئانە ئەکاتەوە لە خوێنەرەکەی‌و پێویستە لێکۆڵینەوەو رەنجی زۆر بدرێت بۆ ئەوەی چەمکی ئەو ناوانە بدۆزرێتەوەو بناسێنرێن بە خەڵکی.[2] بۆ نموونە خوای گەورە قورئان ناو ئەنێ: **"قرآن مجید"**، یان **"الذکر"**، یان "الفرقان"، یان "النور".. هتد، نابێ وابزانین ئەوە تەنیا ناولێنانێکەو هیچی تر، بەڵکو ئەوەی کە عەرەب دەڵێ: لە راستیدا (إسم علی مسمی)یە، یان وەك کورد دەڵێ: "ناوی خۆی بە خۆوەیە". یان "ناوی خۆی ون نەکردووە".

لە هەریەك لەو ناوانەوە ئەتوانین بچینە ناو بابەتێك لەو بابەتە زۆرانەی کە قورئان لە خۆی گرتووە و دەرگایەکە بۆ سەر دونیایەکی پڕ نهێنی با ئێمە تەنیا یەك نموونە بهێنینەوە:

ـ خوای گەورە ئەفەرموێ: **(يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَاء لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ) (يونس: ٥٧ ).**

بە کورتی ئایەتەکە یانی: ئەی خەڵکینە، بێگومان بن لەوەی کە لە لایەن خاوەن‌و پەروەردگاری خۆتانەوە (ئامۆژگارییەکتان) بۆ هاتووەو چارەسەرە بۆ ئەو شتانەش لە سنگەکاندا هەیەو هیدایەت و رەحمەتیشە بۆ ئیمانداران.

ئەمە یانی چی خوای گەورە بە ئایەتێك چوار ناو لە قورئان ئەنێ: **"موعظة"**، **"شفاء"**، **"هدی"**، **"رحمة"**.

---

[1] البرهان، الزرکشی: ٢٧٣/١.

[2] ئەم بیرۆکەیە لە بناغەدا هی (دکتۆر طە جابر العلوانی)یە لە کتێبی (أزمە الانسانیە ودور القرآن الکریم فی الخلاص منها: ص٥٤) کە بە راستی جێگەی خۆیەتی لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی وردی لەسەر بکرێت.

ده خۆدیاره به دڵنیاییه‌وه قورئان ناوی خۆی وت نه‌كردووه و (إسم علی مسمی)یه، با یه‌ك هه‌نگاوی ساده‌ی تر له لێكۆڵینه‌وه كه بچینه پێشه‌وه:

ـ "**موعظة**": واته دواندنی دڵ و هاندانی بۆ كردنی كاری خێرو چاكو دووركه‌وتنه‌وه له‌شه‌ڕو كاری خراپ، به هۆی "تەرغیب"و "تەرهیب"ه‌وه. یانی قورئان ئه‌وه‌نده‌ی باس تێدایه سه‌باره‌ت به "تەرغیب"و "تەرهیب" به ته‌واوه‌تی ئامۆژگاری دڵه‌كان ئه‌كات و زیندوویان ئه‌كاته‌وه‌و به‌خه‌به‌ریان ئه‌هێنێته‌وه و ئه‌چن به ده‌م كاری خێره‌وه و ده‌ست هه‌ڵئه‌گرن له كاری خراپ.

ـ "**شفاء**"یش واته چاره‌سه‌ركردنی نه‌خۆشییه‌كانی سنگ كه هه‌ر ئاماژه‌یه بۆ دڵ كه نه‌خۆشییه‌كانیش له چه‌مكی ئیسلامدا دوو جۆرن: نه‌خۆشی (شبهات)[1]و نه‌خۆشی (شهوات)، ده‌ی به پێی ئایه‌ته‌كه بێت قورئان پڕه له ئه‌و بابه‌تانه‌ی كه چاره‌سه‌ری هه‌ردوو جۆره نه‌خۆشییه‌كه بكات‌و مرۆڤ له دڵه‌ڕاوكێ‌و ئاره‌زوو په‌رستی رزگار بكات.

ـ "هدی": واته هیدایه‌ت‌و چاورۆشنی كه ئه‌وه‌ش به دوو جۆر ئه‌بێ:

١ـ هیدایه‌ت دان و به‌رچاوروونی بۆ پرسه زۆره‌كانی (عقائد) كه به ده‌رخستنی به‌ڵگه‌و "بورهانی عه‌قڵی" ئه‌بێت.

٢ـ هیدایه‌ت دان به به‌رچاوروونی بۆ پرسه زۆره‌كانی (ته‌شریع) كه به ده‌رخستنی به‌رژه‌وه‌ندییه باڵاكانی ئه‌م مرۆڤه ئه‌بێت له‌و یاسایانه‌دا.[2]

ـ "**رحمة**": واته سۆزو دڵنه‌رمی كه به‌رهه‌مه‌كه‌ی ئه‌وه‌یه مرۆڤ ئه‌كاته تۆخمێكی به‌سوود له‌ناو كۆمه‌ڵگه‌داو به پێی ئایه‌ته بێت قورئان‌و ده‌قه قورئانییه‌كان هۆیه‌كن بۆ دروستكردنی ئه‌و سۆزو میهره‌بانییه له خه‌ڵكدا.

با هه‌نگاوێكی تریش بچینه پێشه‌وه بۆ لێكۆڵینه‌وه‌ی زیاتر له‌م ناوانه‌ی كه خوای گه‌وره ناویه له قورئان.

ـ ئه‌م ئایه‌تی ژماره (٥٧)ی سوره‌تی (یونس)ه‌و پێش و پاشه‌كه‌ی باسێكی سه‌یری له خۆگرتووه، پێشه‌كه‌ی كۆمه‌ڵێك ئایه‌ته باسی ئه‌وه ئه‌كات پێش قورئان میلله‌تانێكی زۆر

---

[1] سه‌یر ئه‌وه‌یه كه ئه‌م سوره‌ته (پێنج شوبهه)ی كافران باس ئه‌كات‌و موناقه‌شه‌یان ئه‌كات. (التفسیر المنیر) ٦/٢٠٥.

[2] التفسیر المنیر / وهبة الزحیلي (٦/٢١٢).

هەبوون، پێغەمبەرانیان بۆ هاتووەو ئاینیان بۆ ڕۆشن کردوونەتەوەو زۆرێك لەو میللەتانە کەوتوونەتە دەمە دەمەککردن لەگەڵ پێغەمبەرەکانداو دڵڕەقییان دەست داوەتیٚو گومان و دوو دڵی وای لێکردوون بەرژەوەندی خۆیانیان لیٚ وون بووەو داوایانکردووە خوا سزاو عەزابیان بۆ بنێریٚو کافرانی سەردەمی پێغەمبیەریش (**صلى الله عليه وآله وسلم**) چاویان لە ئەوان کردووە و بە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەڵێن: خەبەری تەواومان پیٚ بڵیٚ، ئەریٚ ئەمەی تۆ ئەیڵێی دەربارەی خواو زیندوبوونەوە هەقو ڕاستە، پێغەمبەریش (**صلى الله عليه وآله وسلم**) سوێندیان بۆ ئەخواتو ئەفەرمویٚ: **"أي وربي أنه لحق وما انتم بمعجزين"**. بەڵی سوێن بەخوا ئەوە هەقو ڕاستییەو ئێوەش ناتوانن لە خوا یاخی بنو خۆتان بشارنەوە، جا ئەفەرمویٚ: (**أَلا إِنَّ لِلّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَلاَ إِنَّ وَعْدَ اللّهِ حَقٌّ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ * هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ**) (**يونس: ٥٥- ٥٦**). واتە: هۆشیارو ئاگاداربن![1] چی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە هەمووی موڵکی خوایەو تایبەتە بە خواوە،[2] هۆشیارو ئاگاداربن وادەو پەیمانی خوا ڕاستەو دێتە دی، بەڵام زۆر کەس ئەمە نازانن، ئەو خوایە کاری زیندووکردنەوەو مراندنی لە دەست دایەو تەنیا و بە تەنیا بۆ لای ئەویش ئەگەڕێنەوە.

جا دوای ئەمە ڕاستوخۆ ئەفەرمویٚ: ئەی خەڵکینە! بێگومان بن لەوەی کە لە لایەن پەروەردگارو خاوەنی خۆتانەوە (ئامۆژگارییەکان) بۆ هاتووەو چارەسەرە بۆ ئەو شتانەش لە سنگەکاندا هەیەو هیدایەت و ڕەحمەتیشە بۆ ئیماندارانو پاشان یەکسەر ئەفەرمویٚ: (**قُلْ بِفَضْلِ اللّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ**) (**يونس: ٥٨**) واتە: پێیان بڵیٚ با بە تەنیا بە (فەزڵ)و بە (ڕەحمەتی خوا) دڵخۆشکەن، ئەوەیان باشترە لەوەی هەر خەریکی کۆکردنەوەی (شتی تر) بن. (وشەی تەنیامان لە مانای (**فبذلك**) وەرگرتووە کە مانای (حصر) ئەگەیەنێت).

---

[1] وشەی (ألا) لە زمانی عەرەبیدا پێی ئەوترێت: (أداة التنبيه) واتە: دەستەواژەیە کە بۆ هۆشیار کردنەوەو بەئاگاهێنانەوە بەکاردەهێنریٚ تازەین بداتە ئەو شتە گرنگەی لێی بێئاگابووە، وەك ئەوەیە (جەرەسێك) لێبدەی بۆی تا دڵو زەینی بێنێتەوە لای تۆ..

[2] (لام) لە زمانی عەرەبیدا بۆ (تمليك)و (إختصاص) بەکاردیٚو بەو پێیە (لله)مان ماناکرد.

کەواتە ئایەتەکان (کە جێگەی باسەکەی ئێمەو ناوون بۆ قورئان) زۆر گونجاو هاتوون لە سورەتەکەداو جێگەی خۆیەتی خەڵکی لێ ئاگادار بکرێ و بوترێ خەڵکینە قورئان (ئامۆژگاری)یە، (قورئان چارەسەرە)، (قورئان هیدایەتە)، (قورئان رەحمەتە).

با هەنگاوێکی تریش بچینە پێشەوەو لێکۆڵینەوەیەکی وردتر لەو ناوانەی قورئان بکەین و چەند نهێنییەکی تریان لێدەربهێنین:

- (**وعظ**)و (**موعظة**) لە زمانی عەرەبیدا بە چەند مانا هاتووە، لەوانە:

**١- وعظ: نصح له** "دڵسۆزی بە خەرجدا بۆی".

**٢- وعظه: ذكره ما يحمله على التوبة الى الله واصلاح السيرة**، ئەو شتانەی وەبیرهێنایەوە کەبەرەو تەوبەکردنو لای خوای بەرێتو ژیانی خۆی پێ چاك بکات.

- (**شفا**)و (**شفاء**) لە زمانی عەرەبیدا بەچەند مانا دێن لەوانە:

**١- شفي - ه: برأه وأذهب مرضه**: چاکی کردەوەو پاکبوویەوەو نەخۆشییەکەی دەرکرد لێی.

**٢- تشفى: نكى فى عدوه نكاية تسره**: دەستێکی وای وەشاند لە دوژمنەکەی بویە مایەی دڵخۆشی بۆی.

**٣- الشفاء: الدواء (تسمية للسبب بإسم المسبب)**: **شيفا**: دەرمانە (ناوە بۆ هۆکارەکە لەبری ناوی ئەنجامەکەی).

**٤- الشافي: الناجح (فا) يقال: الجواب الشافي القاطع يكتفي به عن المراجعة**، وەك ناوی بکەر (ئیسمی فاعل) بەکاربێت واتە: کاریگەرو ئەوترێ وەڵامێکی شیفابەخش واتە: وەڵامێکی قسەبڕ دوای ئەوە پێویستی بەوە نییە هەڵبکاتەوە.

- (هدی)و (هیدایەت) لە زمانی عەرەبیدا بە زۆر مانا دێت، لەوانە:

**١- هدى - ه: أرشده الطريق: "بينه له وعرفه به"**: چاورۆشنی بۆ دروستکرد رێگەی پیشاندا، (واتە) بۆی رۆشنکردەوەو ناساندی پێی.

**٢- الهدى: الرشاد، البيان، الدلالة، النهار**، بەرچاورروونی، رۆشن، نیشانەو بەڵگە، رۆژ.

**٣- الهداية: الدلالة على ما يوصل الى المطلوب**: نیشانەیەك ئاماژە بدات بەو شتەی بتگەیەنێتە مەبەست.

**٤- الهدي: الحمام الهدي: الحمام البريدي، هدي العروس**، کۆتری نامەبەر، هدی العروس: بووکەکەیان برد بۆ لای شووەکەی.

**٥ـ الهدية: مايهدى ويتحف به إكراما وتوددا:** ئەوەی بە دیاری ئەبرێ بۆ رێزلێنانو چاندنی خۆشەویستی.

ـ (**رحم**)و (**رحمة**) لە زمانی عەرەبیدا بەچەند مانا دێت لەوانە:

**١ـ رحم: رق له وشفق عليه وغفر له:** دڵی نەرم بوو بۆی و بەزەیی پێیدا هاتەوەو لێی خۆشبوو.

**٢ـ رحمة: رقه وانعطاف تقتضي المغفرة والاحسان:** دڵ نەرمیو سۆزێکە ئەخوازێ کە لێبوردنو چاکە بە دوایدا بێت.

**٣ـ ذو رحم: ذو قرابة:** خزمایەتیو نزیکی.

**٤ـ الرَّحِمْ:** کە بە دوو شێوە ئەخوێنرێتەوە: (حاء)ە کە (زەنە)ی ببێ، یان (ژێر)ی ببێ بە مانای خزمایەتیو بە مانای منداڵدانی ئافرەت دێت.

لەو مانایانەوە ئەگەینە ئەوەی کە هۆی چییە قورئان ناونراوە (**موعظة**)و (**شفا**)و (**هدى**)و (**رحمة**) کە ئەگەر وردببینەوە، ئەو چوار سیفەتە پرۆسەیەکە وەك گەمەیەکی پۆستە (**لعبة البريد**) کە هەریەکەیان قۆناغێك پەیامی قورئان ئەنجام ئەدات و پاشان ئەیداتە دەست ئەویتریانو ئەویش کاری خۆی تەواو ئەکاتو ئەیداتە دەست ئەویترو ئەویش کاری خۆی ئەکاتو لە ئەنجامدا ئەرکە سەرەکییەکە جێبەجێ دەبێت، ئەمە چۆن وایە ؟!

لەکاتی نووسینی ئەم پەرەگرافەدا خوا ئەزانێ بێویستنی خۆم دڵو زمانم دەستیان بە (**سبحان الله**) کردن کرد لەو نهێنییە گەورەیەی کە ئەم ناوانەی قورئانو بەو ریزبەندییە وردە لە خۆیانیان گرتووە.

ـ قورئان دڵسۆزانە ئامۆژگاری خۆی ئەکاتو دڵەکان ئەدوێنێو هانیان ئەدات بۆ کاری خێرو حەزو رەغبەتیان بۆ ئەو کارە خێرو چاکانە تێدا دروست ئەکاتو لەسەرنجامی کاری خراپ ئەیانترسێنێ و سامیان بۆ دروست ئەکات لە داهاتووەکانی و بەمەش رۆحییەتەکان (یان دڵەکان) سازو ئامادە ئەبنو ئەوانەیان دێتە یاد کە بەرەو خوا بیان باتو ژیانیان چاك بکاتو کاری (**موعظة**) لێرەدا تەواو ئەبێو ئەدرێتەوە دەست (**شیفا**).

ـ (شیفا)یش کاری ئەوەیە (دەرمانی دەردەکان) دیاری بکات چ ئەو دەردانەی (گومان و دوودڵی) دروستی ئەکاتو چ ئەو دەردانەی (دڵپیسی و ئارەزووپەرستی) درووستیان ئەکاتو ئەرکەکەش ئەوەیە قسەی کاربڕ بکاتو کۆتایی بە پرسیارەکان بهێنێو لێرەدا کاری ئەویش تەواو ئەبێتو پەیامەکە ئەدرێتە دەست (هیدایەت)یان (هدى).

ـ (هدى) یان (هیدایەت)یش کاری ئەوەیە لە لایەك بە بورهانی عەقڵی (بیروباوەڕەکان ـ عقائد)ەکان رۆشن بکاتەوەو تیشکیان بخاتە سەرو بیانناسێنێ وەك رۆژی رووناك و لە لایەکیش رووی بەرژەوەندی دەربخات لە هەموو ئەو یاساو تەشریعانەدا کە خوا دایناوە بۆ ئەم مرۆڤە، وەك بووك بینارازێنێتەوەو بیخاتە سەر رێگەکەو دەستی بگرێت بەرەو جێبەجێ کردن، کاری (هیدایەت)یش لێرەدا کۆتایی پێ دێتو پەیامەکە ئەداتە دەست ناوی (**رحمة**).

ـ ئەم سێ ناوە کاری خۆیان ئەنجام ئەدەنو سەرەی (رەحمەتی قورئان) دێت ئەویش پەیامی خۆی ئەگرێتەوە دەستو سۆزو میهرەبانی لە خوێنەرەکەیدا دروست ئەکات (دیارە بەو مەرجەی ئیمانی بەو (ئامۆژگاری)و (دەرمان)و (بیروباوەڕو یاسایانە) هێنابێ وەك ئایەتەکە بە مەرجی گرتووە)و ئەیکاتە کەسێکی وا کە نزیکی بۆ دروست ببێت لە خواوەو بەکاری چاکەو لێبوردنەوە ناوبانگ دەربکاتو ببێتە سەرچاوەش بۆ میهرو خۆشەویستیو خزمایەتی.

ئەمە چ دارشتنێکە کە خوای گەورە ئەم قورئانەی پێ هۆنیوتەوە:

**(یَا أَیُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءتْکُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّکُمْ وَشِفَاء لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِینَ). (قُلْ بِفَضْلِ اللّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْیَفْرَحُواْ هُوَ خَیْرٌ مِّمَّا یَجْمَعُونَ).**

ئەمەیە ئەو نهێنییەی یەکێکی وەکو ئیمامی رازی ئەفەرموێ: "هەرکەس لە نهێنییەکانی هۆنینەوەی سورەتەکان و جوانکاری ریزکردنیان لە قورئاندا وردبێتەوە، ئەوەی بۆ دەرئەکەوێ کە ئەم قورئانە هەروەك موعجیزەیە لە رووی رەوانبێژیو وشەکانو بەرزی ماناکانیەوە، هەرواش ـ دیسان ـ موعجیزەیە لە رووی ریزبەندیو رێکخستنی ئایەتەکانیشەوە". لەمە رۆشنتر "رازی" ئەفەرموێ: **(أكثر لطائف القرآن مودعة في الترتيبات والروابط..)**.[1] واتە: زۆرترین مانای جوانو وردی قورئان لە ناو ئەو رێکخستنو گرێدانەدایە کە خوای گەورە لەم قورئانەدا کردویەتی.

بایەك هەنگاوی تر بچینە پێشەوە لە لێکۆڵینەوەکە بزانین، یانی چی (**موعظة**) پێش (**شفا**)و (**شفا**) پێش (هدى)و (**رحمة**)ت وتراوە؟ ئەوە بنەمایەکی گەورەی بەرنامەی پەروەردەیی تێدایە کە تائێستاش جێگەی مشتومڕی زانایانی (دەروونی)و زانایانی زانستە ئەزمونییەکانن کورتەی بیروڕاکە ئەوەیە ئایا خاڵی کردنەوەی مرۆڤ لە بیرو عەشقو خوی

---

[1] الوحدة البنائية للقرآن المجيد: د. طه جابر العلواني، ص٤٥.

خراپ له پێشدا ئەکرێت یان له پێشدا بیرو عەشو خوی چاکی تێدا ئەچێنرێت؟! که دیاره هەندێ رایان لەگەڵ ئەمیاندایەو هەندێك رایان لەگەڵ ئەویاندایە، بەڵام ریزبەندییه قورئانییەکه پشتیوانی لەو رایه ئەکات که بیرو عەشقو خوی چاك له پیشدا له مرۆڤدا ئەچێنێتو پاشان دەست به خاڵی کردنەوەی ئەکرێت له بیرو عەشقو خووی خراپ. (ئامۆژگاری) دواندنی دڵه (چارەسەر) بەرهەمی (ئامۆژگاری)یه، (هیدایەت) دەرەنجامی هەردوو هێزی (ئامۆژگاری) (چارەسەره) و (سۆزو بەزەییش) لەسەر ئەو سێ کوچکەی (ئامۆژگاری)و (چارەسەر) و (هیدایەت)ه پێ ئەگاتو پرش ئەداتەوە.

ئیمامی (بەننا) له **"مذكرات الدعوة والداعية"**دا ئەڵێ: "لەم مانایەدا": "رای من وایه که ئامۆژگاری و چاندنی بیری چاك و عەشقی راستو خووی باش له پێشتره له هەڵکەندنو خاڵی کردنەوەی له بیری چەوتو عەشقی زیانبەخشو خووی دزێو، چونکه نوورو بەرەکەتی ئەو شته باشانه خۆی تاریکی هەموو شته خراپەکانی ناو دڵی لەناو ئەباتو نایهێڵێ". [1]

دەی خۆ سەیری مێژووی تەشریعی ئیسلامی بکەی هەروایه، ئیمامی بوخاری له دایکمان عائیشەوه ئەگێڕێتەوه که دەربارەی قورئان فەرمویەتی:

**(إنما نزل أول ما نزل منه سورة من المفصل، فيها ذكر الجنة والنار حتى إذا ثاب الناس الى الاسلام نزل الحلال والحرام، ولو نزل أول شيء لا تشربوا الخمر، لقالوا لا ندع الخمر أبدا، ولو نزل لا تزنوا لقالوا لا ندع الزنا أبدا..)**. [2] واته: یەکەمین جارێك که قورئان دابەزی چەند سورەتێکی (مفصل) [3] هاتەخوارەوه و باسی بەهەشتو ئاگریان تێدا ئەکرا تا ئەوه بوو که خەڵکی گەڕانەوه بۆ لای ئیسلام، حەڵاڵو حەرامیش دەستیان کرده دابەزین، جا ئەگەر یەکەم شت ئەو دابەزیبایه و بیوتایه (عارەق مەخۆنەوه) خەڵکی ئەیانوت هەرگیز دەست لەمەی خواردنەوه هەڵناگرین، یان ئەگەر ئەمه دابیەزیبایه و بیویتایه (زینا مەکەن) خەڵکی ئەیانوت هەرگیز دەست له زیناکردن هەڵناگرین.

---

[1] بیرۆکەکەی هی ئەوه، بەڵام داڕێژانەکەی هی ئەو نییەو به مانا وەرمان گرتووه.

[2] إرشاد الساري: القسطلاني، ٤٥٣/٧.

[3] سورەته (مفصل)ەکان ئەو سورەتانەن که له سوەرتی (ق) یان (الحجرات)ەوه دەست پێ ئەکات بۆ کۆتایی قورئانو ئەکرێن بەسێ بەشەوه (طوال المفصل)و (متوسط المفصل)و (قصار المفصل).

**"شێخ عەلی طنطاوی"** یش ئەڵێ: کاتی خۆی دەوڵەتی یابان ویستیان لە حەقیقەتی ئیسلام تێبگەن داوایان کرد لە دەوڵەتی عوسمانی ئەوکاتە چەند زاناو شارەزایەکیان بۆ بنێرن تا ئیسلامیان بۆ رۆشن بکاتەوەو وەڵامی پرسیارەکانیان بدەنەوە، دەوڵەتی عوسمانیش چەند زانایەکیان بۆ ناردن، ئەوانیش بۆ رێزی زیاتر لەو شاندە ئیسلامییە هاتن خوانێکی گەورەیان بۆ رازاندنەوەو جۆرەها خواردنو خواردنەوە لەوانە (چەندان جۆری عارەق) بۆ ئامادەکردن، کە زاناکان عارەقەکانیان بینی سڵەمینەوەو عادزبوونو دەستیان دایە درێژەی باسکردنی حوکمی عارەقو عارقە خواردنەوەو دروستکردنی و فرۆشتنی، ئەوانیش حەپەسانو وتیان: جا ئەگەر ئەمدینە وابێ دیارە بە کەڵکی ئێمە نایەت، **"علی طنطاوی"** بەرەحمەت دەڵێ: خوای گەورە لەو زانایانە ببورێ ئەبوو سەرەتا باسی (توحید)و خواپەرستییان بکردایەو کە لەوە ئەبوونەوە، پاشان باسی لقو پۆپەکانی شەریعەتیان بکردایە هەروەك چۆن پێغەمبەر **(صلی الله علیه وآله وسلم)** بە موعازی فەرموو کاتێك بۆ لای یەمەنی نارد، موعاز سەرەتا بانگیان بکە بۆ لای **(لا اله الا الله)** ئەگەر ئەوەیان لێوەرگرتی ئەوجا بانگیان بکە بۆ نوێژو.. بەو شێوەیە.[1]

کەواتە ئەو ریزبەندییەی ئایەتەکە بۆ ناوەکانی قورئان ئەو بنەما پەورەردەییە رۆشن ئەکاتەوە کە ئامۆژگاریو کەمەندکێش کرنی دڵانو چاندنی بیری راستو عەشقی خوا و پێغەمبەر **(صلی الله علیه وآله وسلم)** و خووخدەی جوان پێش دەرمان نووسینو هەڵکەندنی بیرە چەوتو عەشقە گەندەڵو خووە لارەکان دێت، کێش ڕا و بڕوای وانییە با بروات لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی بکات لەسەر ئەو دوو جۆرە شێوازە لە پەروەردەداو لێکۆلینەوەیەکیش بکات لە مێژووی تەشریعی ئیسلامییدا ئەوکاتە بێتەوە ، چونکە من دڵنیام بیروڕای ئەگۆڕێت.

خوێنەری بەرێزیش با خۆی لێکۆڵینەوە لەسەر ناوەکانی تری قورئان وەك (النور)، (المجید)، (المکنون)، (الکریم)، **(الذکر)**، (عزیز)، (مهیمنا **علیه**)، (مبارك)، (بشری)، (بشیر)، (نذیر)، (قرآن)، (حبل الله)، (مصحف).. .هتد. بکات تا بزانێ ئەو مانایانە چەند پشكو رەگو ریشەیان لە قورئاندا هەیەو چەندێك ئەتوانن ئەو مانایە بگوازنەوە بۆ خوێنەرەکەیو کاریگەری لە سەر دروست بکەن.

---

[1] ئەم رووداوە لە نامیلکەیەکی ئامۆژگاریدا هاتووە بە ناوی (رسالة الأنبیاء دعوة للتدرج) بە داخەوە بۆ کاتی ئەم نووسینە لە بندەستمدا نەبوو، بۆیە بە کورتی ماناکەیم نووسی.

## باسی یەکەم: یاساو ئەحکامەکان

زانایان، هەریەکەیان بە شێوازێك کورتەی ئەو بابەتە جۆربەجۆرانەی قورئانیان لە چەند خاڵدا کۆکردۆتەوە، زانای وا هەیە بابەتەکانی قورئانی دابەشکردووە بۆ (بابەتە ئاینییەکان)و (بابەتە دنیاییەکان)و دوای ئەوە لقو پۆپی هەریەکەیانی باس کردووە، زانای تری واش هەیە بابەتەکان ئەکاتە سێ بەش (باسە عەقیدەییەکان)و (باسە تەشریعییەکان)و (باسەکانی سیاسەتو حوکمو ..).

بەڵام ئێمە لەو هەمووە تەقسیمبەندییە، ئەم پۆلێنکردەی خوارەوە وەردەگرین کە کورتەی هەموو ئەو باسو خواستانەی تێدایە کە قورئان لە خۆی گرتووە.

قورئان بە شێوەیەکی گشتی دوو جۆر باسی گرتۆتە خۆی:

١ـ چەند باسێك کە وەك یاساو ئەحکام داڕێژراونو سیفەتی یاساییان پێدراوەو کراونەتە ئەرك بەسەر تاكو کۆمەڵەوەو ئەبێ جێبەجێ بکرێن.

٢ـ چەند بابەتو باسێك کە ئە وسیفەتو یاساییەیان وەرنەگرتووە.

بەشی یەکەم (واتە یاساو ئەحکامەکان) ئەکرێنە سێ بەشی تری گەورە:

أ ـ باسە عەقیدەییەکان، کە پەیوەندی بە (بیروهۆش)ەوە هەیە.

ب ـ باسە ئەخلاقییەکان کە پەیوەندن بە (هەستو نەستی دڵەوە).

ج ـ باسە کردارییەکان کە پەیوەندن بە (هەڵسوکەوتەوە).

جا باسە عەقیدییەکان لە قورئاندا وەك لە زانایان لقو پۆپی بۆ دروست دەکەن چوار بەشە:

١ـ باسەکانی "**ئیلاهیات**".

٢ـ باسەکانی "**نبوات**".

٣ـ باسەکانی "سەمعیات" "**میتافیزیك**".

٤ـ باسەکانی "رۆحانیات".

هەریەك لەم باسیانەش چەند لقو پۆپی زۆرتریان لێ ئەبێتەوە وەك:

ـ (١ـ٤):

ـ باسی بوونی خوا "**وجود الله**".

ـ باسی ناوەکانی خوا "**أسماء الله**".

ـ باسی سیفەتەکانی خوا "**صفات الله**".

ـ باسی تاكو تەنیایی خوا "**توحید** الله".

ـ باسی کارو کردەوەکانی خوا "**أفعال** الله".

کە ئەوانەش هەریەکەیان چەند لقو پۆپی تری لیّ ئەبیّتەوە بۆ نموونە، لە "**توحید الله**" دا پیّنج باسی گەورەی لیّدەبیّتەوە:

۱ـ توحید **الذات**: کە ئەمەش باسی پیّنج حالّەت ئەکریّت.

۲ـ توحید **الأسماء**: کە ئەویش باسی زیاد لە (۹۹) ناو ئەکریّت.

۳ـ توحید **الصفات**، کە ئەمەش باسی حەوت سیفەتی سەرەکی دەکریّت.

٤ـ توحید **الألوهية**، باس لە "حاکمیەتی خوا بەسەر مرۆڤو بوونەوەرو دونیاو ئاخیرەتەوە دەکریّت".

٥ـ توحید **الربوبية**، باس لە خولیقیّنەریی خوا ئەکریّت بۆ دونیای بینراوو نەبینراو، بۆ خولقاندنی "مولك"و "مەلەکوت" و برِگەکانی تریش بە هەمان شیّوە.

ـ (۲ـ٤):

ـ باسی بنەماکانی پیّغەمبەرایەتی ئەکریّت.

ـ باسی بەلّگەکانی بە پیّغەمبەربوون ئەکریّت.

ـ باسی گومانەکانی خەلّکی بیّباوەرِ و وەلاّمەکانیان ئەکریّت.

ـ باسی ئەو سیفەتانە ئەکریّت کە :

۱ـ پیّویستە لە پیّغەمبەراندا هەبن.

۲ـ محالە لە پیّغەمبەراندا هەبن.

۳ـ مومکینە لە پیّغەمبەراندا هەبن.

هەریەك لەمانەش چەند برِگەو بابەتی (گۆرِاو)و (نەگۆرِ)ی تیّدایەو قورئان دەستی بۆ بردوون.[1]

ـ (۳ـ ٤):

ـ باسی (وحی)و دیاردەکانی (وحی) و (پەیامەکانی خوا) دەکات.

[1] هەندیّك رایان وایە باسی کتیّبەکانی خوا و پیّغەمبەران لە باسی (نبوات)دایەو هەندیّ رایان وایە ئەو باسە باسی (وحی)یەو پیّویستە لە باسی (سمعیات)دا دابنریّ..

- باسی بڕیارو نەخشەکانی خوا (قەزاو قەدەر) ئەکات.
- باسی مردنو بەرزەخو دیاردەی (رۆح) دەکات.
- باسی قیامەتو هەنگاوەکانی هاتنەپێشەوەی ئەکات کە زیاد لە بیست بڕگەی پڕ وردەکاری تێدایە وەك:
- مردنی لەشو مردنی رۆح.
- "رۆح" کە لە لەش دەردەچێت ئەچێت بۆ کوێ؟ ئایا "رۆح" دەمرێت؟
- بەرزەخ چییە؟ پرسیارو وەڵامی ناو قەبر چۆنە؟
- ئازار یان چێژ لەناو قەبردا هەیە؟
- ناوەکانی رۆژی قیامەت و مەبەستەکانی ئەو ناوانە.
- نیشانەکانی هاتنی قیامەت بە گەورەو بە بچووکەکانییەوە.
- (صور) چییە؟ و چۆن فووی پێدا ئەکرێ؟
- زیندووبوونەوە (**البعث**).
- بڵاوبوونەوە (النشر).
- کۆبوونەوە (الحشر) (وەستان بۆ لێپرسینەوە).
- ترازووی کردەوەکان چییە؟
- پردی "**صراط**" چییە؟
- حەوزی "**کوثر**" چییە.
- بەهەشتو نازو نیعمەتەکانی.
- جەهەننەمو ئێشو ئازارەکانی.
- تەوبە چییەو مەرجی چییەو چۆن وەردەگیرێ.
- عاقیبەت خێری چۆن؟
- عاقیبەت شەڕی چۆنە؟.....هتد.
- (٤ـ٤):
- باس لە دونیای فریشتە (ملائکە) ئەکرێتو راستی بوونیان، بەڵگەی بوونیان، جۆرەکانیان، ئیشەکانیان، ژمارەیان.. بە هەموو باسە ئاڵۆزەکانیانەوە.
- باس لە دونیای پەری (جنۆکە) ئەکرێت بە هەموو باسەکانییەوە.
- باس لە دونیای "مەلەکوت" ئەکرێت کە جیهانێکە لە جیهانی بوون.

ئەمە باسە عەقیدییەکان، باسە ئەخلاقییەکانیش وەك زانایان باسی دەکەن زیاتر چوار بەشی گەورەیە.

- (١-٤): رەوشت پەیدا ئەکرێت (واتە شتێکی کەسبییە).
- (٢-٤): رەوشتەباشەکان کە پێویستە دروست بکرێن.
- (٣- ٤): رەوشتە خراپەکان کە پێویستە لەناو ببرێن.
- (٤-٤): رەوشت ئەبێت سیفەتی یاسایی وەربگرێت.

هەروەها باسە کردارییەکان، بەپێی پۆلێنکردنی زانایان ئەبنە دوو بەشی سەرەکی:

یەکەم: یاساو ئەحکامەکانی (عیبادەتکردن).

دووەم: یاساو ئەحکامە (مەدەنییەکان).

یەکەم: یاساو ئەحکامە عیبادەتییەکان:

ئەمیش ئەکرێتە سێ بەشی سەرەکی: (فەرزەکان، سوننەتەکان، شتە باشەکان - مستحبات).

لە فەرزەکاندا پێنج عیبادەت باس دەکرێت بە ناوی پایەکانی ئیسلام، یان لقەکانی ئایین - فروع الدین)، کە ئەمانەن:

١- شایەتومان.
٢- نوێژ کردن.
٣- رۆژوو گرتن.
٤- زەکات دان.
٥- حەج کردن.

دوای ئەوە ئیتر ئەم فەرزانە هەریەکەیان بەچەند پەرژینی قایم دەور ئەدرێن بە (سونەت)و شتی باش (مستحبات) بۆ ئەوەی لە لایەك لە کزبوونو فەوتان بەدووربنو لە لایەکیش بۆ ئەوەی کاریگەر بن لەسەر تاكو کۆمەڵی موسڵمان.

دووەم: یاساو ئەحکامە مەدەنییەکان:

زۆرترین لقو پۆپو بەشو برگە لەم خاڵەی دووەمەدایەو ئێمەش هەر بە کورتی سەرباسەکانیان ئەنووسین.

زانایان ئەڵێن: یاسا مەدەنییەکان لە قورئاندا هەشت یاسای بنەڕەتین:

(١ـ٨): یاسا کۆمەڵایەتییەکان، یان بە دەربڕینی سەردەم یاساکانی باری تاکە کەسی (**قانون الأحوال الشحصية**).

(٢ـ ٨): یاساکانی حوکمڕانی (**نظام الحكم**).

(٣ـ٨): یاساکانی ئابووری (**نظام الاقتصاد**).

(٤ـ٨): یاساکانی دادگوستەری (**نظام القضاء**).

(٥ـ٨): یاساکانی ڕاگەیاندن (**نظام الاعلام**).

(٦ـ٨): یاساکانی پەروەردەو فێرکردن (**نظام التربية والتعليم**).

(٧ـ٨): یاساکانی سەربازی یان جیهادی (**النظام العسكری أو الجهادي**).

(٨ـ ٨): یاساکانی سزا (**نظام العقوبات**).

هەندێ لە زانایان هەوڵیان داوە هەموو ئەو ئایەتانەی کە باس لە هەریەك لەو بابەتانە ئەکەن لە تەنیشت بڕگەکەی خۆیدا بنووسنو بڵێن فلانە بابەت لە قورئاندا ئەوەندە ئایەتی لەسەر هاتووە، یان لە ئەوەندە ئایەتدا باسی فلانە بابەت کراوە.[١]

زانایان لقو پۆپییان لە هەریەك لەو یاسایانەش کردۆتەوەو بە درێژی باسی پێناسەو پایەکانی ئەو سیستمەیان کردووەو باسیان لەوەش کردووە ئیسلام چۆن ڕێوشوێن بۆ جێبەجێ کردنیان دائەنێت. بۆ نموونە کە باسی سیستمی ئابوری ئیسلامی دەکەن کە ئێمە بڕگەی (**٣ـ٨**)مان بۆ دانا ئەیکەنە چوار بڕگە:

بڕگەی یەکەم: کۆڵەکەکانی یاسای ئابوری لە ئیسلامدا (کە شەش مادەی تێدا باس کراوە).

بڕگەی دووەم: چۆنێتی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان لە ڕێگەی ئابورییەوە.

بڕگەی سێیەم: سەرچاوەکانی دارایی لە ئابوری ئیسلامیدا، کە زیاتر لە (١٢) سەرچاوە باس ئەکرێ.

بڕگەی چوارەم: بنەماکانی نەخشەی ئابوری ئیسلامی.

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر سەیری کتێبی (أصول الدين الاسلامی، د. رشدی عليانو عبدالرحمن قطان بکە، لە "أصول الاحكام"دا ص٥٠، دکتۆر حمد الكبيسی باسی ئەوە ئەکات کە هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئایەتەکانی ـ ئەحکام ـ زیاتر لە پێنجسەد ئایەتن لە قورئاندا.

یان کەباسی سیستمی سیاسیو یاسای حوکمڕانی دەکەن کە ئێمە بڕگەی (٢ـ٨)مان پێدا چەند بەشی لێدەکەنەوە، لەوانە:

بەشی یەکەم: بنەماو ڕێساکانی حوکمڕانی (**أصول الحكم**).

بەشی دووەم: مەبەستەکانی حوکمڕانی (**مقاصد الحكم**).

کە لە ژێر هەر بەشەیاندا چەندان لقو پۆپو بڕگەو بەشی تر باس ئەکەن و ئێمە ئەوە بە کاری ئەم کتێبە نازانینو تەنیا ئامانجمان ئەوەیە کە بڵێین بابەتەکانی قورئان زۆر فراوانن.

ئەمە تەنیا ئەو لقەی بوو لە دوو لقی سەرەکی بابەتەکانی قورئان کە یەکەمیان ئەو بابەتانە بوون کە سیفەتی یاساییان پێدراوەو پێیان ئەووترێت (ئەحکام = یاساو سیستم).

بەشی دووەمی بابەتەکانی قورئان ئەو باسو خواستانەن کە زانایان ناوی ئەنێن "**جگە لە یاساکان = غير الأحكام**) کە حەوت بەشی سەرەکین.

بەشی یەکەم: چیرۆك (**القصص**).

بەشی دووەم: ئیعجاز (الاعجاز).

بەشی سێیەم: پەیمانو هەڕەشە (**الوعد والوعيد**).

بەشی چوارەم: بەڵگەکانی (دەروون)و بەڵگەکانی (گەردوون) "**آيات الآفاق والأنفس**".

چیرۆکیش ئەبێتە چەند بەشێك: چیرۆکی پێغەمبەران، چیرۆکی میللەتان، جگە لەو دوانەش ئیعجازیش ئەبێتە چەند بەش: "ئیعجازی زمانەوانی، ئیعجازی ژمارەیی، .. هتد". پەیمانو هەڕەشەش پەیمان بۆ بڕواداران‌و هەڕەشە لە کافران ئەبێتە دوو بەشی سەرەکی، سەبارەت بە دونیاو سەبارەت بە ئاخیرەتو هەریەك لەوانەش ئەبنە لقو بڕگەی تر.

بەڵگەکانی دەروونو گەردوونیش هەریەکەیان بەشو لەتی تریان لێ ئەبێتەوە...

ئەم باسو خواستانە ئەکرێ لە هێڵکارییەکی ئاوادا کۆبکرێنەوەو پاشان لە باسی دووەمدا هەندێ دەربارەی ئەم بەشی دووەمە (واتە: جگە لە یاساکان) ئەدوێین.




**تێبینی: بۆ ئەم هێڵکارییە سوود لەم کتێبانە وەرگیراوە:** ١ـ النظم الاسلامية: منير حميد و فاضل شاكر. ٢ـ أصول الأحكام: حميد عبيد و صبحي جميل. ٣ـ أصول الدين: رشدى عليان، عبدالرحمن القحطان. ٤ـ بنەماکانی فکرو سیاسەت: لیذنة. ٥ـ علوم القرآن: مناع القطان.

## باسی دووەم: جگە لە یاساکان

وتمان بابەتەکانی قورئان دوو بەشی سەرەکین، بەشێکیان یاساو ئەحکامەکانن‌و لق‌و پۆپەکانیمان بە کورتی لە باسی یەکەمی ئەم بەشی دووەمەدا باس کردو بەشی دووەمیشیان ئەو بابەتانەن کە سیفەتی یاسایی‌و ئیلزامیان تێدانییەو ئەمەش بەپیی دابەشکردنی و پۆلێنی زانایان ئەکرێ بیکەینە حەوت بەشی سەرەکییەوە:

١ـ چیرۆکە قورئانییەکان (**قصص القرآن**).

٢ـ پەندو نموونە هێنانەوەکانی قورئان (**أمثال القرآن**).

٣ـ بەڵگەکانی گەردوون‌و دەروون (**آيات الآفاق والأنفس**).

٤ـ سوێندەکانی قورئان (**أقسام القرآن**).

٥ـ پەیمان‌و هەڕەشە (**الوعد والوعيد**).

٦ـ موناقەشەو حیوار لە قورئاندا (**الجدل القرآن**).

٧ـ ئیعجازی قورئان (**إعجاز القرآن**).

جا ئێمە زۆر بە کورتی باسی ئەو شەش خاڵەی پێشەوە ئەکەین‌و باسی ئیعجازەکە هەڵدەگرین بۆ باسی سێیەم لەم بەشی دووەمەدا.

**١ـ چیرۆکە قورئانییەکان (قصص القرآن):**

**"قصة"** کە چیرۆکە لە قورئاندا بە مانی "شوێنکەوتن‌و بە دواداچوونی شتێك دێت کە مەبەستتە ئەنجامەکەی بزانی ئەوترێ: **قصصت أثره**، أی **تتبعته**، واتە: شوێن پێکانیم هەڵگرت‌و بە دوایدا چووم بۆ ئەوەی بکەمە ئەنجام، خوای گەورە لە قورئاندا لە دوو ئایەتدا (قصص)ی بەم مانایە بەکارهێناوە، لە سورەتی (**الکهف**: ٦٤)دا ئەفەرموێت: (**فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصاً**). واتە: موسا و غولامەکەی بە شوێن پێکانی خۆیاندا هاتنەوە تا بزانن دەنگ‌و باسی پیاوە زاناو چاکەکە چییە و چۆنە.

هەروەها ئەفەرموێ: (**قالت لأخته قصيه**) دایکی موسا وتی بە خوشکەکەی موسا (**عليه السلام**) شوێن سندوقەکە بکەوەو بزانە سەرەنجامی بە کوێ ئەگات.

کەواتە چیرۆك بریتییە لە رۆیشتن بە شوێن هەواڵ‌و بەسەرهاتی پێشووەکاندا تا بزانرێ سەرەنجامیان چۆن بووە، بۆ ئەوەی کە پەندو وانەیان لێوەربگیرێ.

ـ چیرۆك له‌ قورئاندا سێ به‌شه‌:

به‌شی یه‌كه‌م: چیرۆكو به‌سه‌رهاتی پێغه‌مبه‌ران، كه‌ باس له‌ نزیكه‌ی (٢٥) پێغه‌مبه‌ر ئه‌كات، باسی خۆیانو میلله‌ته‌كه‌یانو په‌یامو كارو خه‌باتیان له‌گه‌ڵ خه‌ڵكی سه‌رده‌می خۆیاندا كه‌ چۆن هه‌ڵوێستیان له‌ به‌رانبه‌ریاندا بووه‌ته‌ دوو ده‌سته‌: ده‌سته‌ی هه‌وادارو ده‌سته‌ی دوژمن، باس له‌ هه‌ڵوێستی ئه‌و پێغه‌مبه‌رانه‌ش ده‌كات له‌هه‌ریه‌ك له‌ و ده‌سته‌یه‌.

به‌شی دووه‌م: چیرۆكی ئه‌و خه‌ڵكو میلله‌تانه‌ی تر كه‌ له‌ مێژوودا كاری گه‌وره‌یان كردووه‌، به‌ڵام نه‌ پێغه‌مبه‌ر بوونو نه‌په‌یامی خودایشیان به‌ده‌سیته‌وه‌ بووه‌، وه‌ك: **"طالوتو جالوت"**، "هاوه‌ڵانی ئه‌شكه‌وت"، "كوڕه‌كانی ئاده‌م"، "زولقه‌رنه‌ین"، "قارون"، "هاوه‌ڵانی چاڵه‌ قوڵه‌ پڕئارگه‌كان"، "هاوه‌ڵانی فیل".. هتد.

به‌شی سێیه‌م: چیرۆكی ئه‌و رووداوگه‌له‌ی كه‌ له‌ ژیانو سه‌رده‌می حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌د روویان داوه‌ وه‌ك : غه‌زاكانی (بدر)و (ئوحود)و (ئه‌حزاب)و (حنین), یان رووداوی ئیسراو میعراجو له‌تبوونی مانگو كۆچی پێغه‌مبه‌ر بۆ مه‌دینه‌، .. هتد.

**ـ سودی ئه‌م چیرۆكه‌ قورئانیانه‌:**

١ـ دڵدانه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر به‌وه‌ی پێغه‌مبه‌رانی پێشووش هه‌روه‌ك ئه‌م بوونو میلله‌ته‌كانیان به‌ هه‌مان شێوه‌ لێیان بووه‌ته‌ هه‌وادارو دوژمن، و خوای گه‌وره‌ له‌ كۆتاییدا پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی و هه‌واداره‌كانی سه‌رخستووه‌و دوژمنه‌كانی ریسواو سه‌رشۆڕكردووه‌ **(وَكُـلاًّ نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاء الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءكَ فِي هَـذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ) (هود: ١٢٠ )**. واته‌: ئێمه‌ هه‌واڵو باسی به‌سه‌رهاتی هه‌موو ئه‌و پێغه‌مبه‌رانه‌مان بۆ گێراویته‌وه‌ بۆ ئه‌وه‌ی دڵت ئارامبگرێ، ئه‌وه‌ی هه‌قه‌ له‌و چیرۆكانه‌دا بۆمان باس كردووی، هه‌روه‌ها ئامۆژگاریو یاده‌وه‌ریشه‌ بۆ ئیمادنداران.

٢ـ رێساو بنه‌ماكانی بانگه‌وازی ئیسلامی تێدایه‌ كه‌ چۆن له‌گه‌ڵ میلله‌ته‌كانیاندا بجولێنه‌وه‌و له‌ كوێوه‌ ده‌ست پێبكه‌نو هه‌ڵوێستیان له‌ هه‌وادار چۆن بێت و له‌ دوژمن چۆن بێت و له‌ خه‌ڵكانی دوودڵ چۆن بێت، **(وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ) (الأنبياء: ٢٥)**.

٣ـ دان نان به‌ پێغه‌مبه‌رایه‌تی هه‌موو ئه‌و پێغه‌مبه‌رانه‌ی پیشوودا و زیندوو راگرتنی ناوو ناوداریيان.

٤ـ چیرۆكی قورئانی جۆرێك له موعجیزەی تێدایه بۆ سەلماندنی راستی پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**)، چونکه چیرۆك بەو درێژییه، تاکه رێگەی وەرگرتنی برتییه له (وەحی) خودایی بۆیه جولەکەکان جارێك پرسیاری مێژووی هاوەڵانی ئەشکەوتیان له پێغەمبەر کرد، ئەویش خوای گەوره درێژەیەکی له ژیانیان بۆ پێغەمبەر نارده خوارەوه.

٥ـ ئەو چیرۆکانه موناقەشەی وردی ئەهلی کیتابی تێدایه و بۆ دنیای رۆشن ئەکاتەوه که زۆر شت هەیه ئەوان شاردویانەتەوه، یان بوختانیان خستۆته سەری‌و گۆڕانکارییان تێدا کردووه، خوای گەوره ئەفەرموێ: (**كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِـلاًّ لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلاَّ مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ قُلْ فَأْتُواْ بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ**) (**آل عمران : ٩٣**).

٦ـ چیرۆك شێوزایێکی ئەدەبی جوان‌و سەرنج راکێشه، هەموو کەس له هەموو ئاستێکدا کەمەندکێشی ئەبێت‌و گوێی بۆ ئەگرێ‌و کاریگەری لەسەر دروست ئەکات، (**لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ..**). (**یوسف: ١١١**).

٧ـ چیرۆك شێوازێکه بۆ ئامۆژگاری کردنی بەرانبەرەکەت بەبێ ئەوەی ئەو هەست بکات تۆ ئامۆژگاری ئەکەی، بۆیه هەرچییەکت بوێ ئەتوانی له رێگەی چیرۆکێکەوه به بەرانبەرەکەتی بڵێی و تێر ئامۆژگاری بکەی بێ ئەوەی هەست بکات.

٨ـ چیرۆك نواندن‌و مەشهەدی زۆری تێدایه‌و وا له گوێگرەکەی ئەکات که گیانی (چاولێکەری) ی تێدا دروست ببێت بۆ پاڵەوانەکانی چیرۆکەکەو ئەمەش واقیعێکه هەموو کەس له ژیانی خۆی‌و چواردەورەکەیدا هەستی پێدەکات.

٩ـ چیرۆك لەبەرئەوەی به زیندوویی له زەیندا دەمێنێـەوه، ئەو بەهاو بیروڕایانەی ئەتەوێ لەناو چیرۆکدا لەسەر خۆدایئەنێت‌و خوێنەرو گوێگر به خۆی نازانی بوەته هەواداری ئەو بیروڕایانه.

١٠ـ چیرۆکه قورئانییەکان ماددەیەکی چەورو دەوڵەمەندن بۆ هەموو ئەو کەسانەی که ئەیانەوێت بەرنامەیەکی پەروەردەی بۆ منداڵان‌و گەنجان و نەوەی نوێ دابنێن وەك چۆن بەرێزان (شێخ حەسه نەدەوی)و (سید **قطب**)و (جودت السحار).. به کارێکی وەها هەستان و نووسینەکانیان دەنگ‌و زایەڵەیکی چاکی هەبوو لەناو بەرەی شەست‌و حەفتاکاندا، یان چۆن بەرێزان: (حبیب محمد سەعیدو موحەممەد **رأفت** پاشاو **ولید الأعظمی**) توانییان

لەرێگەی چیرۆکی هاولاٌنی پێغەمبەرەوە بەرهەمێکی زۆرو بە پێز بنووسن بۆ نەوەکانی سەردەمی خۆیانو کاریگەری زۆر چاك دابنێن لەسەریان لەو رێگەیەوە.

هیواداراین کە خامەبەدەستەکانی ئەم رۆژەش لایەك بەلای ئەم بابەتەدا بکەنەوەو بەشێوازێکی قوروانی سەرنجراکێش هامۆشۆیەکی ئەو رێگەیە بکەنەوەو نەیەلْن ئەو جۆرە نووسینانە کوێر ببنەوە، چونکە بەراستی نووسین بە شێوازی چیرۆك و رۆمانو کورتە چیرۆك لە هەموو سەردەمێکدا کاریگەری خۆی هەیەو یەکێکە لە چەکە ترسناکەکان بۆ بلاٌوبووکردنەوەی بیروباوەڕەکان. بەراست خواریەوە، بە هەقو ناهەقییەوە، مەگەر ئەمڕۆ لە رێگەی رۆمانو چیرۆکەوە چەندان نووسەری گۆماناوی مێشكو دلْی زۆرێك لە لاوانی ئەم میللەتەی خواروخێچ نەکردووە؟!

**٢ـ پەندو نموونە هێنانەوەکانی قورئان (أمثال القرآن):**

نموونە هێنانەوە شێوازێکە لە شێوازەکانی قورئان بۆ ناساندنو جوان نیشاندانی بیروراکانی ئیسلام، "لا مەعقول" کردن بە "مەعقول"و "نامەحسوس" کردن بە "مەحسوس"و "نادیار" کردن بە "دیار"و لێچواندنی ئەم بە ئەو یەکێکە لەو ستێلاٌنەی "ئوسولوبانەی" قورئان ئەیگرێتە بەر بۆ ئامادەکردنی زیهنی خوێنەرەکەی بۆ ئەوەی عەقلْی بجولێنێو ماناو ئەفکاری جوانی لێدەربهێنێ، بۆ نموونە: خوای گەورە نموونەی (هەق)و (ناهەق) **"الحق والباطل"** لە قورئاندا بە دوو نموونە باس ئەکات لەیەك کاتدا کە خوێنەر ئەتوانێ بیروراو جوانی زۆری لێدەربهێنێ... خوای گەورە ئەفەرموێ: **(أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَداً رَّابِياً وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاء حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ) (الرعد : ١٧)**. واتە: (خوا لە ئاسمانەوە ئاو ئەبارێنێو خێرا دۆلْەکان هەریەك بە پێی خۆیان ئاو ئەڕژێتە ناویانو لافاوەکەش چی خاشاكو زبلْ هەیە ئەیگرێت بە کۆلْەوە، هەروەها ئەو کاتەش کە ئاگر ئەکەنەوەو خشلْێك گرمە دەکەن بە هەمان شێوە خاشاكو شتی بێ کەلْکی تری وەك زبلْی ناو دۆلْەکە سەر ئاگرەکە ئەکەوێت، بەوشێوەیە خوا نموونە دەهێنێتەوە بۆ (هەق)و بۆ (ناهەق)، جا ئەوەی زبلْو بێ سوودە فڕێ ئەدرێت و ئەوەشی بە سوودە لە زەویدا جێگیر ئەبێتو ئەمێنێتەوە، ئا بەم شێوەیە خوا نموونە دەهێنێتەوە لە قورئاندا).

سەیری ئەم نموونە بکەی دوو پەندی تێدایە: یەکەم پەندێکی ئاوی، دووەم: پەندێکی ئاگری.

ـ پەندە ئاویەکە: (قورئانی شوبهاندووە بە ئاو) دۆڵەکانیش بە دڵەکان (شبهات وشهوات)ی ناودڵێش بە زبڵو خاشاك.

کە قورئان چوویە ناو دڵ پڕی ئەکات لە (هەقو نوور) و گومان و دوودڵیو ئارەزووبازیو نەفپەرستی سەرئاو ئەکەوێو دێتەدەرەوە.

ـ پەندە ئاگرییەکەش (قورئانی شوبهاندووە بە ئاگر)و مەنجەڵەکانیش بە دڵەکانو (شبهاتو شهوات)ی ناو دڵەکانیش بە چڵکوشتی بێ کەڵك کە قورئانەکە چوویە ناو دڵەکە پڕی ئەکات لە روناکی، و گەرموگوڕی ئەکاتەوە و گومانو ئارەزووپەرستی دەرئەکاتە دەرەوە.

لەم دوو نموونەیەوە ئەتوانین لە هەموو رووەکانی رەوانبێژیو دەروونیو پەروەردەییو زانستییەوە پەندوئامۆژگاری لێوەربگرین، با بۆ نموونە چەند پەندێك باس بکەین:

ـ قورئان وەك ئاو وایە، ژیانی پێوەیە، هەرکەس بەهرەمەندبێ لێی و دەم بخاتە کانیاوی قورئانەوە، زیندوو ئەبێتەوە، پاراو ئەبێو تینوێتی ئەشکێ، بە پێچەوانەشەوە هەرکەس لە قورئان دووربێ هەمیشە تینوە، بە هیچ شتێکی تر تینوێتی ناشکێو سوکنایەتی بۆ نایەتو بەردەوام دەمی وشکە.

ـ قورئان گرەنتی ئەو ئەدات بە مرۆڤ کە بچێتە هەر دڵێك زبڵو خاشاکی گومان و ئارەزووپەرستی ئەکاتە دەرەوە ئەگەر دەرگای دڵەکانی بۆ بکرێتەوەو وەك پێویست رێگەی بدرێ بۆ چوونە ژوورەوەی تا ئاوەکەی سەر ئەکاتو ئەو (شوبهە)و (شهوە)ە ئەگرێتە کۆڵو فڕێی ئەدات.

ـ دڵەکان وەك دۆڵەکان وان، چەندان لۆچو پێچیان تێدایە، هەر لۆچەی خۆشەویستییەکی ناشەرعی، رقێکی نادروست، حەزێکی خراپ، عەشقێکی بێکەڵك، خۆی تێدا حەشارداوە، هەروەك چۆن لەپێچو کەناری دۆڵەکاندا زبڵو خاشاك کۆبووەتەوە، لافاوی دۆڵەکان ئەو زبڵانە ئەگرێت بە کۆڵەوەو لەو سەری دۆڵەکەوە دەریان ئەکاتە دەرەوە قورئانو دڵێش هەر وایە!!

بۆ پەندە ئاگرییەکەش هەروایەو ئەتوانی چەندان پەندو وانەی بە کەڵکی لێوەربگرێ.

هەندێ لە زانایان لەوانە (ئیمامی شافیعی) ئەفەرمووێ: "نموونە هێنانەوەكانی قورئان پڕن لە ئەحكامو یاسا، هەروەك چۆن پڕن لە پەندو ئامۆژگاری، و بە بەشێك لە مەرجەكانی موجتەهیدی ئەزانی". [1] تەنانەت (ماوردی) ئەفەرموی: ".. **إن من أعظم علوم القرآن علم أمثاله والناس في غفلة عنه**..". [2] واتە: گەورەترین زانستی قورئان، زانستی نمونە هێنانەوەكانیەتی كە خەڵكی لێی بێ ئاگان.

ئیمامی **سیوطی** لە شێخ عیزەددینەوە ئەگێڕێتەوە كە فەرمویەتی: "خوای گەورە ئەو هەمووە نموونەی هێناوەتەوە لە قورئاندا بۆ ئەوەیە ئامۆژگاری خەڵكی بكات و شتیان بخاتە یادو جا چۆن باس لە ئەو هەموە پلە جیاوازە ئەكات لە ئەجرو پاداشتدا یان باس لە رەنجخەساری ئەكاتو مەدحی فلانە شت ئەكات و زەمی فلانە شت ئەكاتو بەوشێوەیە هەرواش ئەو نموونە هینانەوانە بەڵگەی هەندێ ئەحكامەو یاساشن..". [3]

پەند داهێنان لە قورئاندا وەك زانایان باسی ئەكەن سێ جۆرە:

جۆری یەكەم: پەندی ئاشكرا "**المصرحة**".

جۆری دووەم: پەندی پەنهانی "**الكامنة**".

جۆری سێیەم: پەندی بە مانا پەند "**المرسلة**".

یەكەمیان: هەموو ئەو پەندانەن كە وشەی (**مثل**)ی بۆ بەكارهێنراوە، وەك:

- (**مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً**) (البقرة: ١٧).
- (..**كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ**) (الرعد: ١٧).

دووەمیان: ئەو پەندانەن كە لێكچواندنیان تێدایە، بەڵام وشەی (**مثل**)ی تێدا نییەو ئەكرێ رستەیەكی كورت بخەیتە بری ئەو بۆ نموونە:

- (**وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَاماً**) (الفرقان: ٦٧).
- (..**وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً**) (الإسراء: ١١٠).
- (**وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ**) (الإسراء: ٢٩).

ئەمانە ئەتوانرێ ناوی (**خير الأمور أوسطها**)ی لێی بنێی.

---

[1] الإتقان في علوم القرآن، ١٣١/٢.

[2] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[3] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

یان: ـ (..أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَى وَلَـكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي..)، ئەتوانی بڵێی ئەمە ئەو پەندەیە کە ئەڵێ: (لیس الخبر کالمعاینة)، یان ئەتوانی لە ژێر پەندی: (کما تدین تدان)دا چەندان ئایەتی وەك: (مَن يَعْمَلْ سُوءاً يُجْزَ بِهِ..)، (هَلْ جَزَاء الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ) دابنێی.

بۆ سێیەمیشیان هەموو ئەو ئایەتانەن کەوەك (پەند) بەکاردێن بۆ نموونە:

ـ (..الآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ..). خەڵکی لەکاتی قسەکردندا بەکاری دێنێ.

ـ (... قُضِيَ الأَمْرُ الَّذِي فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ).

ـ (..أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ).

ـ (..وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ..).

ـ (...كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ).

ـ (..وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ..).

ـ (..تَحْسَبُهُمْ جَمِيعاً وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى..).[1]

**ـ سوودەکانی پەنداهێنان (فوائد الأمثال):**

١ـ جوڵاندنی بیروهۆشو هەستو نەست تا زیاتر والاّ بن بۆ وەرگرتنی بیروڕاو پەندو ئامۆژگاری وەك لەسەرتای ئەم ناونیشانەدا نموونەیەکمان باس کرد، یان بۆ نموونە سەیری ئەم ئایەتە بکەو خۆت لێی بکۆڵەوە، خوای گەورە نموونەی قسەی چاك ئەهێنێتەوە بە درەختێك کە رەگو ریشەی بەناخی زەویدا چووەتە خوارەوەو لقو پۆپەکەشی چووەتە ئاسمانو بەوشێوەیەش نموونەی قسەی پیس و خراپ وەك درەختێکە کە لە بنو بێخ دەرهێنرابێو ئارامی لێ هەڵگیرابێ... (وَمَثلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ الأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ) (إبراهيم: ٢٦)، (أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاء * تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا) (إبراهيم: ٢٤ـ ٢٥).

٢ـ پەندهێنانەوەکە شتی دونیای (نامەحسوس) یان (لا مەعقول) ئەکاتە (مەحسوس و مەعقول)و وای لێدەکا بەرجەستە ببێتو بۆی بڕوانرێت، وەك ئەفەرموێت: (.. َمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْداً لاَّ يَقْدِرُونَ عَلَى شَيْءٍ مِّمَّا كَسَبُواْ) (البقرة: ٢٦٤). ئەمە نمونەیەکە بۆ کارو کردەوەی مرۆڤێك کە ریابازەو یارمەتی خەڵکی نادات

[1] بۆ زیاتری ئەم جۆرو نموونانە سەیری (مناع القطان، مباحث في علوم القرآن، ص٢٢٧) بکە.

ئەگەر باسی نەکرێت و پێیدا هەڵنەدرێت، نموونەکە دەری ئەخات کە بابای هەژار ئەو هەمووە پارەو رەنجەش ئەدات کەچی هیچی بۆ نامێنێتەوە، ئایەتەکە ئەفەرموێت: "وەك لێزمە بارانێك وایە کە دابارێتە سەر گابەردێك کە تۆزێك خۆڵی بەسەرەوە بێتو پاش لێزمە بارانەکە هیچی بەسەرەوە نەمێنێ، دەسەڵاتی ئەوەیان نییە شتێك گل بدەنەوە لەوەی رەنجیان بۆ داوە!!".[١]

**٣- **پەنداهێنانو نموونە هێنانەوە وەك چۆن شتی نامەحسوس ئەکاتە مەحسوس، هەرواش شتی گوم دەهێنێتە حزور و ئامادەی ئەکاتو ئەیکاتە شتێکی تەنداروو بەرجەستە، ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێ: (**الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ..**). ئەوانەی کە "سود" ئەخۆن، لە قیامەتدا کە لە گۆڕەکانیان راست ئەبنەوە، سەرسمت ئەدەنو بەملاولادا ئەکەون وەك کەسێك شەیتان چووبێتە پێستیو کۆنترۆڵی لەدەست سەندبێتەوە.

**٤- **نمونەهێنانەوە جاری وا هەیە بۆ (مدح)و پیاهەڵدانە، جاری وا هەیە بۆ سەرزەنشتو سزادانە، جاری واش هەیە بۆ جوانکردنی رەوشتێکە یان بۆ ناشیرینکردنی رەوشتێکی ترە، لە هەموو جارێکیش دا مەبەست پێی ئەوەیە (بیرۆکەی) پەندەکە تەرجەمە بکرێت بۆ کارێکی زیندوو.. بۆ نموونە: خوای گەورە ئەفەرموێت: (**مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّةٍ وَاللّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاءُ وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ**) (**البقرة: ٢٦١**). نموونەی ئەوانەی کە ماڵو سامانیان لە پێناوی بڵاوکردنەوەی دینی خوادا سەرف دەکەن وەك ئەوە وایە دەنکە تۆوێك بچێنێو ئەو دەنکە

---

[1] "مەولەوی عەللامە" ـ بەرەحمەت بێ ـ لەم بواری کردنی "لا معقول" بە "معقول"و "نامحسوس" کردن بە "محسوس"دا ئەفەرموێ:

(نەسیم پەنجەی پات ئەرسەردی کێشان        بدارەش نەتۆی دڵ دەروون رێشان)

واتە: ئەی شنەبا! پەنجەی پێیەکانت ئەگەر سەرمایان بوو، بیهێنەو بیخەرە ناو دڵی گەرمی دڵبریندارانەوە با گەرمی ببێتەوە!! لێرەدا (نەسیمی) لە دونیای (نامەحوسەوە) هێناوەتە مەحسوسو قاچو دەستی بۆ دروست کردووەو پێی ئەڵێ ئەگەر سەرمات بوو وەرە بۆ ناو دڵی (عاریفان) کە بە عەشقی حەقیقی بریندار بوون، تا لەوێدا دەستو پەنجەکانت گەرم ئەبێتەوەو لە هەڵلەرزین رزگارت ئەبێو گەرمت ئەبێتەوە، چونکە نەسیم لە بەربەیاندا هەڵدەکات و عاریفانیش لەوکاتەدا بێدارو بەخەبەرنو چاوەڕوانی چارەسەری دڵیان دەکەن.

حەوت گوڵ سەوز بكاتو هەر گوڵەشی سەد دەنكی تێ بێت، خوا دوو قاتی ئەكاتەوە بۆ هەركەسێك بیەوێتو خوا فراوانو زانایە.

**٥ـ** نموونە قورئانییەكان پڕیشن لە یاساو سستمی جۆراوجۆرو گوشراوی ئەزموونی میللەتانو خەڵكانی تر..

ـ ئەم باسی پەندو "میسال هێنانەوە" ئەوەندە باسێكی گرنگو پڕ بایەخە زانایان كتێبی تایبەتیان لەسەر داناوەو باسیان لە پێناسەو پایەكانیو جۆرەكانیو بیرۆكە ئایینیو عەقڵیو دەروونییەكانیان كردووە، لەوانە: "ئەبوحەسەنی ماوردی شافیعی" خاوەنی كتێبی "أدب الدين والدنيا"و "**الأحكام السلطانية**".

**ـ سیوطی**و ئیبنوقەیمی جەوزیە هەریەكەیان ئەو لە (**الإتقان**)و ئەم لە (**أعلام الموقعين**)ەكەیدا باسێكی گەورەی "نموونە هێنانەوە" دەكەنو **سیوطی** یەك (باب)ی تەواو ئیبنوقەیم نزیكەی چلو ئەوەندە (پەندی قورئانی) لێكداوەتەوە.

**٣ ـ بەڵگەكانی گەردوون و دەروون (آيات الآفاق والأنفس)**

یەكێك لە شتە سەیرەكانی قورئان ئەوەیە باس لە ناخی گەردوونو ناخی دەروون ئەكات.. بۆ ناخی گەردوون ئەفەرموێ: **(أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَى أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ) (الأعراف: ١٨٥ )** واتە: باشە ئەوە بۆ ورد نابنەوە لە مەلەكوتی ئاسمانەكانو زەوی، یان لە هەموو خولقاوێكی تر لەو هەمووە شتەی هەیە، كێ دەڵێ ئەجەلیان نزیك نەبووەتەوە، دەی پاش پەیامەكانی ئەم قورئانە ئیتر بڕوا بەچی تر ئەكەن.

هەروەها ئەفەرموێت: **(قُلِ انظُرُواْ مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لاَّ يُؤْمِنُونَ) (يونس: ١٠١)** بڵێ بڕوانن (ووردببنەوە)[1] لەو شتانەی لە ئاسمانەكانو زەویدا هەن، هەرچەندە بەڵگەو ترساندنیش كەڵكی خەڵكانێك ناگرێ كە بڕیاریان دابێت ئیماندار نەبن، كەواتە بێدینی مەرج نییە لەبەر بێبەڵگەیی بێت، بەڵكو زۆرجار هەر لەبەر بەرەڵاییو لووتبەرزییە وەك ئەفەرمووێت: **(وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْماً وَعُلُوّاً**

[1] لەزمانی عەرەبیدا وشەی (نظر) واتە سەیركردنو روانین بۆ شتێك، ئەو (حەرفە جەرە) ی بەدوایدا دێ زیاتر روونی ئەكاتەوە مەبەست پێی چۆن سەیركردنێكە، بۆ نموونە كە وترا: (انظر اليه)، واتە: بە چاوی سەر بۆی روانی، بەڵام (نظر فيه) واتە: لێی وردبوویەوەو دیققەتی كرد تێیدا.

فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ) (النمل : ١٤ ). لەولاشەوە هەر بەوەناوەستێ کە داوا بکات خەڵکی لە مەلەکوتی زەویو ئاسمانەکان و لە ناخی خۆیان ورد ببنەوە، بەڵکو خۆی دەستی مەعنەوی ئەکات بە ناخی ئەو دوانەداو کۆمەڵێکی زۆر نهێنی دەرئەهێنێ بۆ نمونە ئەفەرموێ:

ـ (أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ) (الأنبياء: ٣٠) واتە: ئەوە کافرەکان بۆ سەیری ئەوە ناکەن کە کاتی خۆی ئاسمانەکانو زەوی یەك پارچە بوونو ئێمە لە یەکمان جیا کردنەوەو تەقاندنمانەوە، پاشان لە ئاو هەموو شتێکی زیندوومان دروست کرد، ئەرێ هەر بڕوا ناهێنن؟!

ـ (وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ * وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ) (الذاريات: ٢٠ ـ ٢١). واتە: لە ناخی زەوییدا بەڵگە زۆر هەیە بۆ ئەوانەی دڵنیان لە دەسەڵاتو گەورەیی خوای، هەروەها لە ناو ناخی دەروونی خۆشتاندا هەمان بەڵگەو نیشانە هەیە، ئەرێ بۆ وردنابنەوەو ناڕوانن؟!

ـ (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (فصلت: ٥٣ ). واتە: لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا بەڵگەکانی خۆمانیان لە گەردوونو لە دەروونی خۆیاندا پێ نیشان ئەدەین تا بۆیان دەرکەوێت ئەم قورئانە "هەقو راستە" باشە پەروەردگاری تۆ (خاوەنی تۆ)[1] بەس نییە (بڕیاری وا بدات) کە شایەتە بەسەر هەموو شتێکەوە.

زانایان لەم جۆرە ئایەتانەوە ئەو دەستەواژەی (آيات الآفاق والأنفس) بەڵگەکانی (گەردوونو دەروون)یان دەرهێناوە کە زۆر شوێن لە قورئاندا ئەو جۆرە ئایەتانەی باسکردووە.

ئێمە لەبەرئەوەی لە باسی ئیعجازی قورئانیشدا گەڕانەوەمان بۆ ئەم بابەتە ئەبێ تەنیا ئەوەندە باس لەم بابەتە ئەکەین کە:

١ـ ئەم باسو خواستەی دەروونو گەردوون رێگەیەکە بۆ ناساندنی خواو پێغەمبەری خواو دینی خوا، سەلماندنی بوونی خوا، دەسەڵاتی خوا، سیفەتەکانی خوا، حیکمەتەکانی

---

[1] (رب) لە زمانی عەرەبیدا چەند مانای هەیە وەك (خولقێنەر)، (خاوەن)، (پەروەردەکەر)، (رۆزی دەر)...و هەروەها سەیری: (المصطلحات الأربعة)ی مەودودی بکە.

بڕیارەکانی خوا، ناساندنی هەندێ ناوی خوا ... هەروەها ناساندنی پێغەمبەرایەتی موحەممەد (**صلى الله عليه وآله وسلم**) و گەورەیی پێغەمبەرو پێویستی شوێنکەوتنی ئەو بۆ دونیاو بۆ ئاخیرەتیش.... هەروەها ناساندنی دینی خوا کە دینێکە تەریب لەگەڵ زانستو تەریب لەگەڵ ژیریو تەریب لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەم مرۆڤەدا، نەك وەك ئاینە دەستکردەکان یان ئایینە دەستکارییکراوەکان، کە یان دژن لەگەڵ فیترەت و زانستو پێشکەوتنی عەقڵیو مەعریفییدا، یان خاڵین لەو جۆرە راسپاردانە.

**٢ـ** ئەم باسی گەردوونو دەروونە رێگە بۆ جولانو کرانەوەی بیروهۆش و هەستونەست ئەکاتەوە، بیر فراوان ئەکاتو وای لێ ئەکات بە دوای ئەو ئاماژە قورئانیانەدا بڕواتو بگاتە ئەنجام، هەستو نەستیش ئەوەندە ئەوروژێنێ ناچاری ئەکات سەر لە بەردەم بەرزیو بڵندی خواو قسەی خوادا دابنەوێنێت... هەر بۆ نموونە سەیری ئەم چەند ئایەتە بکە... خوای گەورە ئەفەرموێت: (**أَلَمْ نَجْعَل لَّهُ عَيْنَيْنِ * وَلِسَاناً وَشَفَتَيْنِ * وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ * فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ**) (**البلد: ٨ـ ١١**). **واتە:** ئەرێ ئێمە دوو چاومان نەداوە بەم مرۆڤە هەروەها زمانێك هەروەها دوو لێو، پاشان بەرچاو رۆشنمان کردوەو بۆ ناسینی خێرو شەڕ، دەی ئیتر بۆ راناداتە مەیدان و پلە سەختەکان ببڕێ... سەیری ئەم ئایەتە بکەو لێی ورد بەرەوە.

ـ خوا دووچاوی داوە بە مرۆڤ هەر لە دوورەوە سەیری دەکەی بە رووکەش شتێکی جوانە، ئەگەر یەك دانە بێ، وا جوان نابێ، بەڵکو ناشیرینیشە، چاو زمانی تایبەتی خۆی هەیە، ئەتوانی بە چاو بەرامبەر حاڵی بکەی لێی رازیت یان لێی تووڕەیی..

ئەم چاوانە لە (سەر) دا دانراون کە بەرزترینو قایمترین شوێنی لەشە، لەبەرئەوەی چاو ناسکە وەك لووت یان گوێچکە، یان لێو لە تەختاییدا دانەنراوە، بەڵکو خراوەتە ناو چاڵێك، تا ئەگەر دەموچاویش لێدانێکی خوارد چاو پارێزراو بێت لەو لێدانە ئەگەر مستەکۆڵەکیش بێت، پاشان چاوی پەرژین کردووە بە (برۆ)و بە (برژانگ) کە هەریەکەیان جگە لە جوانی دان بە چاو رووی مرۆڤ چەند کاری گرنگی تریان پێ سپێردراوە.

(برۆ) وەك قەراغی دەرچووی کلاوێك کە کرابێتە سەر وایە رۆڵی پاراستنی چاو ئەبینێت لە خۆر، عارەقی دەموچاو کۆئەکاتەوەو لەلا جانگەکانەوە ئەیانرژێنێ بە سەر روومەتی مرۆڤدا، کەسێ برۆی نەبێ زۆر ناشیرینە، یان ئەگەر برۆی نارێك یان رەنگی کاڵ بێتو هەروەها.

برژانگ، جگە لەوەی جوانی بە دەموچاوت ئەدات و ئەگەر نەبێت، یان کورتو شاش بێت مرۆڤ مژمۆڵەو چاو کونەدەرزی ئەنوێنیٚو ناشیرینە، جگە لەم جوانییە رۆڵی گەورەش ئەبینیٚ بۆ دابەشکردنی تیشکی خۆر بە سەر دەموچاو و پێشەوەی مرۆڤدا، رۆڵی ئەوەش ئەبینیٚ کە تەپوتۆزو شتی زیانبەخش گل ئەداتەوە نایەڵیٚ بچێتە ناو چاو.

خوای گەورە سروشتی (پتاندن)ی داوە بە چاو کە ئۆتۆماتیکی ناو ناوە ئەپتێتو وەك فلچەی سەیارە چۆن بە هاتنو رۆیشتنی بەسەر جامەکەدا بینین روونـاکتر و ئەکات، ئەو پرتاندنەی چاویش هەمان رۆڵ ئەبینیٚ بۆ نموونە تۆ ماوەیەك چاوت مەپتێنە، هەست بە لیڵییەك ئەکەی.

هەروەها خوای گەورە ئاوی چاوی سوێر کردووەو ئاوی گوێچکەی بۆ نمونە تاڵ کردووە، کە ئەگەر پێچەوانە بوایە مرۆڤ هەر زوو چاویشو گوێچکەشی لەدەست ئەدات، ئەو سوێرییەی چاو رۆڵی زۆری هەیە بۆ پاککردنەوەی چاو، ناوەندێکە میکرۆب تێیدا گەشە ناکات، هەر تەنێکی نامۆی تێبچیٚ (مێشوولە، تۆز، خۆڵ، وردە دار،..) خێرا بە هۆی بەو سوێرییەوە لەت و پەت ئەکریٚو لافاوی ئاوە سوێرەکە بەرەو دەرەوەی ئەبات، کە ئەگەر وانەبوایە چاوی زۆری نەئەبرد کز ئەبوو و پاشان کوێر و عەیبدار ئەبوو.

(چاوو برۆ) نهێنی جوانییە لە مرۆڤدا، شاعیران و گۆرانیبێژان هەر بە چاوو برۆدا بەیت هەڵئەدەن، ئافرەتانیش ئەوەندەی خەریکی چاوو برۆیان ئەبن خەریکی شوێنێکی تریان نابن، بەکارهێنانی ماسکارا بۆ برژانگو هەڵگرتنی برۆو بەرزرکدرنەوەو باریك کردنو پانکردن... ئەو جۆرە شتانە بریتییە لە ئەو سەرقاڵییەی کە زۆرێك لە ئافرەتانی پێوە گیرۆدە بووە....

ئەی زمانو لێوەکان ؟ نکوڵی لەوەناکرێت زمان وەك پارچە گۆشتێك چەندان رۆڵی گەورە ئەبینیٚ لە رووی ئەرکە بایۆلۆجییەکانەوە، بەلام لە هەموو گرنگتر ئەوەیە ئەم زمانە رۆڵ لە قسەکردندا ئەبینیٚ، نهێنی هێزی کەسایەتی مرۆڤ لە زمانیدایە، منداڵێك زمان زان بێت کەسایەتی بەهێزترو خۆشەویستترە لە منداڵەکەی هاوڕێی، بەپێچەوانەشەوە منداڵێك زمانی نەبیٚ کەسایەتیشی نییە و ناتوانیٚ کەسایەتی بۆ خۆی دروست بکات، یان حەزو ئاواتەکانی دەربڕیٚ، ناتوانیٚ بەشداری ژیان بکات وەك خەڵکی تر، گۆشەگیر ئەبیٚ کاریگەر نابیٚ لەسەر کەسو لەسەر هیچ، لێی بپرسی چیت ئەویٚ، تەنیا داوای (زمان) ئەکات، ئەگەر بە بەرانبەرشتێکیشەوە پێی بدریٚ ئامادەیە چی هەیە بیدات بۆ ئەوەی زمانی دەست بکەویٚ تەنانەت چاوی ئەدات بۆ ئەوەی پڕ بە حەزی خۆی قسە بکات، لیوەکانیش بەهەمان شێوە

مایەی جوانی دەمو چاون، کەسایەتی مرۆڤیان تێدا تۆمار کراوە لێوی باریك نیشانەیە بۆ کزی لایەنی جنسی ئەو مرۆڤە، لێوی گەورەو قەڵەو بە پێچەوانەوەیە.

لێورۆڵی گرنگی هەیە لە قسەکردنو قسەخۆشییدا، شوێنی لەزەت بردنەو سەدان خانەی هەستیاری تێدایە... ئەمە بە کورتی و بە رووکەشی خۆ ئەگەر دوای ئەم ئاماژە قورئانییە بکەوی و بزانی هۆی چییە خوای گەورە سەرنجی مرۆڤ بۆ چاوو لێوو زمان رادەکێشێ، بڕۆیت لە زانایان بپرسی ئەم بەڵگەی (دەروونە) چییە، سەرت سور ئەمێنێ لە گەورەییو دەستڕەنگینی خوای گەورەو دانایی و وردەکاری ئەو خولقێنەرە بۆ ئەم خولقاوە... زانستی تازە ئەڵێ:

- لە زماندا (نۆ هەزار) دەمیلەی چەشتن هەیە بۆ جیاکردنەوەی تاڵ لە سوێرو سوێر لە شیرین.

- لەیەك چاودا سەدو چل ملیۆن وردە ئاوێنەی هەستیار هەیە بۆ تیشك کە ئەوە لەناو پەردەیەکدایە لەو (١٠) پەردەی تۆڕی چاوی داپۆشیوە، کە بەهەر (١٠) پەردەکەیەوە ئەستوورەیەکەی دەگاتە (٠,٤ ملم).

- لە چاوەوە نیوملیۆن دەماری لیمفاوی هەیە کە وێنە بەشێوەیەکی رەنگاو رەنگ ئەگوزاێتەوە.

زانایان هاتوون زمانیان هەڵدڕیوە بۆ لێکۆڵینەوە لێی، بۆیان دەرکەوتووە پێشی زمان جۆرە دەمارێك و پاشەوەی بەجۆرە دەمارێکی تر بەلەشەوە بەستراوەتەوەو هەندێکیان جووڵەی دەموچاو ئەیجولێنیو هەندێکیان لیکەرژێنەکانو هەندێ پەیوەندن بە (مۆخ = دەماغ)ەوە، باسێکی زۆرو وردی دەماری هەستو چەشتن ئەکەن لە زماندا کە ئێمە بە گونجاوی نازانین لەم کتێبەدا بیگوازینەوەو لە مەبەستی کتێبەکە لابدەین.[١]

## ٤ ـ سوێندەکانی قورئان

گواستنەوەی سوێندی هەندێ لە پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**)، یان هەندێ لە بێباوەڕان لە قورئاندا شێوازێکە لە شێوازەکانی دەربڕین بۆ مەبەستێکی تایبەتی، هەروەها خوای گەورەش هەندێ سوێندی خواردووە لە قورئاندا بۆ هەندێ باسو مەبەست کە جێی

[1] بۆ زیاتری ئەم باسە سەیری (موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن الكريم والسنة المطهرة)ی یوسف الحاج أحمد، ل ٩٠ـ ٩٥، بکە.

مشتومڕی خەڵکییەو بەرژەوەندییان لەوەدایە کە بیسەلمێنن نەك نكولی لێ بكەن. بۆ نموونە خوای گەورە ئەفەرموێ: (**وَيَسْتَنبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ وَمَا أَنتُمْ بِمُعْجِزِينَ**) (**يونس: ٥٣** ) واتە: داوای هەواڵی ئاخیرەتو پاش مردنت لێ ئەکەنو ئەڵێن ئەرێ ڕاستە قیامەت هەیەو خەڵکی زیندوو ئەبنەوەو لە قەبرەکان دێنەدەرەوەو حەشر ئەکرێنو ستەمکاردەستی لە هەموو شتێك بەرئەبێتو هیچی نییە خۆی پێ بکرێتەوە هەرچی هەیە هەمووی هی خوایەو[1]... تۆش بڵێ: ئەرێ سوێند بە خوا ئەوە ڕاستەقینەیە.

خوای گەورە تەنیا لە سێ[2] شوێندا لە هەموو قورئاندا داوای سوێند خواردنی لە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) کردووە ئەمەیان و سوێندێکی تر لە سورەتی (التغابن) ئایەتی (٧) کە ئەفەرموێ: (**زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ**). واتە: ئەوانەی کافر بوون لافی ئەوە لێئەدەن کە هەرگیز زیندو ناکرێنەوە، ئەگەر پرسیاری ئەوەیان لێ کردی بڵێ: سوێند بە خوای خاوەنم بە دڵنیاییەوە زیندوو ئەکرێنەوەو پاشان هەواڵی هەموو کردەوەکانیشتان پێئەدرێ کە پێی هەستاون، ئەوە کارێکی ئاسانە بە نیسبەت خواوە.

سوێندێکی تریش لە سورەتی (السبأ) ئایەتی (٣) کە ئەفەرموێ: (**وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَالِمِ الْغَيْبِ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَلَا أَصْغَرُ مِن ذَلِكَ وَلَا أَكْبَرُ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ**). واتە: کافرەکان ئەڵێن، قیامەتمان نایەت بەسەردا، بڵێ: سوێند بە خوای خاوەنم قیامەت دێت بەسەرتاندا.

لەچوار شوێنی تردا[3] خۆشی سوێند ئەخوات بەزاتی خۆی:

- (**فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيّاً**) (**مريم: ٦٨** ).
- (**فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِيْنَ**) (**الحجر: ٩٢** ).
- (**فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً**) (**النساء: ٦٥** ).
- (**فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ * عَلَى أَن نُّبَدِّلَ خَيْراً مِّنْهُمْ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ**) (**المعارج: ٤٠ ـ ٤١** ).

---

[1] التفسير المنير ٦/٢٠٤.

[2] مناع القطان علوم القرآن، ص٢٨٦.

[3] مناع القطان علوم القرآن، ص٢٨٦.

جگە لەم حەوت شوێنە کە چواریان خوای گەورە خۆی سوێند بەزاتی خۆی ئەخواتو (سیانیان) داوا لە پێغەمبەر ئەکات کە سوێند بە زاتی خوا بخوات، سوێندی شوینەکانی تری قورئان سوێندخواردنە بە خولقاوەکانی خوا وەك: (وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا). (وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى) . (وَالْفَجْرِ) (وَلَيَالٍ عَشْرٍ) . (وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ) لەیەك شوێنیشدا خوای گەورە سوێند بە گیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم) ئەخوات ئەوەتا ئەفەرموێ: (لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ) (الحجر: ٧٢ ).

زانایان ئەفەرموون: سوێندخواردنی خوای گەورە زۆرتر لە دوو کاتدایە:

یەکەم: لە شتێکدا سوێند ئەخوا کە پرسێکی گەورەو گرنگ بێت لە گەردوون دا.

دووەم: لە کاتێکدا سوێند ئەخوا کە نکوڵی لەو شتە گەورەو گرنگە بکرێ.

بۆ نمونە سەیری ئەو سوێندانەی بەزاتی خۆی ئەیخوات یان داوا ئەکات لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم) کە سوێند بە زاتی خوا (عز وجل) بخوات.

ـ (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً) (النساء: ٦٥ ).

ـ (فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيّاً) (مريم: ٦٨ ).

ـ (وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ قُلْ بَلَى وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَالِمِ الْغَيْبِ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَلَا أَصْغَرُ مِن ذَلِكَ وَلَا أَكْبَرُ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ) (سبأ: ٣).

یان لە چەند شوێنی تردا بۆ پرسی گرنگو هەستیار سوێند بەکاردەهێنێ وەك :

ـ وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ (١) وَطُورِ سِينِينَ (٢) وَهَذَا الْبَلَدِ الْأَمِينِ (٣) لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ (٤).

ـ لَا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ (١) وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ (٢) أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَلَّن نَجْمَعَ عِظَامَهُ (٣).

**ـ سوودەکانی سوێند خواردن:**

زانایانی زمانی عەرەبی سوێندخواردن ئەکەنە سێ بەش: (سوێندی ئیبتیدائی)و (سوێندی طەلەبی)و (سوێندی ئینکاری).. سوێندخواردنیش بۆ چەند مەبەستێکە:

١ـ لابردنی دوودڵیو گومان لە دڵی موسڵمانانادا.

٢ـ لەناوبردنی گومانو دوودڵییەکان.

٣ـ هێنانەوەی بەڵگە و بورهان بۆ پرسە ئاینییەکان.

٤ـ دووپاتکردنەی هەواڵەکانو سەلماندنیان لە جوانترین شێوازدا.

سەیرکە بۆ نموونە خوای گەورە چۆن ئەم پرسە گەورانە ئەسەلمێنێتو دەریان ئەبڕێت:

**(فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ * عَلَى أَن نُّبَدِّلَ خَيْراً مِّنْهُمْ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ * فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّى يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ * يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ سِرَاعاً كَأَنَّهُمْ إِلَى نُصُبٍ يُوفِضُونَ * خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ذَلِكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ) (المعارج: ٤٠ـ ٤٤)**. واتە: نا، وانییە سوێند بە خولقێنەرو خاوەنی هەموو رۆژهەڵاتەکانو هەموو رۆژئاواکان، ئێمە دەسەڵاتمان بەسەرئەوەدا هەیە کە ئەمانە بگۆڕین بە کەسانی باشتر لەوانو کەس نییە بتوانێ پێش لە ئێمە بگرێ . لێیان بگەڕێ با لە بێئاگاییدا رۆبچنو هەر خەریکی گاڵتەو گەپ بن تا ئەگەنە ئەو رۆژەی کە بۆیان دیاری کراوە. ئەو رۆژەی کە لە قەبرکانیانەوە بە پەلە دێنە دەرەوەو حاڵیان وەك ئەوە وایە کە بەرەو بتەکانیان بەپەلە پەل برۆن. چاویان نیشتووەو زەلیلی دایگرتوون، ئەوە ئەو رۆژەیە کە بەڵێنیان پێدراوە (بگەڕینەوە بۆیو تێیدا زیندووبکرێنەوەو کۆبکرێنەوە) لێیان بپرسرێتوەوەو پاشان پاداشتی هەموو کەس بدرێتەوە.

ـ خوای گەورە سوێند بە هەمو ورۆژهەڵاتەکانو رۆژئاواکان ئەخوات، ئەوەش زانراوە کە قورئان سێ جۆر سوێند بە رۆژهەڵاتو رۆژئاوا ئەخوات، **(رب المشرق والمغرب)**، **(رب المشرقين ورب المغربين)**، **(رب المشارق والمغارب)**، زانایانی گەردوونزانی ئەڵێن: زەوی (رۆژهەڵاتو رۆژئاوا) دروست ئەکات، ئەستێرەی واش هەیە دوو رۆژهەڵاتو دوو رۆژئاوا دروست ئەکاتو هی واش هەیە چەند رۆژهەڵاتو رۆژئاوا دروست ئەکات.[1]

ـ بەو سوێندە (بە رۆژهەڵاتەکان و رۆژئاواکان لە گەردووندا) خوای گەورە سێ راستی ئەسەلمێنێ:

١ـ دەسەڵاتی بێسنووری خوا.

٢ـ ئیرادەی بێسنوری خوا.

٣ـ دادی بێسنووری خوا.

[1] موسوعە الاعجاز العلمی، یوسف الحاج أحمد، ص٣٢١.

كە یەکەمیان لە (إنا لقادرون)و دوەمیان لە (نبدل خیرا منهم)و سێیەمیان لە (**یومهم الذي** یوعدون)دا دەردەکەوێت، قودرەتی خوا لە ئایەتەکەدا روو لە سێ کار دەکات:

١ـ دروستکردنی رۆژهەڵاتو رۆژئاواکان.

٢ـ گۆڕینی ئەو خەڵکە بە خەڵکی تر.

٣ـ هێنانی رۆژی قیامەتو لێپرسینەوەو زیندووبوونەوە. هەروەك ئیرادەکەش روو لە سێ کار ئەکات: دروستکردنی خولقاوەکان، گۆڕینی بەردەوامی خولقاوەکانو مراندنو زیندووکردنەوەی خولقاوەکان، گۆڕینو بەرزو نزمکردنەوەی بەهەریەك لەو خولقاوانە لە رۆژی قیامەتدا.

جا خوێنەری بەڕێز هەریەك لەو راستییانە وردبکاتەوە بزانێ لە راستییدا ئایەتەکە ئاماژەی هەموو ئەو راستییانەی تێدایە.

خوای گەورە بەو شێوەیە موسڵمانانو قورئانخوێنەکان دڵنیا ئەکاتەوە کە گومان مەبەن خوای گەورەی توانای سەرخستنو پاراستنی ئاینی خۆی و پێغەمبەرەکەی و دڵسۆزانی ئاینەکەی نییە، ئاگاداربن! خوایەك خولقێنەری ئەو هەمووە ئەستێرەو هەسارانە بێتو خاوەنی ئەو هەمووە خولقاوە جۆراو جۆرانە بێت، ئەتوانێ کە تۆڵەش لە کافران بسەنێت و ئاینیش پێش بخاتو بێدینیش نەهێڵێ و کۆمەڵێکی تر بهێنێتە سەر شانۆی ژیان و ئەگەر ئەوەشی لەبەر حیکمەتێك دواخست ئەوە دیارە رۆژێك هەیەو هەموو تێیدا زیندوو ئەکرێنەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ئەکرێو چاك چاکەی لەگەڵدا ئەکرێو خراپەکاریش تووشی چارەنووسی رەشی خۆی ئەبێت.

**٥ ـ پەیمانو هەڕەشە (الوعد والوعید):**

قورئان رێژەیەکی زۆر پەیماندانی تێدا بەباوەڕداران‌و رێژەیەکی زۆریش هەرەشی تێدایە بۆ کافران، زانایان هەریەك لەو دوو جۆرە پەیمانە ئەکەنە دوو بەشی گەورە: پەیمانو هەڕەشە دونیاییەکانو پەیمانو هەڕەشە قیامەتییەکان.

خوای گەورە پەیمان ئەدات بەوانەی کە کتێبو ئاینو پێغەمبەری ئەو قەبوڵ ئەکەن هەر لە دونیادا:

ـ کارمەرانیان بکات.

ـ بەڕێزیان بکات.

ـ سەرکەوتوویان بکات.

- دەسەڵاتیان بداتێ.
- بێترسیان بکات.
- بەڕێزەوە گیانیان بکێشێ.
- گیانیان بەرەو ئاسمان بەرێتەوە.
- لەقەبردا دامەزراوو زمان پاراویان بکات.
- ئاسودەیان بکاتو لە لێپرسینەوەی قەبرو ئازارەکانی پارێزراویان بکات.
- لە قیامەتدا سەربەرزو بەڕێزیان بکات.
- بەهەشتیان بداتێ و رەزامەندی خۆی بڕژێنێ بەسەریاندا.

ئەوەتا بۆ نموونە خوای گەورە ئەفەرموێ:

- **"ألا بذكر الله تطمئن القلوب**، هۆشیار بن هەر بە یادی خوا دڵ ئارامئەگرێ".
- (**إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدّاً**) ئەوانەی باوەڕ ئەهێننو کاری چاکە ئەکەن خوای گەورە خۆشەویستییان ئەخاتە دڵی خەڵکانو بەڕێزیان ئەکات.
- (**إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ**) ئێمە پێغەمبەرانو بەندە ئیماندارەکانی خۆمان لە دونیادا سەرئەخەینو لەو رۆژەشدا کەشایەتەکان دێن بۆ شایەتی دان (واتە رۆژی قیامەت).
- (**وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا منكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ**) خوا پەیمانی داوە بە ئەوانەی ئیمانداری راستەقینەن و کاری چاك ئەکەن بە دڵنیاییەوە ئەیانکاتە جێنیشینی خۆی لە زەویدا....
- (**وَالنَّازِعَاتِ غَرْقاً * وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطاً**) سوێند بەو فریشتانەی کە بە هێمنیو ڕێزەوە گیانی ئیمانداران دەکێشن.
- (**يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللّهُ مَا يَشَاءُ**).
- (**يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَنِ وَفْداً**).
- (**وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَراً حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ**)

بەهەمان شێوەش خوای گەورە پەیمانێکی زۆر بە کافران ئەدات کە:
ـ لە دونیادا بێتاقەتو نائاسودەیان بکات.
ـ ژینیان تەنگ بکات.
ـ بێزێزیان بکات لای هەموو خولّقاوەکان لەزەوی‌و ئاسمانەکاندا.
ـ لە سەرەمەرگدا بەو سوکایەتییەوە گیانیان ئەکێشرێتو تێهەڵدان ئەکرێن.
ـ لەقەبردا سزاو سوکایەتییان ئەبێت بە تووشەوە.
ـ لە قیامەتیشدا ریسوا ئەکرێن و ئەخرێنە جەهەننەم.
ـ لە ئاگریشدا "چغە"یان لێ ئەکرێت و وەك "سەگ" سەیر ئەکرێن..
ئەوەتا بۆ نموونە خوای گەورە ئەفەرموێت:
**ـ (وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى)**
**ـ (وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ من مُّكْرِمٍ).**
**ـ (النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوّاً وَعَشِيّاً وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ).**
**ـ (قَالَ اخْسَؤُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ * إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ * فَاتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيّاً حَتَّى أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ * إِنِّي جَزَيْتُهُمُ الْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوا أَنَّهُمْ هُمُ الْفَائِزُونَ) (المؤمنون: ١٠٨ـ ١١١ ).**

کەواتە بەم شێوەیە دەرکەوت کە بەشێکی تری بابەتەکانی قورئان ئەم (وعدو وعید)ەیە کە خوای گەورە ئەیدات بە دۆستانی خۆی‌و بە دوژمنانی دینەکەی.

**٦ ـ موناقەشەو حیوار لە قورئاندا (الجدل في القرآن)**

لە زمانی قورئاندا وشەی (جدل) زیاتر بەکاردەهێنێت مەبەستیش پێی موناقەشەو حیوارکردنە لەگەڵ بەرانبەردا بە مەبەستی ئەوەی راستییەکی بۆ دەربخەیت، خوای گەورە ئەفەرموێ: **(وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلاً)** (الكهف: ٥٤).

**حیوارو موناقەشەکانی قورئان بۆ چەند مەبەستێکە:**

١ـ سەلماندنی بیروباوەڕە ئاینییەکان وەك: بوونی خوا، کەماڵی خوا، زیندووبوونەوە، جیایی خولّقاو خولّقێنەرو..... هتد.
٢ـ بەرپەرچدانەوەی نکولیکەران و پوچکردنەوەی بەڵگەو گومانەکانیان بە زۆر شێواز.
٣ـ مەحکومکردنی بەرانبەر بە قسەکانی خۆی.

٤ـ دانانی چەند بنەمایەك بۆ مونازەرەو حیوار تا بەرامبەر خۆی لەوەلاّمەکان نەدزێتەوە.

٥ـ قورئان ئەنجامی حیواری لا زۆر مەبەستە، بۆیە داوا لەوانە دەکات کە بانگ ئەکرێن بۆ موناقەشە ئەگەر لە سەر یەك وشەش بووە (رێبکەون) باشترە لەوەی هەر کەسەو بەلایەکدا بڕوات‌و حیوارەکە بیَ ئەنجام بێت.

بۆ یەکەمیان (سەلماندنی بیروباوەڕە ئاینییەکان) بۆ نموونە خوای گەورە ئەفەرمویَ:

ـ (**لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ**) واتە: ئەگەر دوو خوا ببوایە لەم زەوی‌و ئاسمانەدا ئەوە هەردووکیان (چ زەوی‌و چ ئاسمان) گەندەڵ ئەبوون، تێك ئەچوون... ئەم بەڵگەیە (بورهانێکی عەقڵییەو لە دوو سەرەتاو ئەنجامێك دروست بووە:

سەرەتای یەکەم: ئەگەر دوو خوا ببوایە، زەوی‌و ئاسمانەکان تێکئەچوون.

سەرەتای دووم: زەوی و ئاسمانەکان تێکنەچوون‌و بەردەوامن.

ئەنجامەکەی: کەواتە یەك خواو ئیرادەی یەك خوا هەیە لە زەوی‌و ئاسمانەکاندا. ئەمە چۆن؟

زانستی (**منطق**) ئەڵێت: "ئەگەر ئەم جیهانە دوو خولقێنەری هەبوایە ئەوە دوو ئیرادەش کاریان ئەکرد تێیدا، جا ئەگەر یەکێکیان مەبەستی بوایە فلاّن بمرێت‌و ئەویان مەبەستی بوایە نەمرێت، ئەوکاتە هەردوو ئیرادەکە ئەکەوتنە سەر ئەو کەسە جا ئەو کاتە یان هەردووکیان ئەهاتنە دی کە ئەمە کۆبوونەوەی دو دژە لەیەك کاتداو لە عەقڵدا ئەمە مەحاڵە، یان ئیرادەی هیچ کامیان نەئەهاتەدی، ئەوەش نوقسانی‌و دەستەوسانی هەردووکیانی ئەسەلماند، یان هی یەکێکیان سەری ئەگرت‌و نوقسانی ئەویان ئەسەلماو دەرئەکەوت کە ئەویان خوایەو ئەمی تریان درۆیە خوانییەو نوقسان‌و دەستەوسانە".[1]

ـ یان ئەفەرموێت: (**أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى * أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى * ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى * فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى * أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَى**) (**القيامة: ٣٦ ـ ٤٠**) . واتە: "ئایا مرۆڤ وا حساب دەکات هەروا لە خۆرایی دەستی لیَ بەربدرێت‌و لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکرێت * باشە ئەو سەرەتا (دڵۆپە

[1] علوم القرآن، مناع القطان، ص٢٩٧.

مەنییەك) نەبوو كە فڕێ درایە ناو ڕەحم * پاشان بوو بە زالویەكو خوا كردیە خولْقاوێكی ڕێكو پێكو پاشان دوو توخمی نێرومێی لێ خستەوە * ئەمانە دەری ناخەن كە خوای گەورە ئەتوانێ مردووش زیندوو بكاتەوە...".

ئەم بەڵگەیەش دیسان بورهانێكی لۆژیكییەو لە چەند سەرەتاو ئەنجامیك دروست بوون كە كورتەكەی ئەوەیە مادامێك خوایەك بتوانێ هەموو ئەو سەرەتایانە كۆنترۆڵ بكات، زیندووبوونەوەش كۆنترۆڵ ئەكات...

یەك تێبینی ورد هەیە لەم پرسی زیندووبوونەوەدا ئەویش ئەوەیە: خوای گەورە بە دوو شێواز پرسی زیندووبوونەوە ئەسەلمێنێت:

یەكەمیان لە ڕێگەی لە ڕێگەی كۆرپەلەی مرۆڤەوە.

دووەمیان: لە ڕێگەی كۆرپەلەی رووەكەوە. ئەمەیان چۆن؟

خوای گەورە بۆ یەكەمیان ئەفەرموێت: (**فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ * خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ * يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ * إِنَّهُ عَلَى رَجْعِهِ لَقَادِرٌ**) (الطارق: ٥ـ ٨). واتە: با مرۆڤ وردبێتەوە لە چی دروستكراوە، لە ئاوێك دروست كراوە كە بەگوژم دەردەچێت، لەنێوان سنگی ئافرەتو پشتی پیاوەو دێتە دەرەوە، * خواش توانای بەسەر ئەوەدا هەیە جارێكی تریش دوای مردن زیندووی بكاتەوە. لە قورئاندا لە چەندان ئایەتی تردا ئەم چەمكە باسكراوە.

بۆ دووەمیشیان ئەفەرموێت: (**فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ * أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاء صَبّاً * ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقّاً * فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبّاً * وَعِنَباً وَقَضْباً * وَزَيْتُوناً وَنَخْلاً * وَحَدَائِقَ غُلْباً * وَفَاكِهَةً وَأَبّاً * مَّتَاعاً لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ * فَإِذَا جَاءتِ الصَّاخَّةُ * يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ * وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ * وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ * لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ**) (عبس: ٢٤ـ ٣٧). واتە: (با مرۆڤ وردبێتەوە لە خواردنەكەی خۆی، ئێمە لە ئاسمانەوە ئاو خوڕێنەكەینەوە و پاشان زەوی شەقو لەت ئەكەینو یەكسەر تۆو سەر دەردێنێو شین ئەبێتو ترێ و قامیشو زەیتونو دارخورماو باخی چڕو میوەو ئالیك سەوز دەبن بۆ خۆشی و خزمەتی خۆتانو ئاژەڵەكانتان، كە لە پڕ شریخەی قیامەت دێت ئەوكاتە خەڵكی لەبراو دایكو باوكو هاوڕێ (خێزان)و منداڵەكانی خۆی را ئەكاتو هەموو كەسێك لەو ڕۆژەدا ئەوەندە سەرقاڵی هەیە نەیپەرژێتە سەر كەسی تر)، لە قورئاندا لە چەندان ئایەتی تردا ئەم چەمكەی دووەمیش دووبارە كراوەتەوە.

ئەبێ پەیوەندی ئەم دووانە (کۆرپەلە)ی (مرۆڤ)و (رووەك) چی بێت لەگەڵ دووبارە زیندووبوونەوەی مرۆڤەکاندا؟ یەك پەیوەندی سەیرو زۆر ئاشکرا هەیە لەو نێوانەدا ئەویش ئەوەیە کە: خوایەك بتوانێ لەیەك دڵۆپ ئاو (مەنی) مرۆڤێکی زیندوو دروست بکات، یان لەیەك دەنکە (تۆوی) رەق ئەم دەشتو دەرە هەمووی بە گژوگیاو دارودرەختییەوە زیندووبکاتەوە، ئایا ناتوانێ جارێکی تر ئەو کارە دووبارە بکاتەوە؟

مامۆستا هەژار موکریانی شتێکی جوان و خۆش بەپەخشانە شیعر لەم بارەیەوە ئەڵێ لە کتێبی (یەك لە پەنای سیفرو خاڵی بێ برِانەوە)دا، ئەڵێت:

راکێشێ، داکێشێ، بیرکەوە، بیر — پێشتر چیبووی منالی پیر
ژنو پیاگێ[1] پێك گەیشتن — بەچاو، بەدڵ تێك گەیشتن
دڵۆپێك لەو، تنۆکێك لەم — لەناو پزدانێك[2] کران جەم
تێکەڵاوبوون بۆ تەواوبوون — گۆرِا ئێسقانو گۆشتو هوون[3]
نۆ مانگو نۆ رۆژو نۆ سەحات — چاوە چاو بووی تا نۆرەت هات
ئەتۆش وەکو جوجیلەی[4] مەل — مایتەوە تا بۆت هەڵکەوت هەل
تۆکڵت شکاند پەردەت درِاند — بەرەو ژین لەمپەرت[5] پەراند
تۆ لە جوجك بێهێتز بووی — بێ دەرەتان و پێز تر بووی
ئەو دێتە دەر بە چووکە چووك — بۆ دان ئەکوتی پەلو دەندوك[6]
بەڵام تۆ پلە گۆشتێ شل — نەپەل، نەمل، نە گورِ، نە تل
چاو نەپشکو قەتیس و گیر — ملچەی لێوت دەهات بۆ شیر
زیقەت دەهات شیرت دەویست — دەگریای، دەبنە خۆت دەمیست
ئێساش، چی؟ لەپاش سەد ساڵی — چوویتەوە دەقی منداڵی

---

[1] پیاگ: پیاو.

[2] پزدان: پرزانگ، پز: منالەو پزدان: شوێنی منالەکەیە، واتە: منالْدان.

[3] هوون: خوێن.

[4] جوجیلە: جووجەڵە، بەچکە.

[5] لەمپەر: سنوور، رێگر.

[6] دەندوك: دەنووك.

چاو نابینێ! گوێ ناژنەوێ[1]      دانت نەما! شیرت دەوێ!
یەخسیری![2] لەناو جێگادا      موغەرەت[3] زەوی بەرنادا
لەوەرەزیان[4] ئەغلەب خەوتووی      بێ هێزو پێز، لەکارکەوتووی
هەرسێ کارت ماوە لە ژیان      خواردن وڕێنەو گریان[5]
هەروەها ئەڵێ:
ژین چییە؟
ئاوێك[6]، تۆوێك[7]
تۆمی گیایەك لەژێر خاکا زۆر هەڵناکا
سەردەردێنێ، شین دەنوێنێ
بەخۆدا دێ، دەبێتە چڵ، دەبێتە گوڵ
نەمام دەبێ بەشەنگەدار      گەڵایە، لکە، میوەو بار
پیر دەبێ، وشك ئەبێ، ئەپوێ      لە تۆوەکەی هی دی دەڕوێ
دڵۆپێك ئاو:
پزە،[8]ساوایە، منداڵە، لاوە، سەرەیە، پاتاڵە[9]
لە هەڵسوڕو داسوڕدایە      ئەویش وێنەی داروگیایە
چرای ژینی دەکوژێتەوە      لە خاکا سەردەنێتەوە
تۆمەکەی هەڵدەداتەوە      ژیان دەست پێدەکاتەوە.[1]

---

1 ناژنەوێ: نابیستێ
2 یەخسیر: بەندو ئەسیر.
3 مۆغەرەت: سمتو دوای مرۆڤ.
4 وەڕەز: وەڕسیو بێتاقەتی.
5 یەك لەپەنای سفرو حاڵی بێ بڕانەوە، هەژار، ل ١٢و ١٣.
6 ئاوێك: دڵۆپە مەنییەك.
7 تۆوێك: تۆوی رووەکێك.
8 پز: کۆرپەلە (جنین).
9 پاتاڵ: لەکارکەوتە، بێکەڵك.

ئەم دوو كارە زیندووكردنەوەی داروودرەخت لە ڕێگەی تۆوێكەوە، زیندوو كردنەوەی مرۆڤ لە ڕێگەی تنۆكە ئاوێكەوە كارێكی ئاسانە، چونكە بناغەو بنچینەی ئەو دووشتە بە كەبسكراوی پارێزراوە لەو (تۆو)و (تۆمە)دا، وەك چۆن (جامی وێنەیەك) لە پاشاندا هەزاران وێنەی لەبەر دەگیرێتەوە، ئەوانیش هەروا... خوایەك بتوانێ لە تۆوی بنیادەمێك مرۆڤێكی خاوەن گیان دروست بكات لە ڕەحمی ئافرەتاندا ئەشتوانێ لەرەحمی قەبەركاندا سەرلەنوێ زیندووی بكاتەوەو بیهێنێتەوە بوون، خوایەك چۆن ئەتوانێ لە خواردنێكی مردووی ناو گەدە، وزەو زیندوێتی دروست بكات هەرواش ئەتوانێ لەناو گەدەی خاكدا سەرلەنوێ زیندوێتی بە ڕووەك بداتەوە... ئەو تۆمە ڕووەكە بە بارانی سروشتی زیندوو ئەبێتەوە، ئەم (تۆوەی مرۆڤیش) بە بارانێكی تری لینج كە حەدیس باسی دەكات سەرلەنوێ ئەڕوێتەوەو پاشان (گیان)ەكەشی بۆ ئەگەڕێتەوە.

بۆ دووەمیان: "بەرپەرچدانەوەی نكوڵی كەران)، خوای گەورە بۆ نموونە ئەفەرموێت:

ـ (**أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ * أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ) (الطور: ٣٥ ـ ٣٦)**. واتە: ئەبێت یان هەروا لە هیچەوە دروست بووبن و خولقێنەریان نەبێت، یان خۆیان خوڵقێنەری خۆیانن، یان ئاسمانەكانو زەوییان دروس كردبێ، نەخێر ئەمانە لە دوودڵیدا ئەژین..

زانایان ئەفەرموون: (أم) لە زمانی عەرەبیدا بە دوو شت تەقدیر و مانا ئەكرێ، بە (بل)و بە (همزەی استفهام)، واتە: وای لێ دی (أم خلقوا) ئەبێتە: بل أخلقوا؟ هەروەها ئەڵێن: (أم) مانای (**أضراب و أستفهام**)ی تێدایە، واتە: ئەو شتە نەوایەو نەئەبێ واش بێت (إبن قتيبە) ئەڵێت: "**بل تأتی لتدارك كلام غلطت فيه**".[2]... بەم پێیە مانای ئایەتەكە وای لێدێت: "ئەگەر ئەوان بڕوایان وایە كە بە بێ خوڵقێنەر دروست بوون، یان خۆیان خۆیانیان خوڵقاندووە، یان ئەوان زەویو ئاسمانەكانیان خوڵقاندووە، ئەوە ئەو شتە نەوایەو نەئەشێ واش بێت بە چەندان بەڵگە كە عەقڵ پشتیان ئەگرێت..

ـ شت لە خۆیەوە نایەت، هەموو دروستكراوێك ئەبێت دروستكەرێكی هەبێت.

ـ ئەم دوو خوڵقاوە (مرۆڤ)و ( زەویو ئاسمانەكان) ئەبێ (خوڵقێنەرەكەیان) كێ بێ ؟

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٩.

[2] تأويل مشكل القرآن، إبن قتيبة، ص٥٣٦.

ـ ئەگەر مرۆڤ ئەڵێ (خۆم) خولقێنەری خۆمم، یان دایكو باوكم خولقێنەری منن، ئەی كێ دایكو باوكی ئەوی خولقاندووە، و تائەگاتە یەكەم مرۆڤ، ئەو یەكەم مرۆڤە كی خولقاندویەتی (خۆی)، یان (جگە لە خۆی)؟

ـ ئەگەر خۆیەتی، ئەی بۆ هەزاران كاری خۆیی ئاگای لێ نییە، هەزاران كاری بەسەردا دێت حەزی لێی نییەو نایەوێتو ناشتوانێ رێگەیان لێ بگرێ، ئەو كەسە كێیە كە حوكم بەسەر ئەودا ئەدات، پێی ئەڵێ: بمرە، ناتوانێ نەمرێ، پێی ئەڵێ: پیر ببە، نەخۆش بكەوە، هەژار ببە، ئازار بدەرە فلانە شوێنی لە لەشیدا، دڵی، سەری ددانی، گورچیلەی... كەواتە ئەوە وانییە كە مرۆڤ خۆی خولقێنەری خۆی بێت، بەڵكو كەسێكی تر لە سەروو خۆیەوە خولقاندوویەتی كە خوای گەورەیەو حاكمە بەسەریەوەو فەرمانی (بوون)و (لەناوچوون)و (زیندووبونەوەی دووبارە) بەسەردا ئەكات.

ـ ئێ خۆ زەویو ئاسمانەكانیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە جگە لە مرۆڤ (خولقینەرە) خۆ مرۆڤ خولقێنەری زەویو ئاسمانەكان نییە، دەی هەر ئەو خولقێنەرە، هەمان كەسە كە مرۆڤیشی خولقاندووەو ئامانجی دروستكردنەكەشی دیاری كردووە.. لەم جۆرە ئایەتانە لە قورئاندا زۆر هەیە بۆ نموونە:

ـ (أَفِي اللّه شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ ).

ـ (أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُ صَاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) (الأنعام : ١٠١ ).

ـ (وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفاً كَثِيراً) (النساء : ٨٢ ).

ـ (وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ) (العنكبوت: ٤٨ )

بۆ سێیەمیشیان (مەحكومكردنی بەرانبەر بە قسەكانی خۆی) بۆ نموونە ئەفەرموێ:

ـ (قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاء بِهِ مُوسَى نُوراً وَهُدًى لِّلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيراً وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُواْ أَنتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ قُلِ اللّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ) (الأنعام: ٩١ )

ـ (أَفَعَيِينَا بِالْخَلْقِ الْأَوَّلِ بَلْ هُمْ فِي لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ) (قـ: ١٥ )

ـ (أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأسْبَاطَ كَانُواْ هُوداً أَوْ نَصَارَى قُلْ أَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللّهُ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَادَةً عِندَهُ مِنَ اللّهِ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ) (البقرة: ١٤٠)

- (يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِي إِبْرَاهِيمَ وَمَا أُنزِلَتِ التَّورَاةُ وَالإنجِيلُ إِلاَّ مِن بَعْدِهِ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ) (آل عمران: ٦٥).

- (أَفَرَأَيْتُم مَّا تُمْنُونَ * أَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ * نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ * عَلَى أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ * وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الْأُولَى فَلَوْلَا تَذكَّرُونَ) (الواقعة: ٥٧ـ ٦٢ ).

بۆ چوارەمیان (دانانی چەند بنەمایەك بۆ حیوار تا بەرانبەر خۆی نەدزێتەوە لە وەڵامەكان) بۆ نموونە خوای گەورە ئەفەرموێ:

- (قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ)

- (ائْتُونِي بِكِتَابٍ مِّن قَبْلِ هَذَا أَوْ أَثَارَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ) (الأحقاف: ٤ ).

- (فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ) (البقرة: ٢٢ ).

- (قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى مِثْلِهِ فَآمَنَ وَاسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ) (الأحقاف: ١٠ ).

لەم چەند ئایەتەو هاوشێوەكانییەوە ئەگەینە ئەوەی كە قورئان چەند بنەمایەك دائەنێت پێش ئەوەی دەست بە حیوار و مونازەرە بكرێت، لەوانە:

یەكەم: پێیوستە قسەی بێ بەڵگە وەرنەگیرێو بدرێتەوە بەسەر خاوەنەكەیدا .

دووەم: بەڵگەش سێ جۆرە، بەڵگەی ئاینی (قورئان یان ریوایات)[1]، بەڵگەی زانستی، بەڵگەی لۆژیكی،[2] قورئانیش بە زۆر شێواز ئەم سێ بەڵگەیە بەكاردێنێ بۆ حیوار كردن..

سێیەم: دانانی (حەكەم)ێك لە حیواردا بۆ ئەوەی كۆنترۆڵی حیوارەكە بكاتو هەق بدات بەوەی هەقیەتیو ئەوەش مەحكوم و ریسوا بكات كە ناهەقی ئەكاتو سواری سەری خۆی

---

[1] شێخولئیسلام "ئیبن تەیمیە" ئەفەرموێ: "أو أثارة من علم" یانی: "ریوایات" بهێنن كە زانیاری ئەدات بەدەستەوە، هەروەها ئەفەرموێت: سیفەتی مرۆڤی دووڕوو ئەوەیە كە رەتی بەڵگەكانی (كیتاب)و (سوننەت) ئەكاتەوە، ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێت: "وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُوداً) (النساء: ٦١).

[2] بۆ بەڵگەی لۆژیكی بۆ نموونە خوای گەورە ئەفەرموێت: (قُلْ أَرَأَيْتُكُم إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُ اللّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ السَّاعَةُ أَغَيْرَ اللّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ * بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِنْ شَاء وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ) (الأنعام: ٤٠ـ ٤١).

ئەبێت. لە زمانی قورئاندا بە (حكم)و بە (شاهد) زۆر جار ناو ئەبرێ (**حَكَماً مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِّنْ أَهْلِهَا**)، (**أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللّهِ آلِهَةً أُخْرَى**). ...

چوارەم: هەر شتێك پێچەوانەی (ئایینی راستەقینە ـ قورئانو حەدیس ـ بوو یان پێچەوانەی (زانستو لۆژیك) بوو، ئەهلی تەخەصوصو شایەتحاڵەكانیش رەتیان ئەكردەوە لە رووی (بەڵگەو سەلماندنەوە ـ **الحجة والاثبات**)ەوە، ئەوە پێویستە فڕێ بدرێ و وازی لێ بهێنرێ..

ئەگەر سەیری قورئان بكەین نموونەی زۆر ئەبینی لە قورئاندا ئەم بنەمانەی رەچاو كردووە، بۆ نمونە ئەو ئایەتانەی كە باسمانكردنو ئەم بنەمانەمان لێیان وەرگرت، هەروەها بۆ ئەم نموونانەی تریش بڕوانن.. خوای گەورە ئەفەرموێ:

ـ (**أَفَغَيْرَ اللّهِ أَبْتَغِي حَكَماً وَهُوَ الَّذِي أَنَزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلاً وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ**) (الأنعام: ١١٤).

ـ (**قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادةً قُلِ اللّهِ شَهِيدٌ بِيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللّهِ آلِهَةً أُخْرَى قُل لاَّ أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَـهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ**) (الأنعام: ١٩)

(**الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمُ الَّذِينَ خَسِرُواْ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ**) (الأنعام: ٢٠).

ـ (**فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ**) (النحل: ٤٣).

ـ (**وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ * ثَانِيَ عِطْفِهِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ لَهُ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَنُذِيقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَذَابَ الْحَرِيقِ**) (الحج: ٨ ـ ٩).

بۆ پێنجەم مەبەست لە مەبەستەكانی حیوار لە قورئاندا كە بریتییە لە (حیوار ئەبێت ئەنجامی هەبێت) بۆ نموونە قورئان ئەفەرموێت:

ـ (**إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ * الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلاَ تَكُن مِّن الْمُمْتَرِينَ * فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَاءنَا وَأَبْنَاءكُمْ وَنِسَاءنَا وَنِسَاءكُمْ وَأَنفُسَنَا وأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَةَ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ**) (آل عمران: ٥٩ـ ٦١) .

ـ (قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) (آل عمران: ٦٤).

ـ (فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) (آل عمران: ٦٤).

ئەمەش بۆ ئەوەیە کە (حیوار) نەبێتە مەبەست و ئامانج، بەڵکو ئەبێ هۆکارێك بێت بۆ مەبەستێك نە(حیوار) ببێتە مەبەست و (حوار من أجل الحوار) بێت و نە (حیوار)یش ببێتە گاڵتەجاڕی و سوعبەت کردن بە یەکتریو کابرا تەواو ماندووت بکاتو پاشان وەك بەرزەکی بانان بۆی دەربچێتو تیر پێ بکەنێ پێت.[1]

بۆیە قورئان بۆ نموونە ئەو سێ ڕێگەیەی داناوە بۆ ئەنجامی گفتوگۆ ئەگەر هەردوولا نەهاتنە سەریەك رای دیاریکراو.

١ـ یان لەسەر یەك (فیکر)ەش بێتو رێبکەون (على كلمة سواء بيننا وبينكم).

٢ـ یان (موباهەلە) رووبداتو درۆزن روورەش و ریسوا بکەن (ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَةَ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ). (آل عمران: ٦١).

٣ـ یان ئەوان شایەتی بدەن بۆ بەرانبەر کە ئەو هەقیەتی و ناهەقی ناکات (اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ)!

## ئیعجازی قورئان (إعجاز القرآن)

ئەم بابەتە یەکێکە لە بابەتە فراوانو چڕەکانی قورئانو زانایان لە کۆنو ئێستادا زۆریان لەسەر نووسیوەو ئێمەش لە باسی سێیەمدا بە درێژی باسی لێدەکەین..

[1] برادەرێك بۆی گێڕامەوە کوڕێکی مولحید رۆژێکیان داوای لێ ئەکات باسی بوونی خوای بۆ بکات، ئەویش پێی ئەڵێ: باشە ئەگەر من بۆم سەلماندی کە خوا هەیە وەك چۆن ئەو جگەرەی دەستت هەیە تۆ ئەیسەلمێنیو تەسلیم بە دین ئەبێ؟ وتی: جا تۆ هەقت چییە بە منەوە من تەسلیم بە دین ئەبم یان نا، وتم: ئەی ئیتر موناقەشە بۆچی بکەین؟ وتی: حەز ئەکەم بزانم خوا هەیە یان نا! وتم: باشە من بۆت ئەسەلمێنم تۆش بە گوێی بکە، ئەگەر واش ناکەی قەبووڵ بکە من "دە" شەقت تێ هەڵئەدەم بە دیارچاوی خەڵکەوە! کوڕەکە پێکەنیو سەیری لێ هات؟؟ وتم: ئێ خۆ من نایەم یەك سەعات تۆ بهێنیو ببەی و پاشان تیر پێ بکەنی پێمو بڕۆی بەبێ هیچ!..

# باسی سێیەم: ئیعجازەکانی قورئان

قورئان موعجیزەی حەزرەتی موحەممەدە (صلی الله علیه وآله وسلم)، بۆیەش پێی ئەوترێت "موعجیزە"، چونکە کەس ناتوانێ وەك قورئان بڵێت، زۆرکەسی بێبڕوا هەوڵی دا لە کۆنو لە تازەشدا کە وەك قورئان بڵێ، بۆی نەکرا، چ لە گەورە نووسەرانو ئەدیبان، چ لە گەورە بەرپرسانو نکولیکەرەکان، هەندێ لەوانە ژێر بوون پێش ئەوەی کە ئابڕوویان بچێتو هەر لەسەر ئەزموونی بێئەنجام بەردەوام بن، خامەکەیان شکاندوو پەرەکانی بەردەستیان دڕیو ملیان کەچ کردبۆ گەورەییو ئیعجازی ئەم قورئانە وەك (ئیبنولموقەفەع)و (ئەبی ئەعلای مەعەڕڕی).[1]... هەشبووە ئابڕووی خۆی بردو خۆی کردە پەندی زەمانەو جێگەی پێکەنینی خەڵکی وەك: (موسەیلەمەو سەججاح) و هەشبوو ئەو هەوڵە نەزۆکانەی شاردەوەو زانی کە کەس نییە بڕوای پێ بکات وەك (کتێبەکانی تاقمی قادیانیو بەهائییەکان)، کە دەستوورێکی پینەو پەڕۆکراویان لە ئایەتو حیکمەتی خەڵك و قسەی ئەمو ئەو دانا، بەو حسابەی بیخەنە جێی قورئان.

بەڵام هەموو ئەوانە ڕۆشتن و قورئان هەرما، چونکە قورئان موعجیزەیەو تا قیامەت کەس ناتوانێت وەك ئەو بڵێ و خواش ڕاست ئەفەرموێ: **(وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ) (فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ) (البقرة : ٢٣ـ ٢٤).**

قورئان لە چەند ڕووەوە (موعجیزەیە) وەك زانایان باسی ئەکەن، زانایان باسی زیاد لە (١٠) لایەنی ئیعجازی قورئان ئەکەن، بەڵام ئێمە تەنیا (پێنج ڕووی ئیعجازی قورئان) باس ئەکەین ئەویش بە کورتی، چونکە لە بنەرەتدا ئەم کتێبە بۆ ئەوە نییە کە باس لە موعجیزەی قورئان بە تەنیا بکات...

١ـ ئیعجازی زمانەوانی.

٢ـ ئیعجازی تەشریعی.

---

[1] محمد عبدالله دراز ئەڵێ: من قەناعەتم وایە ئەو جۆرە پیاوانە تەنیا بۆ دڵنیایی زیاتری خۆیان وەك ئەڵێن (لیطمئن قلبي) ئەو کارەیان کردبێ نەك لە بێدینییان دا ئەو هەوڵەیان دابێ. (ص٨٢) النبأ العظيم.

٣ـ ئیعجازی بونیەوی.

٤ـ ئیعجازی ژمارەیی.

٥ـ ئیعجازی زانستی.

## ١. ئیعجازی زامانەوانی

زۆر کەس کە باسی ئیعجازی قورئانی بۆ ئەکەی خێرا زەینی بۆ ئەم لایەنە ئەڕواتو چونکە بڕوای وایە کەس ناتوانێ لە ئاستی رەوانبێژی قورئاندا سورەتێك، یان چەند سورەتێك بڵێت، چونکە قورئان لە هەر روویەکی زمانەوانییەوە لێی وردئەبیتەوە جۆرێك سەرسامی پێوە ئەبینی.

ـ لە رووی مۆسیقای وشەو سیستمی فۆنەتیکی ئایەتەکانەوە سەیری ئەکەی.

ـ لە رووی جوانی وێنەو سێبەری ماناکانیەوە سەیری ئەکەی.

ـ لە رووی مانای زۆری ناو (وشە کەمەکان)یەوە سەیری ئەکەی.

ـ لە رووی وردەکاری پیتی وشەکانو ریزبەندی وشەی ناو رستەکانو هاتنی بەمەبەستو وردی رستەکان لەناو چەمکێکی دیاری کراودا لێی وردئەبیتەوە. (پیت لە وشەدا و وشە لە رستەدا و رستە لە چەمکدا).

ـ لە رووی ئەوەوە وردئەبیتەوە کە بەشی عەقڵو بەشی دڵو بەشی دەروون پێکەوە ئەداتو تێریان ئەکات و ئەمیان لەسەر حسابی ئەویان بێبەش ناکات.

لە هەر یەکێك لەم لایەنانەوە وردئەبیتەوە قورئان ـ موعجیزیەکەو سەری مرۆڤ سوڕ ئەمێنێ.. بۆ ئەوەی لەم لایەنی رەوانبێژیو زمانەوانی قورئانە بگەی، لێبگەڕێ با قورئان خوێنێکی شارەزا و دەنگخۆش هەندێ قورئانت بۆ بخوێنێو جا گوێ بگرە بۆ مۆسیقای وشەکانو دڵ بدە بە ماناو مەبەستەکانی ئەو ئایەتانە تا بۆت دەربکەوێ ئەم قورئانە لە چ لوتکەیەکدایەو چۆن بە (سیحری) وشەکانی دڵت کەمەندکێش ئەکاتو مووی لەشت گرژ ئەکاتو پاشان دڵت نەرم ئەکاتو جۆرێك لە عیشقو خۆشەویستی لە (رۆحتا) دروست ئەکات.. تاقیبکەرەوە ئەیبینی!

مەحوی شاعیر ئەفەرموێ:

تێدەگا هەرکەس بکا فەهمی رموزی مەعنەوی

"هەجر" و "وەصڵە"، "نار"و "جنە"ی ئایەتی (لایستوی).[1]

ـ چەند کەس کاتی خۆی مۆسیقای وشەکانی قورئان کەمەندکێشی کردوو موسڵمانێتی خۆی راگەیاند.

ـ چەند کەس لەم سەردەمەتازانەشدا سیحری جوانی وشەو ئایەتەکان و وردی ماناو مەبەستەکانی ئەم قورئانە دەستی راکێشاو ئیمانی پێ هێنا بەم قورئانە. بۆ نموونە لەسەر رەوانبێژی قورئان (سەیری بەشی یەکەم، باسی یەکەم، پێناسەی قورئان بکە).

## ٢. ئیعجازی تەشریعی

هەندێ وا ئەزانن قورئان هەندێ تەشریعاتی داناوە مرۆڤ زۆر دوای سەردەمی قورئان لە فەلسەفەو وردەکارییەکانی گەیشتووە ئەوانە ناو ئەنێت "ئیعجازی تەشریعی"، هەندێ تر وا ئەزانن ئیعجازی تەشریعی قورئان ئەوەیە کە هەندێ شتی حەرام کردووە، خەڵکی دوای سەردەمی قورئان ئەوجا بۆی دەرکەوتووە هۆی چییە ئەو شتە حەرام کراوە، هەشە وا لە ئیعجازی تەشریعی گەیشتووە کە قورئان پێش هەموو خەڵکانی تری عاقڵ ئاماژەی بۆ بنەماو رێساکانی شەریعەت‌و دەستووری ژیان کردوەو زۆر وردەکاریشە لەو ئاماژانەدا.

بەڵام لە راستیدا ئیعجازی تەشریعی قورئان ئەوانە نین بە تەنیاو بەڵکو برتیین لە:

أ ـ هەمەلایەنی قورئان لە تەشریعدا بۆ ژیان.

ب ـ دانانی بنەماکانی دەستوور و یاساکان بۆ کۆمەڵگە.

ج ـ فەلسەفەی ورد لە هەریەك لەو یاسایانەدا... با بە نموونە ئەمە بسەلمێنین:

---

[1] دیوانی مەحوی، مامۆستا عەبدولکەریمی موردەریس، واتە: "هەرکەس لە جفرە و رەمز تێبگات لەوە تێ ئەگات کە ئایەتی: "لایستوی أصحاب النار وأصحاب الجنە) واتە: خەڵکی بەهەشت‌و خەلکی جەهەننم وەکو یەك نین مەبەستی (بەهەشت) ئەو حاڵەتەیە کە رۆح تێیدا پەیوەست ئەبێت بە خواوە، و مەبەستیش بە (ئاگر) ئەو حاڵەتەیە کە رۆح تێیدا دوورئەکەوێتەوە لە خواو ئەبچڕێ لێی.

**أ. تەشریعی هەمەلایەنە**

قورئان شەریعەتێکی هەمەلایەنەی داناوە بۆ هەموو ژیانو شتێك نییە لە ژیاندا ئەم قورئانە باسی لێوە نەکردبێت.

* بنەماکانی عەقیدەو بیروباوەڕو رەوشتی زۆربەرودیو بە رۆشنی باس کردووە بە بەڵگەوە هەریەکەیانی سەلماندووە، چ باسی "ئیلاهیات" بێت، یان "نبوات" بێت، یان باسی "رۆحانیات" بێت، یان باسی "سەمعیات" بێت.[1]

* تەشریع بۆ پیاو دائەنێت و تەشریع بۆ ژن دائەنێت و تەشریع بۆ منداڵ دائەنێتو تەشریع بۆ هەمووشیان لەناو خێزاندا دائەنێتو خێزانەکە کۆنترۆڵ ئەکاتەوە بە یاسا، بۆ نموونە:

- ئەفەرموێ: (**الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء**). (پیاو بەڕێوەبەرە لەناو خێزاندا).

- ئەفەرموێ: (**فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ**). (ژنی چاك دەستپاكو گوێڕایەڵە).

- ئەفەرموێ: (**لِّلرِّجَالِ نَصيِبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ**). (ژنو پیاو پشکیان لە میراتدا هەیە).

- ئەفەرموێ: (**وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً**). (دایكو باوك ئەبێ چاکەی بەرامبەر بکرێ).

- ئەفەرموێ: (**الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ**). (تەڵاقدان دوو قۆناغەو پاش ئەوە یان بە چاکی پێکەوە ئەبن، یان بە چاکی لەیەکتر جیا ئەبنەوە).

- ئەفەرموێ: (**وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ**). (ژن بەقەدەر ئەرکەکانی مافی هەیە).

* تەشریع بۆ پەیوەندی مرۆڤو مرۆڤو بۆ پەیوەندی مرۆڤو گیانەوەرانو بۆ پەیوەندی مرۆڤو بوونەوەر دادەنێت:

- ئەفەرموێ: (**وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْناً**).

- ئەفەرموێ: (**وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا**).

- ئەفەرموێ: (**هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ**) (البقرة : ٢٩ ).

---

[1] لە پێشەوە باسێکی ئەم چوار بابەتەمان کردووە.

* که تەشریع بۆ مرۆڤ داوەنێ بۆ هەموو لایەنەکانی بونیادی دایئەنێت، بۆ پاککردنەوەی دەروونی، بۆ پاراستنی ژیری، بۆ گەشەکردنی دڵو دەروونو لەشو لاری، فێری خوێندەواری ئەکاتو فێری بیرکردنەوەی ئەکاتو فێری دەمپاکیو دڵپاکیو دەستپاکیو داوێن پاکی ئەکات:

ـ ئەفەرموێ: (قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا * وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا) .

ـ ئەفەرموێ: (فَمَا لِهَـؤُلاء الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثاً) (النساء : ٧٨ ).

ـ ئەفەرموێ: (فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ). هەروەها: (قُلِ انظُرُواْ مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لاَّ يُؤْمِنُونَ) (يونس: ١٠١ ).

ـ ئەفەرموێ: (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ) (العلق: ١). هەروەها: (ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ) (القلم: ١).

### ب . بنەماکانی دەستوورو یاساکانی کۆمەڵگە

راستە قورئان کتێبێکی تەشریعی تەنیا نییە و هەموو هەر یاساو رێسا بێت، بەڵام هەموو بوارەکانی دەستوریشی دیاری کردووە و بنەمای سیستەمە جۆربەجۆرەکانی داناوە.

وەك بنەماکانی (سیستمی حوکمڕانی) و (سیستمی بواری ئابوری) و (سیستمی راگەیاندن) و (سیستمی خوێندن) و (سیستمی سزاکان) و (سیستمی سەربازی) و (سیستمی دادگوستەری) و (سیستمی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان) و (سیستمی کۆمەڵگەی مەدەنی) و ... هەروەها، بۆ نموونە دەربارەی بنەماکانی (سیستمی سیاسی):

ـ ئەفەرموێ: (وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ). ئاماژەیە بۆ سەرچاوەکانی تەشریع لە دەوڵەتدا.

ـ ئەفەرموێ: (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ). ئاماژەیە بۆ جۆری حوکمو چۆنێتی دامەزراندنی دەزگا تەشریعیو تەنفیزییەکان.

ـ ئەفەرموێ: (وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم). ئاماژەیە بۆ مەبەستو ئامانجەکانی حەکمڕانی کە بەرقەرارکردنی دادو یەکسانییە.

ـ ئەفەرموێ: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلاَتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) (التوبة: ١٠٣ ). ئاماژەیە بۆ چۆنێتی دابەشکردنی سەروەتو سامان لە نێوان خەڵکدا.

ـ ئەفەرموێ: (**وَلاَ يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلاَ شَهِيدٌ**) (البقرە: ٢٨٢ ). ئاماژەیە بۆ ئازادی نووسینو شایەتیدان لەسەر مافەکانی خەڵکی، عەبدولڕەحمانی کەواکیبی لە کتێبی (**طبائع الاستبداد ومصارع الاستبعاد**)دا ئەڵێ: ئەم ئایەتە شیعاری ئازادی ڕۆژنامەگەرییە لە ئیسلامدا.

کەواتە سیستمی حوکم لە ئیسلامدا لەسەر ئەم بنەمایانە ئەوەستێ:

١ـ خوا حاکمو بڕیاردەرەو ڕاگری بەرژەوەندییەکانی مرۆڤەکانە.

٢ـ ئیسلام سەرچاوەی تەشریعەو هەر یاسایەك پێچەوانەی دەستووری ئیسلام بێت خۆی لە خۆیەوە (ئۆتۆماتیکی) هەڵدەوەشێتەوە.

٣ـ کارەسیاسییەکە بە (تەشریعیو تەنفیزییەوە) ئەبێت بەراوێژو ڕاگۆڕینەوە بڕێت بەرێوەو "تاکڕەویو دیکتاتۆریەت" نەیەتە ناو پرۆسەکەوە.

٤ـ ئەبێت داد بەرقەرار بکرێتو کەس مافی نەخورێت، ئەو کەسە هەرکێ و لەهەرکوێ بێت.

٥ـ ئازادی ڕادەربڕین پارێزراو بێت مەگەر ئەو ڕاو بۆچوونانە نەبێت کە دژایەتی نەگۆڕەکانی شەریعەت بکات، یان دژایەتی یاسای گشتی دەوڵەت بکات وەك (سەرپێچی یاساکان، سەرپێچی هاتوچۆ، ترسناکی دروستکردن لەسەر ئەمنی میللیی یان نیشتمانی.. هتد".

دوای ئەمانە "عەقڵەکان"و "ئەزموونە بەشەرییەکان" ئەرکی ئەوەیان ئەخرێتە سەر کە ئالیەتی گونجاو بۆ ئەو بنەما گشتییانە بدۆزنەوە..

واتە: ئالیەتی گونجاو بدۆزنەوە بۆ "پاراستنی ئازادی ڕادەبڕین، یان بەرقەرارکردنی دادو یەکسانی، یان دۆزینەوەی شێوازی ڕاگۆڕینەوەو بڕیاردانی بە کۆمەڵو .. هەروەها، دەربارەی بنەما گشتییەکانی ئابوروی ئەفەرموێ:

ـ ئەفەرموێت: (**كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ**). ئاماژەیە بۆ ئەوەی سەروەتو سامان تەنیا لە دەستی دەوڵەمەندەکاندا نەبێت، بەڵکو ئەبێت (موداوەلە) دەستبەدەست بکات، تا لەلایەك چینایەتی دروست نەبێتو لەلایەکیش کەس ئەوی تر نەچەوسێنێتەوەو ئیستغلالی هەژاریو کەمدەستییەکەی بکات.

ـ ئەفەرموێت: (**وَلاَ تُؤْتُواْ السُّفَهَاء أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللّهُ لَكُمْ قِيَاماً وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا وَاكْسُوهُمْ وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلاً مَّعْرُوفاً**) (النساء: ٥). ئاماژەیە بۆ ئەوەی ماڵ پێویستە بە دەستی کەسی ژیرو خاوەن ڕوشدەوە بێتو لە خێری خۆیو خەڵکیدا بەکاری بهێنێ.

- ئەفەرموێ: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلاَتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) (التوبة: ١٠٣). ئاماژەیە بۆ ئیشکردن بە سیستمی زەکات وەرگرتن، وەرگرتنی ئەو بڕە پارەی پێویستەی باری سەرشانی هەژارانی پێ سووك ئەکرێت... و هەروەها.

پاش ئەم بنەما گشتییانە ئیتر نۆبەتی (عەقڵو ئەزموونی) مرۆڤەکانە بێن ئالیەتی گونجاو بۆ بەگەڕخستنی ئەم پرۆسە ئابووریە بدۆزنەوە. واتە: دانانی وەزارەتو بەرێوەبەرایەتیو لیژنەی تایبەت بۆ وەرگرتنی زەکاتو دیارکردنی بڕەکانی لە وڵاتو شارو کۆمپانیاو دەزگاکاندا و دابەشکردنەوەی بەسەر خاوەن مافەکاندا.[١]

یان دۆزینەوەی ئالیەت بۆ رێکخستنی و خستنەمکاری سەروەتو سامانی بێباوکانو پارەی کەڵەکەبووی زەکات، یان خەزێنەی دەوڵەت... وە هەروەها.

بۆ بڕگەکانی تریش بە هەمان شێوە، قورئان بنەما گشتییەکانی دائەنێ و پاشان درێژەو جێبەجێ کردنەکانی ئەداتە دەست عەقڵی عاقڵانو شارەزایی پسپۆڕان هەریەکەو لە بواری خۆیدا و ئەفەرموێ: (**فاسئل به خبيرا**)، یان (**ولا ينبؤك مثل خبير**)....

### ج. فەلسەفەکانی یاسا ئیسلامییەکان

وتمان ئیعجازی قورئان لەوەدایە کە لە بواری تەشریعدا کاری موعجیزە ئەکاتو دێت (تەشریعێکی هەمەلایەنە)و (کوللیاتی پرسە گەورەکان) دائەنێتو مرۆڤەکانیش لە فەلسەفەی هەندێ لەو تەشریعاتە ئاگادار ئەکات.. بە نمونە ئەمە بڵێین:

- خوای گەورە ئەفەرموێ: (**وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاْ أُولِيْ الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ**) (**البقرة : ١٧٩** ). لە قیصاصو تۆڵەسەندنەوەدا ژیان دەستی خەڵك ئەکەوێت ئەی خاوەن جەوهەرەکان. کەواتە هۆی فەرزکردنی "قیصاص" پەرژینکردنی ژیانی خەڵکییە وەك ئەڵێن: "شەڕ لە پێناو ئاشتییدایە".

- پرۆسەی زەکات وەرگرتن لە ئیسلامدا پرۆسەیەکی حکومی و دەوڵەتییە، نەك پرۆسەیەکی شەخصیو تاکە کەسی بێت، فەلسەفەکەشی ئەوەیە کە ئامانجو مەبەست لە

---

[1] لە کتێبی: "دەوڵەتی خیلافەت بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت"دا بە درێژی و لە بیست خاڵدا باسی ئەم بابەتەمان کردووە وەك (بنەما)و وەك (ئالیەت)یش.

وەرگرتنی و دابەشکردنی زەکات ئەوەیە هەژاری بنەبڕ بکرێت لە ناو خەڵکیدا، یان وابکرێت هەژارو دەوڵەمەند لە یەکتری نزیك بکرێنەوە و جیاوازییەکە زۆر نەبێت‌و یاسای چینایەتی دروست ببێت‌و ئەم ئەو بخوات‌و بیکاتە مەسخەرەی دەستی خۆی.

ـ دەستبڕین کراوە بە سزای دزی کردن، نەك "زیندانی"، یان "غەرامەی ماڵی"، یان هەر جۆرە "تەعزیر"ێکی تر، فەلسەفەکەشی ئەوەیە بەبڕینی دەستی چەند کەسێکی دەستپیس لەناو کۆمەڵگەدا کە دەستیان خێر بۆ کۆمەڵگە ناداتەوە، هەموو خەڵکی تری دەستپیس تەمێخوارد ئەبیو ئەسڵەمێتەوە لە دزیکردن‌و ترساندن‌و تۆقاندنی خەڵکی بێوەی‌و کاسبکار، بەڵام ئەگەر وانەکریێ، بۆ نموونە سزای دزیکردن بریتی بێت لە "غەرامەی ماڵی"، یان "زیندانی"، یان "ئیعدام کردن"، ئەوە دزیکردنەکە وەك خۆی ئەمێنێتەوە، بەڵکو لەوانەیە زیادیش بکات وەك "چەندێتی" وەك "چۆنێتی"یش، چۆن؟ وا دائەنێین لە شارێکدا چەند کەسێك لە سەر دزیکردن ئەگیرێن‌و ئەخرێنە زیندانی‌و حوکمی چەند ساڵ زیندانی بۆ هەر یەکەیان دەرئەکرێت، ئەم زیندانییانەش لە زینداندا چی ئەکەن، خۆ دیارە لەزگە لە دەمیان نادرێت، بەڵکو دەست بە قسەکردن‌و راگۆڕینەوە ئەکەن لە زیندانەکەدا و دیارە یەکەم پرسیارو حیواریش کە روو ئەدات لە نێوانیاندا شتێکی لەم شێوەیە ئەبێت:

دزێك: لەسەرچی گیراوی ئەفەنی؟

دزێکی تر: لەسەر دزی.

دزەکە: چیت دزیوە؟

دزەکەی تر: ماڵی فلان کەس.

دزەکە: چۆن‌و چەندت دزیوە؟

دزەکەی تر: درێژەی دزی کردنەکەی‌و شێوازی ماڵدزینەکەو چۆنێتی گرتنەکەی‌و خاڵە بێهێزەکانی خۆی بە خەیاڵ راحەتی باس ئەکات....

دیارە حیوارەکە پێچەوانە ئەبێتەوەو ئەمی تریان دەست بە پرسیارکردن لەوی تریان ئەکات‌و دەست ئەکەنە حیوارو موناقەشەو راگۆڕینەوە لەسەر شێوازەکانی دزی کردن‌و رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ یاساو بەرنامەکانی راوەدووناندا...

ئەوکاتە زیندانەکە ئەبێتە خێوەتگەیەك‌و چەندان شێوازی دزیکردن تاوتوێ ئەکرێت‌و وەك خولێکی زانستی لێدێت‌و هەریەکەیان پاش ئەوە، نەك شێوازێك، بەڵکو چەندین شێوازی دزیکردن فێر ئەبێت‌و لەوەو دوا بەرئەبێتە گیانی کۆمەڵگەو باری ئەمنی خەڵکی (بێگوناه)

ئەخەنە مەترسییەوە.. بەڵام خوای گەورە ئەفەرموێت: (**وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ**) (**المائدة : ٣٨** ). هەرکەس لە پیاوو ژن دزیکرد خێرا دەستیان ببڕن، وەك پاداشتێك بۆ ئەو کردەوەی کە کردوویانەو وەك سزایەکیش کە لە خواوە بۆیان بڕاوەتەوە، خواش بە دەسەڵاتەو لە رووی دانایيشەوە ئەم بڕیارەی داوە...

زانایان ئەفەرموون دەستەکان بە گشتی چوار جۆرن:

- **يد عاملة، الاسلام يكرمها.**
- **يد عاجزة، الاسلام يطعمها.**
- **يد عاطلة، الاسلام يشغلها.**
- **يد عابثة، الاسلام يقطعها** [1]

بۆ هەموو یاساکانی ئیسلام ئەکرێ بووترێت لەسەر بناغەی فەلسەفەیەکی ورد دانراون، هەرچەندە هەندێ لە زانایان جیاوازی لە نێوان دوو جۆر یاسادا ئەکەن: ئەو یاسایانەی کە پێیان ئەوترێ (أوامر)و ئەو یاسایانەی پێیان ئەوترێت (نواهی)، ئەو زانایانە ئەڵێن: "هەموو "نهی"یەك لەسەر هۆو فەلسەفەیەك راوەستاوە، بەڵام "أمر" وانییە، واتە: خوای گەورە کە ئەفەرموێت: "نوێژ" بکەن، مەرج نییە فەلسەفەیەك لەپشت ئەم "أمر"ەوە بێت، بەڵام کە ئەفەرموێت: "عارەق مەخۆنەوە"، یان "زینا مەکەن"، یان "گۆشتی بەراز مەخۆن"، یان "سیخوڕی مەکەن"... هتد، ئەوە بێگومان هۆو فەلسەفەی گەورە لە پشت هەریەك لەو "نهی"یانەوە هەیە، ئیتر ئەوە خوایگەورە باسی کردبن یان باسی نەکردبن، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە چ (أمر)و چ (نەهی) بە بێ هۆو بەبێ فەلسەفەیەکی ورد لە خوای گەورەوە دانابەزنە سەر عەبدەکانی.

- مەگەر خوا نافەرموێ: (**وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ**). نوێژ بکەن، چونکە نوێژ ئەبێتە قەڵغان بۆتان لە خراپەو خراپەکاری.

- یان ئەفەرموێ: (**خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلاَتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ**) (**التوبة: ١٠٣**). زەکاتیان لێوەربگرە بۆ ئەوەی پاك ببنەوەو روشدو گەشەی زیاتر بکەن.. هتد.

---

[1] سەیری کتێبی "المال فی الاسلام) محمود غریب بکە بۆ درێژەی ئەم باسو خواستە.

دەی خۆ ئەوانە هەموو (أمر)ن‌و ئەوەتا فەلسەفەکانیشیان باس ئەکات، نوێژ بۆ ئەوەی قەڵغانەو رۆژوو لەبەرئەوەی فابریکەی تەقوایەو زەکات لەبەرئەوەی گەشەو پاکێتی ئەدات بە ماڵ‌و بەزەکاتدەرەکەش.

## ٣. ئیعجازی بونیەوی

(ئەم لایەنە ئیعجازیەی قورئان زۆر کەس لە زانایان هەوڵی دۆزینەوەو باس لێوەکردنیان داوە، بەڵام کەمێکیان تێیدا سەرکەوتوو بوون، لەو کەمەش چەند پرسێکی کەمیان لێ دۆزیوەتەوە، ئیتر ئەوانی تریان دەستەوسانی خۆیان راگەیاندووەو خۆیان لەباسەکە نەداوە لە دوورەوە نەبێت).[1]

ئیمام فەخرەدینی رازی (زانای سەدەی شەشەمی کۆچی) ئەڵێت: **"من تأمل لطائف نظم السور، وبديع ترتيبها علم أن القرآن كما أنه معجز بحسب فصاحة ألفاظه وشرف معانيه، فهو أيضا معجز بسبب ترتيبه ونظم آياته.."** هەروەها ئەڵێ: **".. أكثر لطائف القرآن مودعة في الترتيبات والروابط"**.[2]

زەرکەشیش دەربارەی هۆنینەوەی قورئان ئەفەرموێ: "حاڵی وەك حاڵی خانوویەك وایە کە هەمووی لەسەر یەك خشت خشت دانراون‌و هەموو گونجاون لەگەڵ یەکتردا".[3]

**قاضي** ئەبوبەکر کوڕی (العربی) یش کە لە زانایانی سەدەی پێنجەمی کۆچییە ئەڵێت: **"ارتباط آي القرآن بعضها ببعض حتى تكون كالكلمة الواحدة منسقة المعاني، منتظمة المباني علم عظيم"**.[4]

ئیمامی **سیوطی** کتێبێکی تایبەتی لەم باسەدا بەناوی **(تناسق الدرر في تناسب السور)**[5]و (بورهان الدين) ی بوقاعی بە هەمان شێوە لەم بابەتەدا کتێبێکی هەیە بە ناوی **(نظم الدرر في بيان تناسب الآيات والسور)**.[1]

---

1 دراسات قرآنية (الجمع بين القراءتين)، طه جابر العلواني، ص٤١.

2 الوحدة البنائية، العلواني، ص٢٥. والجمع بين القراءتين ، ص٤٢.

3 مباحث في علوم القرآن، مناع القطان، ص٩٢.

4 الوحدة البنائية، ص٢٥. والجمع بين القراءتين ، ص٤١٤٢ .

5 دەوڵەتی خیلافەت، اکرام کریم، ل٣٥٥.

تەنانەت هەندێك لە زانایان لەوانە (**سیوطي**)و (حەسەنی بەصری)و (سەعید حوّی)و (فەخرەدینی رازی)... بڕوایان وایە کە هەموو حیکمەتو جوانییەکان لە دینەکاندا کۆکراونەتەوەو هەموو دینەکانیش لە قورئاندا کۆکراونەتەوەو هەموو قورئانیش لە سورەتی "الفاتحه"دا کۆکراوەتەوە..

(فەخرەدینی رازی) ئەڵێ: "مەبەستی هەموو قورئان ئەوەیە کە چوار پرس هەیە ڕۆشنی بکاتەوە بۆ خەڵکی: "ئیلاهیات"، "زیندووبونەوە"، "پێغەمبەرایەتی"، "کارو فەرمانی خوا، واتە: قەزاو قەدەر"، دەی "الحمد لله رب العالمين" باسی ئیلاهیاتەکەیە، "مالك يوم الدين" باسی زیندووبوونەوەکەیە، "إياك نعبدو وإياك نستعين" باسی قەزاو قەدەرەیەکە، جەبرییەت هەڵدەوەشێنێتەوە، "**اهدنا الصراط المستقيم**"و تا کۆتایی سورەتەکە باسی پێغەمبەرایەتی و کاری خوایە لەگەڵیان.... بەو شێوەیە سورەتی (الفاتحه) هەر چوار مەبەستەکەی قورئانی گرتۆتە خۆی".[٢]

ئەم "ئیعجازی بونیەویە" لە قورئاندا پرسێکی زۆر گەورەیەو تەنیا و بە تەنیا هەر خوا ئەتوانێ شتی وا بکات... با بە نموونە ئەم بابەتە ڕۆشن بکەینەوە:

وەك لای هەمو موسڵمانێ زانراوە کە قورئان لە ماوەی (بیستو سێ ساڵ) دا هاتوەتە خوارەوەو هەر جارەی ئایەتێك، یان سورەتێك، یان چەند ئایەتێك هاتوەتە خوارەوەو پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) بە نووسەرانی (وەحی) فەرمووە ئەم ئایەتە لە فلان شوێنو فلان سورەتدا دابنێو جێگەکەی ئەوێیە، لەوکاتەدا بەو سەربەخۆییە ئەرکی تەشریعی و ئایینی خۆی ئەنجامداوە، کەچی ئێستاش هاوڕێ لەگەڵ ئایەتەکانی ترداو هەموو پێکەوە ئەرکێکی تر ئەنجام ئەدەن بێئەوەی ئەرکە سەرەکییەکەی خۆی لە دەست دابێت، وەك چۆن (تەشبیهات نەبێت) ئامێرێکی تەسجیل لە کۆمەڵێکی زۆر (دیشلی) دروست دەبێت، کە هەریەکەیان بە تەنیا ئەسوڕێتەوە بەشێوەیەك گونجاوە لەگەڵ قەبارەو جۆری ددانەکانیداو ئەرکێك ئەنجام دەدات، لەهەمان کاتدا لەگەڵ (دیشلی)یەکانی تریشدا یەکتری ئەسوڕێننەوەو ئەرکێکی یەکگرتووی تر ئەنجام ئەدەن کە تۆمارکردنی دەنگو دانەوەی دەنگە. ئایەتەکانی قورئانیش هەروایە، بۆ نموونە سەیری ئەم ئایەتە بکە کە ئەفەمروێ: (**وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ**

---

[1] الجمع بين القراءتين ، ص٤٢.

[2] تفسير الجلالين، ص٣٨٧.

بِالْمَعْرُوفِ). ئافرەتان چەند ئەركیان لەسەرە بەو ئەندازەیەش مافیان بۆ هەیە بە چاكی و بە مەعلومی.[1] بە چوار وشە، یەك رستەی پڕ "ڕەوانبێژی" و پڕ "فەلسەفە"ی دروستكردووە و ئەتوانی بیكەیتە ناونیشانی كتێبێكی سەربەخۆو سەدان لاپەڕەی لەسەر بنووسیو دیدی قورئان بۆ ئافرەت ڕۆشن بكەیتەوەو دەریبخەیت ئافرەت لە دیدی قورئاندا چییە، ئەركی چییە، مافی چییە، چۆن هاوسەنگی لە نێوان ئەركو مافەكانیدا درووست دەكەی، لەكاتی لارەسەنگبوونی ئەم ترازووەدا چۆن چارەسەری دەكەی، ئەو ڕێگایانە چین هاوسەنگی پێ دروست دەكەی، ئەی ئەو ڕێگایانە كامانەن كە ناهاوسەنگی پێ ڕاست ئەكەیتەوە... وە هەروەها.

ئەمە وەك ئایەتێكی سەربەخۆ، كەچی كە دێیتو سیاقی ئەم ئایەتە لەناو سورەتی **(البقرة)** ئەخوێنینەوە، سەیر ئەكەی زۆر گونجاو ئەو ئایەتە بونیەی خۆی پاراستووەو بووەتە بەشێكی تەواوكەریش بۆ بونیەی سورەتەكە، چۆن؟.. ئەم ئایەتە لە سورەتی **(البقرة)**دا هەیە بە ژمارە (٢٢٦)و ئەو ئایەتانە بەم شێوەیە ریز كراون.

**"لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٢٢٦) وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (٢٢٧) وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُواْ إِصْلاَحاً وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكُيمٌ (٢٢٨) الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلاَّ أَن يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللّهِ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (٢٢٩) فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (٢٣٠) وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النَّسَاء فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَاراً لَّتَعْتَدُواْ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ**

---

[1] وشەی "بالمعروف" واتە: مەعلومو ڕۆشن بێت لای هەمو كەس، هەندێ ئەڵێن" بالمعروف شرعا" ، تفسیر الجلالین، ص٣٨. هەندێ ئەڵێن: "بالمعروف عقلا وشرعا"، ئەوتری (المعروف اسم لكل فعل یعرف بالعقل أو الشرع حسنه)، مفردات ألفاظ القرآن الاصفهانی، وشەی (عرف).

فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ وَلاَ تَتَّخِذُوَاْ آيَاتِ اللّهِ هُزُواً وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنزَلَ عَلَيْكُمْ مِّنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٢٣١) وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْاْ بَيْنَهُم بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ (٢٣٢) وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَآرَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالاً عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُواْ أَوْلاَدَكُمْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّا آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٣٣) وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٢٣٤) وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاء أَوْ أَكْنَنتُمْ فِي أَنفُسِكُمْ عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَـكِن لاَّ تُوَاعِدُوهُنَّ سِرّاً إِلاَّ أَن تَقُولُواْ قَوْلاً مَّعْرُوفاً وَلاَ تَعْزِمُواْ عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّىَ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ (٢٣٥) لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاء مَا لَمْ تَمَسُّوهُنُّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ مَتَاعاً بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُحْسِنِينَ (٢٣٦) وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إَلاَّ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ وَأَن تَعْفُواْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَلاَ تَنسَوُاْ الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٣٧) حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ (٢٣٨) فَإنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَاناً فَإِذَا أَمِنتُمْ فَاذْكُرُواْ اللّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ (٢٣٩) وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعاً إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيَ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٢٤٠) وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ (٢٤١) كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ (٢٤٢)".

ئەگەر لەم ئایەتانە ورد ببینەوە سەیر ئەکەین بەشێوازێك، یان زیاتر بونیەوی ئەم پرسە گەورەی ئافرەتانی لەو ئایەتانەدا ڕۆشن کردووەتەوە و ئەو پارچە ئایەتەش وەك نەخش بە باڵای ئەو بینا جوانەدا هەڵواسراوە.

ماناى ئايەتەكان ئەفەرموێ:

"ئەو پیاوانەی کە سوێند لە دەمیان دەرئەچێت کە کاری شەرعی لەگەڵ خێزانەکانیاندا نەکەن، تەنیا (چوار مانگ) بۆیان هەیە پارێزگاری لە سوێندەکە بکەن، جا ئەگەر پەشیمان بوونەوە ئەوە خواش لێبوردەو بەسۆزە (لەگەڵ خولّقاوەکانی خۆیدا) * خۆ ئەگەر نیازی تەلاّقدانیشیان کرد ئەوە خوا بیسەرو زانایە (بۆ قسەو نێتی ناو دڵەکان) * ژنی تەلاّقدراویش تا سێ (حەیز، یان سێ **طوهر**)[1]. دوای تەلاّقدان خۆی ئەگرێتو شووناکات و بۆشیان حەڵاڵ نییە کە ئەوە خوا لە منالّدانیاندا خولّقاندوویەتی بیشارنەوە، ئەگەر بڕوایان بە خواو بەرۆژی ئاخیرەت هەیە، مێردەکانیشیان لەهەموو کەس زیاتر مافی ئەوەیان هەیە بیانگێڕنەوە بۆ لای خۆیان ئەگەر مەبەستیان ئاشتبوونەوە بێت، ئافرەتانیش ئەوەندەی ئەرکەکانیان مافیان هەیە بە مەعلومی، پیاوانیش هەروا و پلەیەکیشیان زیاتر لەوانە پێدراوەو خواش بەدەسەلاّتو دانایە (لەم بڕیارەدا) * تەلاّقدان دووجارە، دوای ئەوە یان بەچاکی و مەعلومی پەیوەست ئەکرێنەوە، یان بە چاکیو خێر لەیەك جیائەکرێنەوە، بۆ پیاوان حەلاّل نییە هیچ بڕێك لەو مارەییەی داویانە بە ئافرەتان لێیان وەربگرنەوە کاتێك نەبێت کە ترسی ئەوە هەیە کە سنوورەکانی خوا پێشێل بکرێ ئەوە بۆیان حەلاّلە لەو کاتەی کە ئافرەتەکە (فیدا)ی خۆی ئەدات، ئەمانە سنووری خوان مەیانبەزێنن، هەرکەس سنووری خوا ببەزێنێ ئەوە لە ریزی ئەوانەدایە کە ستەمکارو زالّمن * ئەگەر پیاوێك ژنەکەی (تەواو) تەلاّقدا، دوای ئەوە ئیتر بۆی حەڵاڵ نابێتەوە تا نەڕوات شوویەکی تر نەکات جگە لەم، خۆ ئەگەر ئەو مێردە تازەی تەلاّقی دا ئەوە گوناهیان ناگات جارێکی تر هەولّی

---

[1] "قرء" لە زمانی ئوصولی فیقهدا پێی ئەوترێت: "موشتەرەکی لەفزی"، واتە: لەفزێکە هاوبەشە لە نێوان چەند مانایەکداو لە زمانی عەرەبیدا بە مانای "حەیز" و بە مانی "طهر"یش دێت، زانایانی مەزهەبی ئەبوحەنیفە ئەفەرموون"راجح" ئەوەیە بە مانی "طهر" ماناکەی بکرێت، چونکە:

١ـ وشەی "قرء" بە دوای وشەی "ثلاثة"دا هاتووە و ئەبێتە "معدود"ی ئەو "عدد"ە، مادامێك وشەی "ثلاثة" بە "مؤنث" هاتووە، کەواتە ئەبێ "معدود"ەکەی "مذکر" بێو لەفزی "حیض"یش "مؤنث"ە کەواتە ئەبێ "حیض" نەبێ و "طهر" بێت.

٢ـ "عدد" لەفزێکی "خاص"ەو نابێ گریمانی تێبکەوێ، جا ئەگەر بە "طهر" مانا بکرێ ئەوە سێ "طهر"ەکە کەسری تێناکەوێ، بەلاّم حەیزەکە کەسری تێئەکەوێ و ژمارە (سێ) مانای خۆی لەدەست ئەدات.

یەکگرتنەوە بدەن بەو مەرجەی گومانیان بۆ دروست ببێت کە سنوورەکانی خوا (ئەمجارەیان) ئەپارێزنو (وەك یەکەمجار ناکەن)، ئەمانەش سنووری خوان رۆشنی ئەکاتەوە بۆ خەڵکانێك کە شت ئەزانن * ئەگەر ژنتان تەلاق داو (عیدە)ی خۆی تەواو کرد ئەوەیان یەك بکەونەوە بە چاکەو مەعلومی یان لەیەك جیاببنەوە بە چاکەو مەعلومی، دەستیان بەسەردا مەگرن بۆ ئەوەی تووشی زیانیان بکەنو سنوورەکان بشکێنن، هەرکەس‌وابکات ئەوە ستەمو زوڵمی لە خودی خۆی کردووە، گاڵتە بە ئایەتەکانی خوا مەکەنو مەیکەنە گاڵتەجاڕی خۆتان، نیعمەتەکانی خوای خۆتان بهێننەوە یاد کە رشتوویەتی بەسەرتانداو یادی ئەوەش بکەنەوە کە خوا ئەم کتێبەو حیکمەتیشی بۆ ناردوونە خوارەوە تا ئامۆژگاری ئێوەی پێ بکات، دەی ئێوەش خۆتان لە عادزی خوا بپارێزنو ئاگاشتان لەوەبێ کە خوا ئاگای لە هەموو شتێك هەیە (کە بیری لێ ئەکەنەوە یان ئەیکەن) * ئەگەر ژنێکتان تەلاق داو (عیدەی خۆی) تەواو کرد، کێشەی بۆ دروست مەکەن ئەگەر ویستی بگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی کاتێك کە یەکتری بە چاکی و مەعلومی رازی ئەکەن، ئەمە ئامۆژگارییە بۆ ئەو کەسانەتان کە بڕوایان بەخواو رۆژی ئاخیرەت هەیە، ئەمە پاكو چاکترە بۆتان (تا غیرەتکێشی و رق رشتن بەیەکتری)، خوا شت ئەزانیو ئێوە نایزانن * هەموو دایکان ئەبێت دوو ساڵی رێك شیر بدەن بە مناڵەکانیان بۆ هەر کەسێك حەزی لەوە ئەکرد مناڵەکەی شیری تەواو بخوات و ئەو کەسەش کە مناڵەکە تایبەتە پێوەیو هی ئەوە ئەرکی لەسەر شانێتی کە جلو بەرگو نەفەقەی تەواوی بکێشێ بە چاکیو مەعلومی و زۆر کردنیش بە پێی توانا ئەبێت، دروست نییە زیان بگەیەنرێت بە دایكو دروستیش نیە زیان بگەیەنرێت بەو کەسەی مناڵەکە تایبەتە پێوەی، هەمان ئەركو مافیش بە هەمان شێوە روو لە (میراتگرەکانیش) ئەکات کاتێك کە باوکی نامێنێ، ئەگەر ویستیشیان پێش دوو ساڵەکە لە شیری ببڕنەوە بە رەزامەندی هەردوولایان (دایکی مناڵەکەو باوکانی مناڵەکە)و بە راوێژ لەگەڵ یەکتریدا ئەوە قەیدی نییەو گوناهیان ناگات، ئەگەر ویستتان ئافرەتێکی تر جگە لە دایکەکانیان شیر بە مناڵەکانتان بدەن دیسان گوناهتان ناگات ئەگەر مافی ئەم دایەنە تازەیە بدەن بە چاکی و بە مەعلومی، خۆشتان لە عادزی خوا بپارێزنو ئەوەش بزانن کە خوای گەورە هەموو کارو کردەوەیەکتان ئەبینێ * ئەوانەشتان کە ئەمرنو ژن لە دوای خۆیان بە جێدێڵن، ئەو ژنانە پێویستە تا چوار مانگ و دە رۆژ خۆیان بگرنو شوو نەکەن، کاتێك کە ئەو ماوەیەی خۆیان

تەواو دەکەن، ئیتر گوناهیان ناگات هەرچی بکەن دەربارەی خۆیان بە چاکیو بە مەعلومی (وەك خۆرازاندنەوە یان شووکردن)، خواش لە هەواڵی هەموو کارو کردەوەیەك ئاگادارە * ئێوەش گوناهتان ناگات ئەگەر (بەماناوە،[1] نەك بە راستەوخۆو بێ پەردە) داوای ئافرەتێك بکەن کە (مێردەکەی مردبێتو ئەو ماوەیەی تەواو نەکردبێت)، هەروەها لەوەشدا گوناهتان ناگات کە لە دڵی خۆتاندا ئەو نیازەتان هەبێ یەکێك لەو جۆرە ئافرەتانە بخوازن، خوا ئەوە ئەزانێ کە ئێوە بیری ئافرەتان ئەکەنەوە، بەڵام ئەوە دروست نییە لە ژێرەوە وادەی هێنانیان بدەنو بەرێگەیەك یان زیاتر ئەم وادەیان پێ بگەیەنن، کاتێك نەبێت کە بە چاکی و مەعلومی ئەوە بڵێن (واتە بە ماناوە بیلێن، نەك بەبێ پەردەو راستەوخۆ)، بڕیاری مارەبڕین مەدەن تا "عیدە"کەی خۆی تەواو ئەکات، ئەوەش بزانن خوا ئاگای لەوەش هەیە کە لە ناختاندا هەیە بۆیە حەزەری لێ بکەنو ئەوەش بزانن کە خوا لێبوردەو خاوەن "حلم"یشە * گوناهتان ناگات ئەگەر ژنێکتان تەڵاق دا پێش ئەوەی کە بیگوازنەوەو بچنە لای نەفەقەی نەکێشن، یان بڕێك مارەیی بدەنێ (هەرکەسەو بە پێی تواناو گیرفانی خۆی) جا ئەو ئافرەتانە سەربەرزو خۆشحاڵ بکەن (لەو کاتانەدا) دەوڵەمەند بە پێی توانای خۆیو هەژاریش بە پێی توانای خۆی بە چاکی و بە مەعلومی (تا هەندێ لەو برینەی کە تەڵاق دروستی ئەکات بۆیان، لایان سارێژ بێتو متمانەی خۆشیان لەناو خەڵکدا زیانی بەرنەکەوێ)، ئەمە ئەرکو مافێکە هی ئافرەتانەو ئەکەوێتە سەرشانی پیاوی باشو چاکەکردار * خۆئەگەر ئەو ژنانەتان تەڵاق دا پێش ئەوەی بچنە لایانو مارەییەکیشیان بۆ بڕیاردابوون ئەوە لەو کاتەدا پێویستە نیوەی ئەو مارەییە بڕیار دراوەیان بدەنێ، کاتێك نەبێت ژنەکان خۆیان یان ئەو کەسانەی گرێی نیکاحەکەیان بەدەستە لێتان خۆش بنو گەردنتان ئازاد بکەن، خۆ ئەگەر لە یەکتری ببورن ئەوە زیاتر لە "تەقواو خواناسی" نزیکتان ئەکاتەوە، فەزڵو پیاوەتی ناوخۆتان لەبیرمەکەنو هەمیشە بە زیندوویی رایبگرن لە ناوتاندا، خوایش هەموو کاروکردەوەیەکتان ئەبینێ * پارێزگاری لە نوێژەکانتان بکەن بە تایبەتی نوێژی ناوەڕاست (کە نوێژی عەسر)ەو بۆ خوا رابدەنە مەیدانو لەگەڵ دیندا بەدڵ رابوەستنو

[1] زانایان ئەڵێن: "تەعریض" واتە: قسەکردن بە ماناوە ئەوەیە تۆ بە ئافرەتێکی بێوەژنکەوتوو بڵێی: تۆ ئافرەتێکی گەنجیتو هەموو کەسێك ئاواتت بۆ ئەخوازێت. (المفردات، ص٣٨).

رایبگرن * ئەگەر کاتی نوێژ ترسێکتان هەبوو (لە دوژمنێك یان لە دڕندەیەك) ئەوە بەپێوە یان بە سوارییەوە نوێژەکانتان بکەن، کە ترسەکەتان نەما بەو شێوەیە نوێژو یادی خوا بکەن کە خوا فێری کردوونو پێشتر نەتان ئەزانی * ئەو پیاوانەش کە ئەمرن لە ناوتاندا و ژنیان لێ جێ ئەمێنێ پێویستە وەسێتی ئەوە بکەن تا یەك ساڵ نەفەقەو خەرجی ژنەکەی بکێشنو لە ماڵەکەش جوابی نەکەنو دەری پەڕێنن، خۆ ئەگەر دوای ساڵەکە خۆیان ماڵەکەیان بەجێهێڵا ئەوە گوناهی ئێوە ناگات هەرچی بۆ خۆیان بکەن (لە خۆرازاندنەوەو شووکردن) ئەگەر بە چاکی و مەعلومی بیکەنو ئێوەش گوناهتان ناگات نەفەقەی لێ بگرنەوە،[1] خوای گەورەش بە دەسەڵاتە لە موڵکی خۆیداو دانایە لە شەرعدانانندا * ژنی تەڵاقدراو مافی مارەیی هەیە بە چاکی و بە مەعلومی و ئەوەش مافێکی خۆیانەوە ئەکەوێتە سەرشانی خواناسەکان * ئا بەم شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆی رۆشن ئەکاتە بۆ ئەوەی ئێوە عاقڵ بن *).

جا خوێنەری بەڕێز! سەیر بکە چۆن ئەو ئایەتە **"ولهن مثل الذي عليهن بالمعروف"** رەنگی داوەتەوە لەناو هەموو ئەو ئایەتانەداو چۆن ئەركو مافەکانی پیاوانو ئەركو مافەکانی ژنانیشی دیاری کردووە، لەوەدا مافی بە ئافرەت داوە و کردوویە بەئەرك بەسەر پیاوانەوە، لەمەشدا مافی بە پیاوان داوە و کردوویە بە ئەرك بەسەر ژنانەوە، یەکێ بۆ ئەمو یەکێ بۆ ئەو، شتێ لەسەر ئەمو شتێ لەسەر ئەو. ئەوەیە ئێمە ئەڵێین **"بونیەویەتی قورئان"** موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی قورئان، نەك هەر ئەمە، بەڵکو سروشتی بونیەوی قورئان وایە ئەگەر یەك ئایەت، نەك ئەوە، بەڵکو یەك پیت لابرێت لە قورئاندا، یان بکرێت بە پیتێکی تر، خێرا پێوەی دیار ئەبێتو پێی ئەزانرێتو لەنگی لە ماناو مەبەستەکەیدا دروست ئەکات.[2]

---

[1] زانایان ئەفەرموون: ئەم ئایەتە سێ حوکمی تێدایە، دوانیان کە (وصیە)و (یەك ساڵ عیدە)یە، بە دووئایەتی (میرات)و (عیدەی چوارمانگو دە رۆژ)ەکە نەسخکراوەتەوەو شافیعی ئەفەرموێ: بەڵام "سوکنا" کە هەر ماوەتەوەو بۆ کەس نییە ئافرەتی مێرد مردوو، جواب بکاتو بینێرێتەوە بۆ ماڵی باوکی. سەیری (تفسير الجلالين، ص٤٠)، بکە کە لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا.

[2] بۆ زانینی چەند نموونە لەسەر ەئم مەسەلەیە سەیری کتێبی ژمارە (١٣)ی پرۆژەی تیشك بکە لاپەڕەکانی (٣٥٦ تا ٣٦٠).

هەر بۆ نموونە سەیری ئایەتی (وأمرهم شورى بينهم) بکە، یان سەیری (**وشاورهم في الأمر**) بکە، چۆن خۆیان وەك دەقێکی سەربەخۆ ئەرکی ئایینی و تەشریعی خۆیان ئەنجام ئەدەنو کە ئەشیانبەیتەوە بۆ ناو سیاقی ئایەتەکانی سورەتەکانیان، چەند جوان و پێویست ئەرکێکی تازە تر ئەنجام ئەدەن. ئایەتی (**وشاورهم في الأمر**) لە سورەتی (**آل عمران**)دایەو ئایەتی (وأمرهم شورى بينهم) لە سورەتی (الشورى)دایە، ئەمیان سورەتێکی مەککییە، ئەویان سورەتێکی مەدەنییە، ئەمیان باسی ئەرکی تەشکیلیەیەکی حزبی ئەکات و ئەویان باسی ئەرکی تەشکیلەیەکی دەوڵەت ئەکات، ئەم بە (رستەی ناو = جملە إسمیە) هاتووە و ئەویان بە (رستەی فرمان = جملە فعلیە) هاتووەو بە صیغەی فرمانی داخوازیش هاتووە، کە زانایان ئەفەرموون: ئایەتەکەی "شورى" باس لە سیستمی راوێژو بڕیاری دەستەجەمعی ئەکات لەناو حزبداو ئایەتەکەی (آل عمران)یش باسی راوێژ و بڕیاری دەستەجەمعی ئەکات لەناو حکومەتدا، نە حیزبو نەحکومەت بێمنەت نین لە راوێژو راوێژکاری و وابکەن باش ئەکەن و وانەکەن خراپ ئەکەن، لە هەردوو حاڵەکەشدا (حزبو دەوڵەت) راوێژو بڕیاری دەستەجەمعی باشترین گرەنتییە بۆ دروست نەبوونی تاکڕەوی و دیکتاتۆریەت، جا سەیر بکە ئەوئایەتانە وەك خۆیان و وەك سورەتەکانیشیان چەندە ئەم سیستمی بونەویەتە بەسەریاندا جێبەجێ ئەبێت، خوێنەریش خۆی ئەتوانێ بە دوای ئەم مەسەلەیەدا بڕواتو بۆ نموونە کتێبی "تناسق الدرر"ی "**سيوطى**"، یان "**نظم الدرر**"ی "بوقاعى"، یان "**ألأساس في التفسير**"ی "سعيد حوّى" بخوێنێتەوە تا راستی ئەم بابەتەی بۆ رۆشن ببێتەوە، یان هیچ نەبێ هەردوو نامیلکەی قەبارەی بچووکی "**الوحدة البنائيه**"و "**الجمع بين القراءتين**"ی دکتۆر "**طه جابر العلواني**" بخوێنێتەوە.[1]

---

[1] ئەبوبەکری کوڕی العربی (بەرەحمەت بێت) لە کتێبی "قانون التأويل"دا باسی ئەوە ئەکات کە زانستەکانی قورئان (٧٤٥٠) زانستە بە ئەندازەی ژمارەی وشەکانی قورئان ئەبێتو کەرەتی چواریشی بکەی چونکە هەندێ لە پیاوانی سەلەف و پێشینی ئوممەتی ئیسلامی ئەڵێن: هەمو وشەیەك لە قورئاندا مانایەکی دیار و نادیارو پێناسەی و پارچە پارچەیی هەیە، ئەمە بەشێوەیەکی رەها، نەك وەك بونیە گشتییەکەی لەناو سورەتەکاندا و یان وەك پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئایەتەکانی تردا، چونکە ئەوە زانستێکە نایەتە ژماردنو جگە لە خواش (سبحانه وتعالى) کەسی تر نایزانێت!! "إرشاد الساري" القسطلاني، ٢/٧.

## ٤. ئیعجازی ژمارەیی

ئیعجازی ژمارەیی واتە: ئەم قورئانە هەموو پیتو وشەو ئایەتو سورەتێکی بەمەبەستو بە حسابات دانراوەو جێگۆڕکێ پێکردنی سورەتێك یان ئایەتێك یان وشەیەك یان تەنانەت (پیتێك) لارەسەنگی لەو شوێنەدا دروست ئەکاتو خێرا پێی ئەزانرێت، با چەند نموونەیەك باس بکەین.

ـ خوای گەورە ئەفەرموێت: (**وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ**) (**الحديد: ٢٥**). واتە: ئێمە توخمی ئاسنمان لە ئاسمانەوە دابەزاندووە، لە ئاسندا سەختییەکی زۆر هەیەو قازانجێکی زۆریش هەیە بۆ خەڵکی، بۆ ئەوەیشە کە خوای گەورە بزانێ کێ بە پەنهانی خواو پێغەمبەر سەرئەخات، خواش بەهێزو بەتوانایە.

زانایان ئەفەرموون:

١ـ پاش پشکنین و ئەزموونێکی زۆر لەناو کارگەکاندا بۆمان دەکەوتووە کە توخمی ئاسن یەکێك نییە لەو توخمانەی کە لە زەویدا دروست بوویێت، بەڵکو توخمێکی بێگانەیە بەزەوی‌و ئەبێت لە شوێنێکی ترەوە هاتبێت بۆ زەوی، ئەم قسەیە هی کابرایەکی ئەمریکییە لە دەزگای (ناسا) بە ناوی (ئاستروخ) کە بەناوبانگترین زانایانی گەردووناسییە لە ئەمریکادا.[1]

٢ـ شێخ عبدولمەجید ئەلزەنەدانی خاوەنی (**براءة الاختراع**)ی دەرمانی نەخۆشی کوشندەی ئایدز، ئەڵێت: "ئایا ئەزانن کێشی ئەتۆمی توخمی ئاسن برتییە لە (٥٧)و ژمارەی (٥٧)یش ژمارەی سورەتی (الحديد)ە لە قورئاندا! هەروەها ئاگادارن کە ژمارەی ئەو ئایەتە لە سورەتی (الحديد)دا بریتیە لە (٢٦) کە "بسم الله الرحمن الرحيم"یش بە ئایەتێك حساب بکرێ، ژمارەی ئەتۆمەکانی توخمی ئاسنیش بریتییە لە (٢٦) ئەتۆم... دەی تۆ بڵێ ئەمە هەروا بەرێکەوت بووبێت یان خوای گەورە لە رووی (زانیاری) و (دانایی)و (مەبەست)و (رەحمەت)ەوە ئەو ئایەتەی لەو شوێنەی ئەو سوورەتەو ئەو سورەتەشی لەو شوێنەی قورئاندا دانابێت؟! بەڵام زۆر کەس شت نازانن چی بکەین.[2]

---

1 موسوعة الاعجاز العلمي في القرآن الكريم والسنة المطهرة، يوسف الحاج أحمد، ص٢٢٩.

2 هەمان سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.

ـ هەر ئەمە نا، بەڵکو سەیری ئەم وردەکارییە زۆر سەیرە بکە.. خوای گەورە ئەفەرمویّت: "فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ (٨) فَذَلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ (٩) عَلَى الْكَافِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ (١٠) ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيداً (١١) وَجَعَلْتُ لَهُ مَالاً مَّمْدُوداً (١٢) وَبَنِينَ شُهُوداً (١٣) وَمَهَّدتُّ لَهُ تَمْهِيداً (١٤) ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ (١٥) كَلَّا إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيداً (١٦) سَأُرْهِقُهُ صَعُوداً (١٧) إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ (١٨) فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ (١٩) ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ (٢٠) ثُمَّ نَظَرَ (٢١) ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ (٢٢) ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ (٢٣) فَقَالَ إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ (٢٤) إِنْ هَذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ (٢٥) سَأُصْلِيهِ سَقَرَ (٢٦) وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ (٢٧) لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ (٢٨) لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ (٢٩) عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ (٣٠) وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلَّا مَلَائِكَةً وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَاناً وَلَا يَرْتَابَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْمُؤْمِنُونَ وَلِيَقُولَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْكَافِرُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلاً كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ (٣١). واتە: کاتێك کە فوو ئەکرێت بە "ناقوور"دا * ئەو رۆژە رۆژێکی سەختە * لەسەر کافران ئاسان نابێت * لێم بگەڕێ بۆ تۆڵەسەندنەوە لەو کەسەی کە بەتاك و تەنیایی دروستمکردووەو بڕیارێکی ماڵێکی زۆریشم بۆ داوە پێی بدرێت لە هەموو جۆرە ماڵێك * و کوڕو کاڵێکی زۆریشم پێداوەو ئامادەی کۆڕو کۆمەڵ ئەبن‌و ژیانم بە جوانی بۆ ڕاخستووەو دوای ئەوەش هەر بە تەمای زیاترە * شتی وانییە! ئەو نکولی‌و سەرسەختی ئەکات بەرانبەر بەڵگەو قورئانی ئێمە * زۆر نابا تووشی زەحمەتێکی گەورەی ئەکەم‌و ئەبێ پێیدا هەڵبزنێ * هات‌و کەوتە بیرکردنەوە لە قورئان‌و دەستی دایە هەڵسەنگاندنی * (خوا بیکوژێ) بۆ خۆی‌و بیرکردنەوەی * جارێکی تریش خوا بیکوژێ بۆ خۆی‌و بیرکردنەوەی * پاشان هات‌و دەستی کردە ڕادەربڕین دەربارەی قورئان * پاشان ڕووی گرژ کردو ڕۆچوون لە گرژو مۆنییدا * پاشان پشتی کردە باوەڕو ئیمانداری‌و دەستی دایە لوتبەرزی * خێرا وتی: ئەم قورئانە هیچ نییە جادوویەکی وەرگیراو نەبێ * ئەم قورئانە هیچی تر نییە ئەوە نەبێ قسەی خەڵك خۆیەتی * (دەی منیش لە پاداشتی ئەم بێشەرمی‌و لوتبەرزییەدا) ئەیخەمە ناو "سەقەر"ەوە * ئەزانی "سەقەر" چییە * (ئاگرێکە) نەگۆشت‌و نەماسولکە هیچی تر بەلەشی کافرانەوە ناهێڵێتەوە * هەموو پێستی ئەسووتێنێ * (ئەو زیندانە سووتێنەرە) نۆزدە کەس بەرپرسن لێی * ئێمەش بەرپرسانی ئاگری دۆزەخمان لە فریشتە نەبێ دانەناوە و ئەو ژمارەیەشمان بۆ ئەوە داناوە تا

ببێتە تاقیکردنەوە بۆ کافران‌و ببێتە "یەقین" بۆ ئەوانەی کە ئەهلی کتێبن‌و ببێتە مایەی ئەوەش ئیماندارەکان تا بێت ئیمانیان پێی زیاد بکات‌و دوای ئەوە ئیتر ئەوانە کتێبیان پێدراوەو ئەوانەش ئیماندارن گومان و دوودڵییان نەمێنێ‌و ئەوانەش دڵیان نەخۆشە و ئەوانەش کافرن هەر بڵێن: ئەمە ئەبێ مەبەستی خوا چی بێت لەم ژمارەیە؟!

ئا بەو شێوەیە خوای گەورە ئەو کەسەو گومڕا ئەکات کە ئەیەوێت و ئەو کەسەش هیدایەت ئەدات کە ئەیەوێت و کەسیش ژمارەی سەربازانی خوا نازانێ خۆی نەبێت‌و ئەم "سەقەرەش" هیچی تر نییە ئەوەنەبێ کردوومانەتە هۆی یادکردنەوە بۆ خەڵکی.

ئەوە مانای ساناو سادەی ئایەتەکانە وەك لە تەفسیری (جلالین)مان وەرگرتووە، بەڵام ئایا ئیعجازی ژمارەیی چی هەیە لەم ئایەتەدا؟

ـ سید **قطب** (بە رەحمەت بێت) ئەڵێ: "بەڵام ئایا بۆچی (نۆزدە) کەسن‌و مەبەست لەو ژمارەیە هەرچی بێت ئەوە کارێکە هەر خوا ئەیزانێ، ئەو خوایەی کە هەموو بوون‌و گەردوونی هۆنیوەتەوەو هەموو شتێکی بەرێژەو حسابات خولقاندووە"، ئەم قسەیە جوانە، بەڵام ڕێگر چییە مرۆڤ بە شوێن نهێنی ئەم ژمارە نۆزدەیەدا بگەڕێ.

ـ زەمەخشەری ـ تەفسیرزان ـ ئەڵێ: "ئیمانداران وای ئەبینن کە ئەو ژمارەیە پڕە لە حیکمەت‌و ملی بۆ کەچ ئەکەن، چونکە بڕوایان وایە کە هەرچی ئیشی خوا هەیە چاکەو دانایی تێدایە و بەم بڕوابوونەش ئیمانیان زیاد ئەکات و کافرانیش نکوڵی لێدەکەن‌و گومان و دوودڵی دروست ئەکەن و ئەو حاڵەتەش کوفر و گومڕاهییان زیاتر و زیاتر ئەکات".

ـ "کەعبی"یش ئەڵێ: "مەبەست لەم تاقیکردنەوە بە ژمارە (١٩) ئەوەیە مسوڵمانان بڵێن هەر خوا ئەزانێ ئەو ژمارە تایبەتە چییە و چۆنە". هەردوو قسەکە هەر جوانن، بەڵام هیچ خراپەیەك لەوەدا نییە بۆ نهێنی ئەم ژمارەیە بگەڕێین و گەوهەری گرانبەها لەدەست خۆمان دەرنەکەین، چونکە خوای گەورە باسی ئەم ژمارەیەی بەستووە بە چەند شتی گرنگەوە:

١ـ یەقینی ئەداتە ئەهلی کتێبەکان.

٢ـ ئیمانی زیاتر ئەداتە ئیمانداران.

٣ـ دوودڵی‌و گومان ناهێڵێ لە دڵی ئیماندار و خاوەن کتێبەکاندا.

٤ـ دڵ نەخۆش‌و کافرانیش بهێنێتە قسەو بە گاڵتە کردنە و هەر بڵێن: ئەبێ مەبەست چی بێ؟ ئەی بۆ بیست نین؟ بۆ هەزار نین؟ باشە (نۆزدە) کەس، چۆن فریای سەرپەرشتیکردنی هەموو جەهەننەم ئەکەون!!

ئێمە کورتەیەکی ئەو لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونانەی زانایان بۆ ئەم باسە لێرەدا باس ئەکەین‌و هەر کەسیش زیاتری ویست با **"موسوعة الاعجاز العلمي للقرآن للكريم والسنه المطهرة"** لە لاپەڕە (٦١)ەوە تا لاپەڕە (٨٦) بخوێنێتەوە زۆر بە وردی باسی لەم ژمارەیە کردووەو سەلماندوویەتی کە ئەم ژمارەیە یەکێکە لە مەسەلە گەورەو گرنگەکان[1] وەك خوای گەورە لە کۆتایی سورەتی **(المدثر)**دا ئەفەرموێ: **(إِنَّهَا لَإِحْدَى الْكُبَرِ * نَذِيراً لِّلْبَشَرِ) (المدّثر: ٣٥ـ ٣٦)**.

* ئایەتەکانی سورەتی **(المدثر)** هەموو کورت کورتن، ئایەتی ژمارە (٣١) نەبێ کە زۆر سەرنجی قورئان خوێن رادەکێشێ، کە ئایەتەکە باس لە نهێنی ئەم ژمارە (نۆزدەیە) ئەکات.

* ئەم ئایەتە لە (٥٧) وشە پێکدێت، واتە (١٩×٣).

* ئەم ئایەتە لە دوو بەش پێکدێت: بەشی یەکەم لە (٣٨) وشە پێکدێت. واتە (١٩×٢)و بە رستەی **(ماذا أراد الله بهذا مثلا)** کۆتایی پێ دێت، بەڵام بەشی دووەمی لە (١٩) وشە پێك دێت کە پاشبەندییەکە بۆ بەشی یەکەم‌و ئەفەرموێ: **(كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ)** .

* ژمارەی وشەکانی (١٩) ئایەتی سەرەتای سورەتی **(المدثر)** ئەکاتە (٥٧) وشە، واتە (٣× ١٩)و بەو شێوەیەش ژمارەی وشەکانی ئایەتی ژمارە (٣١) ئەکاتە (٥٧) وشە.

* لە ئایەتی (١)ەوە تا ئەگاتە ئایەتی (٣١) واتە کۆتایی فەرمودەی خوا **(عليها تسعة عشر)**، (٩٥) وشە هەیە، واتە (١٩× ٥).

* ئایەتی (٣٠)و رستەی **(عليها تسعة عشر)** لە سێ وشە پێکدێت، **(عليها)**و **(تسعة)**و **(عشر)**، کە لەم ئایەتەکە ورد ئەبیتەوە دونیایەك نهێنیت بۆ دەرئەکەوێ لەوانە:

* ژمارەی پیتەکانی سورەتی **(المدثر)** لە سەرەتاوە تا وشەی **(عليها)** واتە پێش ئەوەی بگەیتە **(تسعة عشر)** ئەکاتە (٣٦١) پیت، واتە (١٩× ١٩)!

---

[1] نووسەری ناوبراو باسی ئەوە ئەکات کە لە کتێبێکدا بە ناوی (إعجاز رقم ( ١٩) في القرآن الكريم مقدمات تنتظر النتائج) بە درێژی لەسەر ئەو باسە رۆیشتووە.

* (**تسعة عشر**) له (حەوت) پیت دروست بووه و بەو پێیه بێت ناوەڕاستی ئەم ژمارەیه ئەکاته ژماره (**٣٦٥**)، ئەو ژمارەیەش ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵە! تۆ بڵێی ئەو ژمارەیه پەیوەندیشی به گەردوونزانییەوه هەبێت؟!

* سەیر لەوەدایه خوای گەوره دوای باسکردنی ئەم ژمارەیه له سوورەتی (**المدثر**)دا سوێند به (مانگو زەوی‌و خۆر) ئەخوات، باشه تۆ بڵێی ژماره نۆزده هیچ پەیوەندییەکی بەم سێ هەسارەوه هەبێت؟! له ڕاستییدا: بەڵێ پەیوەندی توندیشی پێوەی هەیه، ئەوەش باسێکی قوڵەو لێرەدا بۆ ئێمه ناگونجێ بیگوازینەوه[1]..

* ئایەتی (٣١) له (٥٧) وشه پێکهاتووه، واته (١٩×٣) و له قورئاندا کۆتا ئایەته که ژمارەی وشەکانی (١٩) وشه بێت و دوای ئەو هیچ ئایەتێك بەو ژمارەیه نییه.

* لەو ئایەتی (٣١)ەکەدا یەك ڕستەی ناوبڕ (**جملة معترضة**) هاتووه که ئەفەرمووێ: (**وما يعلم جنود ربك الا هو**) که پەیوەندی نییه به باسی ناو ئەو ئایەتەوه که ئەو ڕستەیه له (١٩) پیت پێکهاتووه، باشه وەك (**يوسف الحاج أحمد**) له (**موسوعة الأعجاز**)دا ئەڵێ: ڕێناکەوێ که ژماره (١٩) خۆی سەربازێکی خودایی بێت که ئایەتەکه ئاماژەی پێ ئەکات؟ چۆن وانییه له کاتێکدا سەرکەوتنی (بیروباوەڕ) سەرکەوتنه بۆ دوو سوپای گەورەش که ئەچن بەگژ یەکتردا.

ـ مامۆستا (**محمد أحمد الراشد**) باسێکی دوورودرێژی لەسەر تیاچوون‌و هەڵبەزو دابەزی دەسەڵاتی ئیسرائیلی کردووه به پێی ئەم ژماره (نۆزدەیه)، جێگەی خۆیەتی هەرکەس بیەوێت لەوبارەیەوه شارەزابێت بگەڕێتەوه بۆ کتێبی (زوال اسرائيل: **٢٠٢٢**)، یان با بگەڕێتەوه بۆ کتێبی (**موسوعة الاعجاز العلمي**)، (ل **٧٢** تا ل **٨٥**).

* زانایان ئەفەرموون: "**بسم الله الرحمن الرحيم**" له نۆزەده پیت پێکهاتووه:
(ب١ س٢ م٣ ل٤ ا٥ هـ٦ أ٧ ل٨ ر٩ ح١٠ م١١ ا١٢ ن١٣ ا١٤ ل١٥ ر١٦ ح١٧ ی١٨ م١٩).

ئەم "**بسم الله الرحمن الرحيم**"ه کلیلی کردنەوەی سورەتەکانی قورئانەو چەندان نهێنی له خۆی گرتووه بۆ نموونه:

[1] سەیری: (موسوعه الاعجاز العلمی) ص٧٥ بکه بۆ زانینی هەندێ لەو پەیوەندییانه.

* برِگەکانی ئەم "بسم الله الرحمن الرحيم" کە چوار برِگەیە (اسم، الله، الرحمن، الرحيم) لە قورئاندا هەریەکەیان (١٩) جار، یان بە چەند جارەی نۆزدە هاتووە.

ـ وشەی (اسم) نۆزدە جار لە قورئاندا هاتووە.

ـ وشەی (الرحمن) پەنجاو حەوت جار لە قورئاندا هاتووە واتە (٣× ١٩).

ـ وشەی (الرحيم) سەدو چواردە جار لە قورئاندا هاتووە، واتە (٩×١٩).

ـ وشەی (الله) دوو هەزارو شەشسەدو نەوەدو هەشت جار لە قورئاندا هاتووە، واتە: (١٤٢ ×١٩).

ـ وشەی "بسم الله الرحمن الرحيم" خۆشی سەدو چواردە جار هاتووە لە قورئاندا واتە: (٦×١٩).

ئەمە چ ئامارێکی وردە؟ ئایا ئەگونجێ ئەمە هەروا لە خۆیەوە بووبێت و بەمەبەست دانەرِێژرابێت؟

* هەروەها ئەو پیتانەش کە هەندێ لە سورەتەکانی قورئانی پێکراوەتەوە، پرِن لە نهێنی و هەمان سروشتی "بسم الله الرحمن الرحيم"یان پێدراوە لەگەڵ هەندی نهێنی زیاتریشدا، بۆ نموونە:

ـ پیتی (ق) کە سەرەتای سورەی (ق)ی پێ کراوەتەوە لە سورەتەکەدا پەنجاو حەوت جار بەکارهاتووە کە ئەکاتە (٣×١٩).

ـ پیتی (ص) کە سەرەتای سورەتی (**ص والقرآن ذي الذكر**)ی پێکراوەتەوە سەد و پەنجاو دووجار لە سوورەتەکەدا دووبارە بووەتەوە، کە ئەکاتە (٨×١٩).

ـ پیتی (ن) لە سەرەتای سورەتی (ن والقلم)دا (١٣٣) جار هاتووە، واتە (٧×١٩).

ـ پیتی (**ط**) لە سورەتی (**طه**)دا (٣٤٢) جار هاتووە، واتە (٨× ١٩).

ـ پیتی (یس) لەسەرەتای سوورەتی (یس)دا (٢٨٥) جار هاتووە، واتە (١٥× ١٩).

هەر ئەمە نا، بەڵکو:

ـ لە قورئاندا هەمیشە کە باسی گەلی (**لوط**) کراوە هەر ئەفەرموێ (قوم **لوط**) تەنیا لە سورەتی (ق) دا نەبێت لە جیاتی (قوم **لوط**) ئەفەرموێ (إخوان **لوط**) ئەزانن بۆچی؟

لەبەرئەوەی ئەگەر بیفەرموایە (قوم **لوط**) ژمارەی قافەکانی سورەتەکە دانەیەك زیادی ئەکردو ئەبوویەوە (٥٨) نەك (٥٧) و ئەو کاتە بەسەر ژمارە (١٩)دا دابەش نەئەبوو، بەڵام لەباری ئێستایدا (٥٧) دانە (ق) هاتووەو واتە ئەکاتە (٣× ١٩)، لەبەر ئەم نهێنییە

سەیرەیە کە ئەفەرموێ: (**كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَابُ الرَّسِّ وَثَمُودُ * وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَانُ لُوطٍ**) (**قـ: ١٢ـ ١٣**).

ـ هەروەها ئەو سورەتانەی کە بە پتێکی دیاری کراو دەست پێ ئەکەن لەو سورەتەدا، ئەو وشانەی زۆر تێدایە کە ئەو پیتەیان تێدایە، واتە لە سورەتی (ق)دا (وشەی قافی) زۆرتر هەیە و لە سورەتی (ن)دا وشەی (نون)ی زۆرتر هەیە و لە سورەتی (ص)دا وشەی (صاد)ی زۆرتر بەکارهاتووە.[1]

* لەمانەش سەیرتر ئەوەیە کە:

ـ وشە گرنگەکان بە هاوسەنگی لە قورئاندا بەکارهاتوون، واتە بە قەدەر یەك بەکاربراون:

ـ وشەی (الدنيا) و وشەی (**الآخرة**) لە قورئاندا یەکی (١١٥) جار بەکارهاتوون.

ـ وشەی (**ملائكة**) و وشەی (**شياطين**) لە قورئاندا یەکی (٨٨) جار بەکارهاتوون.

ـ وشەی (الموت) و وشەی (الحياه) یەکی (١٤٥) جار بەکارهاتوون.

ـ وشەی (السيئات) و وشەی (الحسنات) یەکی (١٦٧) جار بەکارهاتوون.

ـ وشەی (الناس) و وشەی (الرسل) یەکی (٢٤١) جار بەکارهاتوون.

ـ وشەی (الشهر) دوازدە جار بەکارهاتووە سالێش (١٢) مانگە.

ـ وشەی (**الأيام**) سی جار بەکارهاتووە مانگیش (٣٠) رۆژە.

ـ بەڵام وشەی (یوم) (**٣٦٥**) جار بەکارهاتووە، چونکەساڵ (**٣٦٥**) رۆژە.

باشە ئەمە چ دیققەت و وردەکارییەکە خەڵکینە! ئەمە کەی لە توانای مرۆڤدا هەیە ئەوەندە بە حسابات قسە بکات و بەوشێوەیە ئامۆژگاری و یاسا و رێساکانی بپێوێت و بیکێشێت؟!!

ئایا ئەکرێ ئەمە رێکەوت بێت، ئەکرێ بێ مەبەست بێت، یان ئەمە موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی قورئان و تا دونیاش دونیایە نهێنی زیاتری ئەم قورئانە دەردەکەوێت و راستی ئەم قورئانە بۆ دوورو نزیك رۆشن ئەبێتەوە و خوای گەورەش راست ئەفەرموێ: (**سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ**) (**فصلت: ٥٣**). واتە: ئێمو زۆر نابات لە ئاسۆدا و لە دەروونی

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر سەیری (التعبير القرآني، د. فاضل السامرائي، ص١٤) بکە.

خۆشیاندا ئەوەندە شتیان پیشان ئەدەین تا بۆیان دەرئەکەوێت کە ئەم قورئانە راستەقینەیە، باشە ئەوەندە بەس نییە کە پەروەردگاری تۆ شایەتە بەسەر هەموو شتێکەوە؟!

## ٥. ئیعجازی زانستی

مەبەست بە ئیعجازی زانستی ئەوەیە کە قورئان هەواڵی داوە دەربارەی زۆر شت کە زانستی تازە ئێستا راستی ئەو مەسەلانەی سەلماندووە، بۆ نموونە، خوای گەورە دەربارەی بناغەو سەرەتای لە دایکبوونی گەردوون باس ئەکاتو ئەفەرموێت: **(أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ) (الأنبياء: ٣٠)** . واتە: ئەوە کافران بۆ لەوە ورد نابنەوە کە کاتی خۆی ئاسمانەکانو زەوی یەك پارچە بوونو ئێمە تەقاندمانەوەو لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان خولقاند، دەی بۆ ژیر نابن.. زانستی تازەش راستی ئەم مەسەلەیەی دەرخستووە پاش هەزار و چوار سەد ساڵ لە دابەزینی ئەم ئایەتەوە و ئەڵێ بوونەوەر هەموو یەك کوتلەی ئاگرین بووە سەرەتا و تەقێنراوەتەوە و پاشان ئەم زەویی و ئاسمان و ئاو هەوا دروست کراوە لەسەری.

ـ خوای گەورە ئەفەرموێت: **(وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ) (النمل: ٨٨)**. واتە: کە سەیری شاخەکان ئەکەی وا حساب ئەکەی کە وشك و رەق لێی راوەستاون، کەچی لە هەمان کاتدا هەروەك لە گەران و گەرد و خولدان، ئەمە دەستکردی ئەو خوایەیە کە هەموو شتێکی بەرێك و جوانی دروست کردووە.

زانستی تازەش دوای چەند سەدە ئەوەی سەلماند کە زەوی سوڕانەوەیەکی بە دەوری خۆیدا هەیەو سووڕانەوەیەکی بە دەوری خۆردا هەیەو سووڕانەوەیەکی تریشی هەیە کە هێشتا نەزانراوە چۆنەو ئامانج لێی چییە، سووڕانەوەی بەدەوری خۆیدا شەوو رۆژ دروست دەکات و سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا چوار وەرزی (بەهارو هاوینو پایزو زستان) دروست ئەکاتو سووڕانەوەکەی تری نازانرێ چۆنەو بۆچییە؟

* خوای گەورە ئەفەرموێت: **(أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتاً * أَحْيَاء وَأَمْوَاتاً) (المرسلات: ٢٥ ـ٢٦)**. واتە: ئایا ئێمە زەویمان وا لێنەکردووە کە زیندووەکان و مردووەکانیش بگرێتە خۆی و چنگیان بگرێت بەسەردا!! جاران ئەمە وا تەفسیر ئەکرا کە گوایە مەبەست پێی

ئەوەیە زەوی ژێربار و دەستەمۆ کراوە بۆ ژیان و مرۆڤ و مردووەکانیش ئەگرێتە ناوخۆی و فڕێیان ناداتە دەرەوە، بەڵام زانستی تازە ئەوەی سەلماندووە کە ئەم زەوییە بە هێزی کێشکردن **"قوة الجاذبیة"** توانیویەتی چ هەوا و ئاواو تەنەکان بەمردو و زیندووەوە بگرێتە خۆی و کێشیان بداتێ و کە هێزی کێشکردنی نەما کێشی تەنەکانیش ئەبێت بە (سفر).

ـ خوای گەورە ئەفەرموێ: **(وَالسَّمَاء بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ) (الذاریات: ٤٧).** واتە: ئاسمانمان بەهۆی هێزەوە دروست کردووەو ئێمە بەردەوامیشین لە فراوانکرندیدا.

زانستی تازەش ئەوەی دەرخستووە کە ئاسمان و بوونەوەر هەمووی بەردەوام لە فراوانبووندایە، لە ساڵی (١٩٢٩) زانای گەردووناسی ئەمریکی "أدوین هابل" بەهۆی تەلەسکۆبی گەورەوە ئەوەی بۆ دەرکەوت کە کۆمەڵەکانی ئەستێرە (المجرّات) بەخێراییەکی سەیر لە یەکتری دوورئەکەونەوە،[1] نەك ئەمە، بەڵکو زانایان ئەڵێن ئەگەر بێتو باڵندەیەك بەخێرایی تیشك بیەوێت لە خاڵێکەوە بفڕێت کە ناوی بنێین سەرەتای بوونەوەر تا ئەگاتە خاڵی ئەوسەر کە ناومان ناوە خاڵی کۆتایی، بوونەوەر چەند ئەوەندەی تر فراوان بووە،[2] بەو شێوەیە بوونەوەر بەردەوام فراوان ئەبێت و ئێمەش هەستی پێ ناکەین.

* تەنانەت ئەو شتانەش کە خوای گەورە وەك موعجیزە داویەتی بە پێغەمبەر (ﷺ) زانستی تازە وا خەریکە دەری دەخات کە ئەو شتانە هەموو راستەقینەیەکن کە روویان داوە و نکوڵی لێکردنی دژایەتیکردنی بیردۆزە زانستی و راستییە زانستییەکانە. بۆ نموونە خوای گەورە ئەفەرموێت: **(اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ * وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ * وَكَذَّبُوا وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءهُمْ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ) (القمر: ١ـ٣).** واتە: "قیامەت" نزیکبووەتەوە و مانگیش دوولەتبووە، هەرچەندە خەڵکی بێ دین هەرچی ئایەتو بەڵگە هەیە ببینێت هەر پشت هەڵئەکەنو ئەڵێن: ئەمانە هەمووی جادوویەکی بەردەوامن[3] درۆ ئەکەن و شوێن ئارەزووەکانیان ئەکەون، (با خەڵك هەموو لەوە ئاگاداربن) کە هەموو کارێك بەرەو ئارامگایەك ئەڕوات و لەوێدا کار و فەرمانی کۆتایی پێ دێت.

---

[1] موسوعة الإعجاز العلمي، ص٣٨٣.

[2] سروست لە تەرازووی ژیرییدا، محمد ملا صالح شارەزووری، ل١٥.

[3] هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: "سحر مستمر" لە "مره"وە هاتووە کە یانی "هێز" واتە: جادوویەکی بەهێزو کاریگەرە (تفسیر الجلالین، ص٥٥٧).

(د. زغلول) زانایەکی پسپۆڕی ئیعجازی زانستییە، ئەڵێ: ماوەیەك لەمەوپێش لە زانکۆی (کاردیف) لە ڕۆژئاوای بەریتانیدا ـ موحازەرەیەکم ئەدا و ئامادەبوان بریتیبوون لە موسڵمانو ناموسڵمان و باسی ئیعجازی قورئانم بۆ ئەکردن گەنجێکی موسڵمان هەستایەوە وتی: باشە مامۆستا، هیچ ئیعجازێك لەم ئایەتەدا شك ئەبەی کە ئەفەرموێ: **(اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ)**. منیش وتم: نەخێر من هیچ ئیعجازێك لەو ئایەتەدا شك نابەم، چونکە زانست تەفسیری پرسە زانستییەکان ئەکات و ناتوانێ "موعجیزە: تەفسیر بکات، لەتبوونی مانگیش یەکێك بووە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر (ﷺ). کە موشریکەکان داوا لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەکەن وەك تاقیکردنەوەیەك با مانگیان بۆ لەت بکات و ئەگەر بتوانێ ئەوە بکات ئەوە ئەوانیش موسڵمان ئەبن! پێغەمبەریش (ﷺ) دەستی کردە دوعا کردنو خوای گەورەش ئیلهامی کرد کە بە پەنجەی موبارەکی ئاماژە بکات بۆ مانگ و لەتی بکات، کە پێغەمبەر (ﷺ) پەنجەی موبارەکی بەرز کردەوە و فەرمانی کرد بە مانگ لەت ببێت، بوویە دوولەتەوە و هەریەکەیان لەلایەکی ئاسمانەوە بۆ ماوەیەك وەستان و پاشان یەکیان گرتەوە، کەچی کافرەکان لە جیاتی ئەوەی موسڵمان بن وتیان: ئەمە جادووکردن بوون، هەندێ لە عاقڵانی ناویان وتیان: ئەمە ئەگەر لە شوێنەکانی تریشدا ئەمە روویدابێت ئەوە جادوو نییە ئەگەر رووی نەدابێت ئەوە جادووە، ڕۆیشتن سەر ڕێگەو دەروازەکانی شاری ـ مەککە ـ یان گرتو هەرکەس لە شارەکانی ترەوە ئەهاتنە مەککە پرسیاریان لێئەکردن چی سەیر و سەمەرەیان لا هەیە، ئەیانووت: شتێکی زۆر سەیر روویدابێت ئەوەیە لەم شەوانەدا مانگ دوولەت بوو بوو، ماوەیەکی زۆر لەو حاڵەتەدا بوو، پاشان هاتنەوە یەكو یەکیان گرتەوە، موشریکەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەوە راستەقینەیەك بووەو جادووگەری نەبووە و هەندێك لەسەر ئەوە موسڵمان بوونو هەندەکەی تر هەر لەسەر لوتبەرزی خۆیان مانەوە.

(دکتۆر زغلول) دەڵێ: "کە لە قسەکانم بوومەوە گەنجێکی بەریتانی هەستایەوە و خۆی ناساندو وتی: من ناوم "داود موسی بانیۆك"ە، داوای کرد ڕێگەی قسەکردنی پێبدرێ و منیش وتم: فەرمووو:

وتی: من کابرایەك بووم بە شوێن توێژینەوەی (ئاینەکان)دا وێڵ بووم و ڕۆژێکیان قوتابییەکی موسڵمان قورئانێکی (وەرگێڕدراوی ئینگلیزی) بە دیاری نارد بۆم و منیش لێموەرگرتو زۆر سوپاسم کرد، کە چوومە ماڵەوە و کتێبەکەم کردەوە بە ڕێکەوت کەوتە

سەر ئەم سورەتە (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ) وتم: باشە عەقلْ ئەوە ئەبڕێ؟ عەقلْو زانست پشتی ئەوە ئەگرن مانگ دوولەت ببێتو پاشان لەحیم ببێتەوەو یەکبگرێتەوە؟ چ هێزێك ئەتوانێ کاری وابکات؟ کوڕە گەنجەکە ئەڵێ: "ئەم ئایەتە وای لێکردم دڵم لە قورئانەکە سارد بوویەوەو دوای ئەوە ئیتر هیچی ترم لێنەخوێندەوەو وتم دیارە قورئانیش هەر باسی خورافاتو ئەفسانە ئەکات!! بەڵام خوا ئاگاداربوو کە من بە راستی بە شوێن راستییدا ئەگەڕامو حەزم لە لێکۆڵینەوەی زانستی بوو، پاش ماوەیەك سەیری بەرنامەیەکی زانستیم ئەکرد لە تەلەفزیۆندا، کابرایەکی بەریتانی بەڕێوەبەری بەرنامەکە بوو گفتوگۆ و حیواری لەگەڵ سێ زانای گەردووناسی ئەمریکیدا ئەکرد، ئەم پێشکەشکەری بەرنامەیە رەخنەی لەو زانایانە ئەگرت دەربارەی ئەو هەموو خەرجی و مەسروفەی ئەکرێت بۆ ئەم گەشتە ئاسمانییانە و ئەیوت: لە جیاتی ئەو هەمووە خەرجییە بدرێتە هەژارانی دونیاو ئەوانەی بەدەست دواکەوتن و نەخۆشی و داماوییەوە ئەناڵێنن، دێن ئەو هەمووە پارە خەرج ئەکەن لە پێناو گەشتێکی ئاسمانیدا کە لە ئەنجامدا هیچ شتێکی تازەش نادۆزنەوە،

سێ زاناکەش بەرگرییان لە کارەکەی خۆیان ئەکردو ئەیانوت: ئەو خەرجییە زۆرە تەنیا بۆ گەشتی ئاسمانی خەرج ناکرێت، بەڵکو بۆ هەموو مەیدانەکانی تری زانستیش خەرج دەکرێت وەك (**طب**)و (پیشەسازی)و (کشتوکاڵ)... و ئەو شتانەی تریش.. حیوارەکەیان سەری کێشا بۆ باس و خواستی ئەوەی یەکەمجار کێ دابەزییە سەر مانگ و چی دۆزییەوە، پێشکەرەکە پرسیاری خەرجی ئەو گەشتەی لێکردن وتیان: زیاتر لە سەد ملیۆن دۆلار خەرجی بردووە، کابرای بەریتانی قیژاندی وتی: باشە هەی هاوار زیاد لە سەد ملیۆن خەرج ئەکرێت تەنیا بۆ ئەوەی کابرایەك بچێتە سەر مانگو ئاڵای ئەمریکا لەوێدا بچەقێنێت؟ زاناکان وتیان: نەخێر تەنیا بۆ ئەوە نییە کە ئاڵای ئەمریکا دابچەقێنێت، بەڵکو لە ئەو گەشتەدا راستەقینەیەکمان دەرخستووە کە ئەگەر چەند قاتی ئەو خەرجییەمان خەرج بکردایە خەڵکی بڕوای پێنەئەکردین!.

پێشکەشکارەکە وتی: کام راستەقینەیە؟

وتیان: کاتی خۆی ئەم مانگە لەتبوونێکی بەخۆوە بینیوەو پاشان یەکی گرتووەتەوە.

پێشکەشکارەکە وتی: چۆن ئەمەتان بۆ دەرکەوتووە؟

وتیان: پشتێنەیەکی بەردین کە گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتووە لەسەرەوە بۆ خوارەوە هەموو مانگی گرتۆتەوە، وەك ئەوەی دوولەت بوویێتو لەحیم کرابیتەوە بەیەکەوە، لەگەڵ

(زانایای جیۆلۆجی) دا راوێژو لیکۆڵینەوەمان کردووە لەسەر ئەمە، ئەوان قەناعەتیان وابوو کەشتی وائەبێت تەنیا لەو کاتەدا روویدا بێت کە ئەم مانگە بووبێتە دوولەتو پاشان یەکی گرتبێتەوە!

ئەم کوڕە گەنجە ئەڵێ: کە گوێم لەمە بوو لەسەر کورسییەکە هەڵبەزیمو قیڕاندم: ئەرێ وەڵڵا موعجیزەکەی موحەممەد هاتەدی! کە پێش هەزار و چوارسەد ساڵ باسی کردووە و ئەوەتا خوا ئەمریکا بەکاردێنێ بۆ ئەوەی ملیۆنەها دۆلار خەرج بکات تا راستەقینەکانی دینەکەی ئەو بۆ خەڵکی بسەلمێنێ، کەواتە: دینی مسوڵمانەکان راستەو هی خوایە!! بۆیە رام کرد و پەلاماری قورئانەکەم داو لەسەر رەفەکە (کە تۆزی لێ نیشتبوو) دامگرت و دەستم کرد بە خوێندنەوەی و سەرلەنوێ سورەتی (القمر)م خوێندەوەو ئەو سوورەتە بوویە دەروازەیەك بۆم و هاتمە ناو ئیسلام و بە قەناعەتەوە قبوڵم کرد.[1]

بە کورتی قورئان راستە کتێبێکی زانستی نییە کە هەوڵی ئەوە بێت باس لە وردەکارییەکانی زانستو بەشو لقەکانی بکات، بەڵام ئاماژەی زانستی زۆری تێدایە بۆ هەموو لقو بەشەکانی زانست، وەك هەندێ لە زانایان باسیان کردووە، بۆ نموونە دەڵێن لە قورئاندا:

- (٦٦) ئایەت باسی بیرکاری ئەکات.
- (٦٤) ئایەت باسی فیزیا ئەکات.
- (٥) ئایەت باسی ئەتۆم ئەکات.
- (٩) ئایەت باسی کیمیا ئەکات.
- (٦٢) ئایەت باسی شتە ریژەییەکان ئەکات.
- (١٠٠) ئایەت باسی گەردوون ئەکات.
- (٢٠) ئایەت باسی کەشو هەوا ئەکات.
- (١٤) ئایەت باسی ئاو و پێکهاتەکانی ئەکات.
- (١١) ئایەت باسی فەزا و گەردوونزانی ئەکات.

[1] ئەم کوڕە گەنجە ئێستا مسوڵمانێکی بە ئاگا و ئیشکەرە و سەرۆکی (حزبی ئیسلامی بەریتانیا)یە و خەریکی خزمەتکردنی ئیسلام و کاری ئیسلامییە، (موسوعة الاعجاز العلمي في القرآن الكريم والسنة المطهرة)، يوسف الحاج أحمد، ص٣٢٢ـ ٣٢٤.

- (١٢) ئايەت باسی كشتوكاڵ ئەكات.
- (٣٦) ئايەت باسی زيندەوەرزانی ئەكات.
- (٧٣) ئايەت باسی جوگرافيای گشتی ئەكات.
- (١٠) ئايەت باسی زانستی مێژووی وەچەكانی مرۆڤ ئەكات.
- (٢٠) ئايەت باسی چینو توێژەكانی زەوی ئەكات.
- (٣٦) ئايەت باسی زانستی گەردوون و مێژووی رووداوە گەردوونییەكان ئەكات.
- (٦٤) ئايەتيش بە گشتی باسی گەورەيی زانستو زانايان و بە شوێن زانست رۆيشتندا ئەكات.[1]

چەندان زانستی تر هەيە كە بەردەوام دەرئەكەوێت و قورئان پێشتر ئاماژەی بۆ كردوون وەك (طب)و (ئەندازە)و (ئەندازەی بۆ ماوەيی) و (پاراسايكۆلۆجی) و (دەروونزانی) و (خەوپەرژين)و (چارەسەری نەخۆشی) و (زانستی ئيحائات).. هتد.

ئەم قورئانە كەسانێكی ئەوێ لەبەردەم وشەو رستەكانی قورئاندا بوەستن و بۆ مانا و مەبەست و فەلسەفەكانی بگەڕێن.. دكتۆر عەبدولمەجيد ئەلزەنەدانی ئەڵێ: ئەم ئايەتەم خوێندەوە (**كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعاً بِالنَّاصِيَةِ * نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ * فَلْيَدْعُ نَادِيَه * سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ * كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ**) (**العلق: ١٥ـ ١٩**). واتە: شتی وانييەو نابێ، سوێندی وابێت، ئەگەر وازنەهێنێ ناوچەوانی بە توندی ئەگرين، ناچەوانێكی درۆزنی خەتاكار، با بێ منەت بێت كێی هەيە لە پێڕی خۆی بانگی بكات و پاش ئەو ئێمەش "زەبانيە"كان بانگ ئەكەين، شتی وا نابێ، تۆ بە گوێی (ئەو ناوچاوە درۆزنە خەتاكارە) مەكەو كڕنووش بۆ خوا بەرەو خۆتی لێ نزيك بكەرەوە.. جا (دكتۆر زەنەدانی) ئەڵێ: زۆر بيرم لەم ئايەتە ئەكردەوە، خوای گەورە بۆ بە (درۆزنو خەتاكار) وەسفی ناوچەوان ئەكات؟ زۆر لە خوا پاڕامەوە فەلسەفەی ئەم ئايەتەم بۆ رۆشن بكاتەوەو زياد لە دە ساڵ بەو ئايەتەوە سەرقاڵ بوومو بە شوێن حيكمەتو مەبەستەكەيدا ئەگەڕام، هەرچی تەفسير هەبوو خوێندمەوە، بە نزيكەيی هەموويان ئەيانووت: ئەم وەسفە شتێكی (مەجازی)يەو مەبەست پێی خاوەنی ناوچەوانەكەيە، واتە كابرا درۆزنو خەتاكارەكە.. نەك (ناوچەوانەكە) شوێنی خەتاكردنو درۆكردن بێت. پاش ئەو ماوە زۆرە لێكۆڵينەوەيەكی زانستی زانايەكی (كەنەدی)

[1] القرآن منهل العلوم، الدكتور المهندس خالد فائق العبيدي، ص١٥١.

م كەوتە چنگ كە دەریخستووە ئەو بەشە مۆخەی سەر كە راستەوخۆ ئەكەوێتە ژێر "ناوچەوان" بەرپرسە لە (درۆكردن)و (خەتا كردن)! لەوێوە بڕیاری خەتاكردنو درۆكردن دەرئەچێت و چاوو گوێش هەر بەو ناوچەیە كاری خۆیان ئەكەن.. وتم: سبحان الله!یەك پیت كە (ها)[1]یە لە دوو وشەی (**كاذبة، خاطئة**) چۆن بوەتە مایەی عەودالكردنی زانایانو وایان لێدەكات بەشوێن حیكمەتو نهێنییەكاندا بگەڕێن[2]..

بە راستی ئەم قورئانە گەورەیە، بەراستی پڕە لە حیكمەتو نهێنی، ئەو خەڵكانەش كە شوێن ئیسلام ناكەون لەبەرئەوە نییە كە بەڵگەیان دەست ناكەوێت لەسەر بوونی خواو گەورەیی قورئان، بەڵكو وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: (**وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ * وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ**) (**الذاريات : ٢٠- ٢١**). بەڵام هۆكەی ئەوەیە كە خوای گەورە ئەفەرموێت: (..**وَمَا تُغْنِي الآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لاَّ يُؤْمِنُونَ**) (**يونس: ١٠١**). واتە: ئایەتو بەڵگەی زۆر و ترساندنو ئینزاركردنیش كەڵكی میللەتو خەڵكانێك ناگرێت كە بڕیاریان داوە ئیمان نەهێنن!!

---

[1] بەپێی تەفسیری زانایانی كۆن بێت كە وەسفەكە (مەجازی) بێتو (حەقیقی) نەبێت ماناكەی وای لێدێت: (ناصية كاذب خاطئ)، نەك (ناصية كاذبة خاطئة..). بەڵام دیارە ئەو (ها)یە، یان ئەو (تا)یە بێ حیكمەت نییەو ئەو راستییە زانستییە وردەی هەڵگرتووە كە لە چەرخی بیستی زانینییدا كەشف ئەكرێت!!

[2] موسوعة الأعجاز العلمي، ص١٦٥.

# بەشی سێیەم:
# زانستەکانی قورئان

## دەروازەیەك

ئەم قورئانە جێگەی گرنگیدانی هەموو مسوڵمانێك بووەو هەرواش ئەمێنێـەوە تا دونیا دونیایە.

لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) جۆرە گرنگیدانێك بە قورئان هەبووە و لەسەردەمی صەحابە و خەلیفەکانی ڕاشدیندا جۆرێك و لە سەردەمی تابعین و دوای ئەوانیشدا جۆرێکی تر و لە سەردەمانەشدا جۆرێکی تر گرنگیدان هەیە بە قورئان.

* پێغەمبەر (ﷺ) کاری ئەوە بوو مانا و مەبەستەکانی ئەم قورئانە بگەیەنێتە خەڵکی و بۆیان تەفسیر بکات و ئەوانیش لەبەری بکەن و لێی تێبگەن و کاری پێبکەن. ئەنەسی کوڕی مالیك ئەفەرموێ (**کان الرجل منا اذا قرأ البقرة وآل عمران جد فینا**) واتە: هەرکەسێك لە ناوماندا سورەتی "**البقرة**" و "**آل عمران**"ی بخوێندایە و لەبەری بکردایە[1] زۆر گەورە ئەبوو لە لامان, عەبدوڵڵای کوڕی عومەر هەشتساڵ خەریکی لەبەرکردنی سورەتی (**البقرة**) بوو.[2]

* خەلیفەکانی ڕاشدینیش گرنگی زۆریان بە نووسینەوەی قورئان و گەورە ڕاگرتنی قورئان و بڵاوکردنەوەی مانا و مەبەستەکانی قورئان ئەدا, لەسەردەمی ئەبوبەکردا بۆ یەکەمجار کۆکرایەوە لەیەك (مصحف)دا و لەسەردەمی عوسماندا چەند نوسخە لەو موصحەفە وەرگیرا و دابەشکرا بەسەر هەرێمە ئیسلامییەکاندا و خەڵکی فێر کرا لەو قورئانەدا بخوێننەوە و ئەوپەڕە قورئانانەی تری لای خۆیان بدڕن و بیسوتێنن.

* لەسەردەمی (عەلی)دا, "**ئەبو ئەسوەدی دؤلی**" هەستا لە ڕووی زانستی (نحو)ەوە سەر و بۆری بۆ قورئان دانا, تا بەڕاستی بخوێنرێتەوە و ئەو کارەی بوویە هۆی دەرکەوتنی "زانستی ئیعرابی قورئان".

---

[1] لە زاراوەی ئەصحابدا "قرأ" بە مانای لەبەر کردن دێت وەك لەسەرەتاوە باسمان کرد و سەرچاوەکەیمان هێنا.

[2] مناع القطان (ص٣٣٨) و فەرمودەکەش لە (الموطأ) دایە.

* پاش ماوەیەك زانستی تەفسیری قورئان لە ناو صەحابە و تابعیندا گەلاڵە بوو, بە ناوبانگترین کەس لە تەفسیر کردندا بریتی بوون لە "چوار خەلیفەکە" و ئیبن مەسعود و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و ئوبەیی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ثابت و ئەبو موسای ئەشعەری و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر.

لەناو تابعینیشدا بە ناوبانگترین تەفسیرزانەکان بریتی بوون لە:

* سەعیدی کوڕی جوبەیر, موجاهید, عەکریمە و طاوسی کوڕی کیسانی یەمانی و عەطای کوڕی ئەبی ڕەباح "کە هەموو قوتابی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس" بوون لە مەککە.

* زەیدی کوڕی ئەسلەم و ئەبولعالیە و محمدی کوڕی کەعبی قورەظی کە هەموو قوتابی ئوبەی کوڕی کەعب بوون لە مەدینە.

* عەلقەمە و مەسروق و ئەسوەدی کوڕی یەزید و عامری شەعبی و حەسەنی بەصری و قەتادە کە هەموویان قوتابی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بوون لە عێراقدا.

* لەم پیاوانەوە و بەدەماودەم زانستی "تەفسیر" و زانستی" غەریبی قورئان" و زانستی "اسباب نزول" و زانستی "مەککی و مەدەنی" و زانستی "ناسخ و مەنسوخ" ئەگوازرایەوە.

* لە سەدەی دووەمی کۆچیدا کە پێی ئەوترێ "چەرخی نووسینەوە = عصر التدوین" دەستکرایە نووسینەوەی "حەدیس"و نوسینەوەی "تەفسیری قورئان" کە وەك "باب"ێك لە کتێبەکانی حەدیسدا ئەنووسرایەوە، بەڵام تاکە تەفسیرێك مابێت لەو سەردەمانەوە تەفسیری "عبدالرزاق کوڕی همام"ە کە ساڵی (٢١١) کۆچی وەفاتی کردووە.

* پاشان زانایان دەستیان دایە نووسینەوەی تەفسیر بە تەواوی لەوانە: ئیبن جەریری طەبەری کە ساڵی (٣١٠)ی کۆچی وەفاتی کردووە.

* پاشان کتێبی سەربەخۆ ئەنووسرا لە زانستەکانی قورئاندا وەك "اسباب نزول"ی عەلی کوڕی مەدینی ـ مامۆستای ئیمامی بوخاری کە ساڵی (٢٣٤)ك مردووە و ئەبوعبیدی کوڕی سەلامە لە "ناسخ و مەنسوخ"دا کتێبی دانا کە ساڵی (٢٢٤)ك مردووە و ئیبن قوتەیبە لە "مشكل القرآن"دا کتێبی دانا کە ساڵی (٢٧٦)ك مردووە کە هەموو ئەمانە لە ڕیزی زانایانی سەدەی سێیەمدا باس ئەکرێن.

* موحەممەدی کوڕی خەلەفی کوڕی مەرزەبان کە ساڵی (٣٠٩) کۆچی مردووە کتێبی "الحاوي فی علوم القرآن" دانا و "ئەبوبەکری کوڕی قاسمی ئەنباری کە ساڵی (٣٢٨)ك

مردووه کتێبی "**علوم القرآن**"ی دانا و ئەبوبەکری سەجستانی کە ساڵی (٣٣٠) کۆچی مردووه "**غريب القرآن**"ی دانا و **محمدی کوڕی علی** ئەفەوی کە ساڵی (٣٨٨) کۆچی مردووه "**الاستغناء فی علوم القرآن**"ی دانا, هەموو ئەم زانانە لە ریزی زانایانی سەدەی چوارەمدا باس ئەکرێن.

* نووسین لەسەر زانستەکانی قورئان بەردەوام بوو, ئەبوبەکری باقەلانی (٤٠٣)ك, "**اعجاز القرآن**"ی دانا و (عەلی کوڕی ئیبراهیمی حوفی)ش (٤٣٠)ك "**اعراب القرآن**"ی دانا و ماوەردی (٤٥٠)ك "**امثال القرآن**"ی دانا و عززی کوڕی عبدالسلام (٦٦٠)ك, "**مجاز القرآن**"ی دانا و, علم الدین السخاوی (٦٤٣)ك "**علم القراءات**" دانا و ئیبن قەیمی جەوزیە (٧٥١)ك "**اقسام القرآن**"ی دانا و ئەمانە هەریەکەیان باسی زانستێك ئەکەن لە زانستەکانی قورئان, بەڵام وەك "زورقانی" ئەڵێ: تاکە کتێبێك کە هەموو زانستەکانی باس کردبێت ئەو کتێبەی "علی کوڕی ئیبراهیمی حوفی"یە کە ناوی "البرهان فی علوم **القرآن**"ە و (٣٠) بەرگە! و تەنیا (١٥) بەرگی ماوە.[1] پاش ئەم ئیبن الجوزی (٥٩٧)ك کتێبی "فنون الافنان فی عجائب **القرآن**"ی دانا و پاشان زەرکەشی (٧٩٨)ك کتێبێکی دەوڵەمەندی دانا لەزانستی قورئاندا و ناوی نا (**البرهان في علوم القرآن**) کە پاشان لە چوار بەرگدا بڵاوکرایەوە لەلایەن مامۆستا (**محمد ابوالفضل** ابراهيم)ەوە.

پاشان **سیوطی** (٩١١)ك کتێبی "**الاتقان في علوم القرآن**"ی نووسی.

* ئەم گرنگی دانە بە قورئان تا ئێستاش هەر بەردەوامە و هەر زانایەك زانستێکی تایبەتی قورئان سەرنجی ڕادەکێشێ و لەو بارەیەوە کتێبێك ئەنووسێت, بۆ نموونە:

- **مصطفى** صادق الرافعی "**اعجاز القرآن**" ئەنووسێ و
- سيد **قطب** " **التصوير الفني في القرآن**" و "**مشاهد القيامة في القرآن**" ئەنووسێ و
- **محمد مصطفى المراغي** "ترجمه **القرآن**" ئەنووسێ و
- **محمد** عەبدوڵڵا ئەلدەراز "**النبأ العظيم**" و "دستور الاخلاق فی **القرآن**" ئەنووسێ و
- جمال الدين القاسمی "**محاسن** التأويل" ئەنووسێ و
- **طاهری** جەزائری "التبيان فی علوم **القرآن**" ئەنووسێ و
- زورقانی "مناهل العرفان فی علوم **القرآن**" ئەنووسێ و

---

[1] مناهل العرفان في علوم القرآن، (٢٧/١).

ـ صوبحی صالّح "**مباحث فی علوم القرآن**" ئەنووسێ و

ـ مناع القطان "**مباحث فی علوم القرآن**" ئەنووسێ و خەڵکی تریش هەر بەردەوامە.

لەمانەوە ئەگەینە ئەوەی کە زانستەکانی قورئان یانی ئەو زانستەی باس لە هەموو ئەو باس و خواستانە ئەکات کە پەیوەندن بە قورئانەوە وەك نووسینەوەی قورئان و ڕێکخستنی و بڵاوکردنەوەی و زانینی هۆیەکانی دابەزینی ئایەتەکان و شوێنی دابەزینەکانیان وەك مەککە و مەدینە و زانستی ناسخ و مەنسوخ و ئیعجاز و موحکەم و موتەشابهو موشکەل و "عام" و"خاص" و "**مطلق**" و "مقید" و ...هتد.

جا ئێمە لە خوارەوە هەوڵ ئەدەین دیارترین زانستەکانی قورئان بنووسین, ئەوانەی کە تا ڕادەیەك بۆ ئەم بەرە تازە پێگەیشتوەی کورد بە سوودی ئەزانین و لەولاشەوە بە یەکێك لە زانستە پێویستەکانی قورئان دائەنرێت.

## باسی یەکەم: زانستی چاك خوێندنەوەی قورئان "علوم التجوید"

ئەم زانستی چاك خوێندنەوەی قورئانە پێشی ئەوترێ "زانستی قورئان خوێندن" (علم **التلاوة**)، مەبەستیش ئەوەیە قورئان وەها بخوێنرێتەوە کە ماف بە هەموو پیتو وشەکان بدرێتو بە راستی دەربڕێت...

زانستی (تجوید) لە پێنج تەوەرەی گەورەدا کورت ئەبێتەوە:

تەوەرەی یەکەم: شوێنی دەرچوونی پیتەکان.

تەوەرەی دووەم: یاساکانی (نون)و (تەنوین).

تەوەرەی سێیەم: یاسای مەددەکان.

تەوەرەی چوارەم: یاساکانی (ڕێ).

تەوەرەی پێنجەم: حاڵەتەکانی (قەلقەلە).

### یەکەم: شوێنی دەرچوونی پیتەکان (مخارج الحروف):

پیتەکانی زمانی عەرەبی هەریەکەیان لە شوێنێکی دەمەوە دەردەچن، هەیە لەسەر زمانو هەیە لە لووتەوەو هەیە لە قوڕگەوە دەردەچێت... و بەوشێوەیە. بە کورتی شوێنی دەرچوونی پیتەکان پێنج شوێنە:

١ـ لووت
٢ـ هەردوو لێو
٣ـ زمان
٤ـ قوڕگ
٥ـ بۆشایی ناو دەم

**هەندێ تێبینی:**

١ـ سەری مرۆڤ وەك خانوویەكی گەورە وایە لە پێنج قاتێك دروست بووە، هەر قاتەی چەند ژوورێكی تێدایەو هەر ژوورەی چەند كەسی تێدایە، كەسەكان بریتیین لە پیتەكانو ژوورەكان بریتین لە شوێنی دەرچوونەكان (**مخارج الحروف**).

٢ـ ئەو پیتانەی یەك (**مخرج**) یان هەیە، یان نزیكن لە یەكتری (مەرج نییە) هەموو جارێ (دەغم) بن، بەڵكو تەنیا لە نێوان (ق)و (كاف)و لە نێوان (ل)و (**راء**)و لە نێوان (ن)و (ل)و (را)دا، ئیدغام دروست ئەبێت.

٣ـ ئەگەر (ل)ی ساكین (زەنەدار) بە دوایدا نونی بزواو هات، خوێنەر ئاگای لێ نەبێ (دەغم) روودەدات وەك (**قلنا، فهل نجعل**) (**أجعلنی**).

بۆیە پێویستە خوێنەری قورئان ئاگای لەمە بێتو (دەغمی) نەكات.

٤ـ هەروەها پێویستە (**ض**)ی ساكن كە (**ت**) یان (**طا**) بە دوایدا هات، جوان دەرببڕێتو دەغم نەكرێت وەك (**وخضتم، اضطرُه**).

٥ـ ئەكرێ لە (**تجوید**)دا باسی شەش جۆر (**ئیظهار**) بكرێ:

ـ **ئیظهاری** حەلقی.

ـ **ئیظهاری** شەفەوی.

ـ **ئیظهاری** موتڵەق لە یەك وشەدا.

ـ **ئیظهاری** (متقارب)و (متجانس)و (**متماثل**) وەك (**یلهث ذلك**)و (**وقالت طّائفة**) (**یوجهه**).

ـ **ئیظهاری** موتڵەق لە دوو وشەدا

ـ **ئیظهار** لە پیتە نزیكەكاندا[1] وەك: (**كذبت ثمود**)و (**وقد ضلّوا**).

[1] ئەمەیان تەنیا لای حەفصی قورئان خوێن هەیە.

٦- بەهەمان شێوە ئەکرێ لە زانستی تەجوید دا ئیدغامەکانیش بکەینە حەوت جۆر:
- ئیدغامی غوننەدار.
- ئیدغامی بێ غوننە.
- ئیدغامی شەفەوی.
- ئیدغامی (**متماثلین**) جگە لە (میم).
- ئیدغامی (متجانسین).
- ئیدغامی (متقاربین).
- ئیدغامی گەورە (واتە دوو پیتی بزواو)[1] وەك: (**الرحیم، مالك، النفوس زوجته**).

ئیدغامێکی تریش هەیە کە ئەوە هەموو کەس ئەیزانێو سەلیقەی بۆی ئەچێ وەك (ئیدغامی لامی شەمسی) لە کاتی خوێندنەوەدا.

## تەوەرەی دووەم: یاساکانی (نون) و (تەنوین)

"نون" واتە هەموو ئەو "نونانەی" کە زەنە (سکون)یان هەیەو (تەنوین)یش یانی هەموو ئەو حاڵەتانەی کە دوو بۆر (ــٌـ) یان دوو ژێر (ــٍـ) یان دوو سەر (ــً) ی تێدا دروست ئەبێت کە وشەکە وا ئەخوێنرێتەوە وەك ئەوە وایە (نونێکی ساکن) لکابێت بە کۆتاییەکەیەوە بۆ نموونە:
- غفورٌ بەم شێوەیە ئەخوێنرێتەوە: "غفورُن".
- حمیمٍ بەم شێوەیە ئەخوێنرێتەوە "حمیمن".
- قلیلاً بەم شێوەیە ئەخوێنرێتەوە "قلیلن".
- حاڵەتەکانی خوێندنەوەی "نونی ساکین" یان "تەنوین": ئەم نونانە یان ئەم تەنوینانە چوار حاڵەتیان هەیە:

یەکەم: **ئیظهار**.

دووەم: ئیدغام.

سێیەم: ئیقلاب

چوارەم: ئیخفا، یان ئیخفات.

[1] هەرچەند لای حەفص ئەمەیان بە دروست نازانێ.

١ـ **ئیظهار:** واته دەرخستنو دەربڕین، مەبەستیش ئەوەیە هەرکات لە دوای نونی ساکین یان تەنوینەکان (ـٌـٍـً) یەکێك لەم شەش پیتە هات (أ، ه، ع، غ، ح، خ)، ئەوا بە جوانی نون، یان تەنوینەکە دەرئەخرێت، وەك:

ـ **من آمن .. ینأون عنه. ولا شرابا ألا** (أ) و (ه).

ـ **أن هذا ... ینهون عنه لکل قومٍ هاد** (ه).

ـ **حکیمٍ علیم ... من علم, سمیعٌ علیم** (ع).

ـ **من غیر سوء... غفورٌ رحیم .. حدیثٍ غیره** (غ).

ـ **من حکیم ... عینٍ حمِئة... علیماً حکیما** (ح)

ـ **من خیر... لطیفٌ خبیر ... یومئذٍ خاشعة** (خ).

زانایان ئەفەرموون ئەو شەش پیتە ناویان (پیتەکانی **ئیظهارە**)و لەسەرەتاکانی وشەکانی ئەم رستەیەدا کۆدەبنەوە (**أخي هاك علماً حازه غیر خاسر**).

٢ـ ئیدغام: واتە: تێکەڵبوونی نونی ساکین یان تەنوینەکان لەگەڵ ئەم شەش پیتەدا ئەگەر بە دوای یەکتردا هاتن، واتە ئەگەر (ی، ر، م، ل، و، ن) دوای نونی ساکین یان تەنوینەکان هاتن ئەوە دەغم ئەبن لەگەڵیانداو (نونەکان) ناخوێنرێنەوە، وەك:

من **یشاء** .. ئەبێتە: **میّشاء**، واتە نونەکە ئەرژێتە ناو یائەکەوە لە جیاتیدا (ّ)یەك دروست ئەبێت.

ـ **فمن یعمل = فمیّعمل، وجوه یومئذٍ = وجوهیّومئذٍ**.

ـ من **نشاء**، ئەبێتە **منّشاء**، واتە نونی ساکینی یەکەم دەغم ئەبێت لە نونی دووەمداو لە جیاتی ئەوەدا (شدّە)یەك دروست ئەبێ.

ـ **من نذیر، منّذیر، حطة نغفر = حطتُّنغفر** .

ـ من ملك .. **مّلك**، نونی یەکەم نامێنێو (شدّە) لە جیاتی دائەنیشێ.

ـ **من محیص .. ممّحیص، قولٌ معروف .. قولٌمعروف**.

ـ من ولی.. موّلی، نونەکەی یەکەم نامێنێو (شدّە) لە جیاتی دائەنیشێ.

ـ **من وارءهم .. موّرائهم، هدیً ورحمة.. هدوّرحمة**.

ـ من ربکم .. مرّبکم (نونەکەی نەماوە).

ـ **أن رأه أرّأه، غفوراً رحیما ... غفوررّحیماً**.

ـ من لدنا... ملّدنا (نونەکەی نەماوە).

ـ لئن لم.. لئلّم ، فسلامٌ لك ... فسلاملّك.

پیتەکانی ئیدغام لەم وشەیەدا کۆدەبێتەوە (یرملون).. ئیدغامیش دوو بەشە: ئیدغامی غوننەدارو "ئیدغامی بێ غوننە". واتە: ئیدغامێك کە مینگەیەك لە لوتدا دروست ئەکاتو ئیدغامێك کە ئەو مینگەیە دروست ناکات.

پیتەکانی (ی، ن، م، و) کە لە وشەی (ینمو)دا دەرئەکەون (غوننە) دروست ئەکەن، بەلاّم هەردوو پیتی (ل، ر) کە لەوشەی (لر) دا دەرئەکەون (غوننە) دروست ناکەنو سەیری نموونەکانی پێشوو بکەرەوە...

**٣ـ** ئیقلاب: بریتییە لە هەڵگەڕانەوەی نونی ساکین یان تەنوینەکان بۆ پیتی (م) کاتێك کە بگەنە پیتی (ب).... وەك:

ـ من بعد.. ممبعد، واتە ئەبێتە ممبعد، نونەکەی ئەبێتە (م).

ینبغی... یمبغی، خبیرٌ بصیر... خبیرمبصیر، سمیعاً بصیرا... سمیعمبصیرا.

**٤ـ** ئیخفا، یان ئیخفات: بریتییە لە شاردنەوەی نونی ساکین یان تەنوین کاتێك ئەم پیتانەی تر لە دوایەوە دێن (ص، ذ، ث، ك، ج، ش، ق، س، د، ط، ز، ف، ت، ض، ظ) کە هەموویان لە سەرەتای وشەکانی ئەم رستەیەدا هەن:

**صف ذا ثنا كم جاد شخص قد سما**

**دم طيبا زد في تقى ضع ظالما**

راستی ئیخفا ئەوەیە کە شوێنی دەرچوونی (نون) نزیك بکەیتەوە لە شوێنی دەرچوونی پیتەکەی دوای خۆی ئیتر لێبگەڕێی چۆن (دیارنامێنێ)، واتە: کە ئەبینی لە دوای نونی ساکینەوە یان تەنوینەوە بۆ نموونە (ق) هاتووە تۆ پێویستە دەربڕینی نونەکە نزیك بکەیتەوە لە دەربڕینی (**تلفظ**)ی (قافەکە)وە، (نون) بە پێی (شوێنی دەرچوونی پیتەکان لەسەر زماندایە)و (قاف)یش بە پێی شوێنی دەربڕینی پیتەکان لە قوڕگدایە. کەواتە پێویستە دەربڕینی نونەکە نزیك بکرێتەوە لە قافەکەوەو بوترێ (من قبل) .... بڕوانە چۆن پیتەکانی ئیخفا لەم وشانەدا ئەبینرێ : "**ینصرکم، ریحاً صرصرا، من ذا الذي، باسط ذراعیە، أنثی، یوماً ثقیلا، أفمن کان، من جاء، منشورا، بأس شدید، کأساً دهاقا، أنتم، منضود، أنظر، ظلاً ظلیلا**"...

**هەندێ تێبینی گرنگ:**

**١- ئیظهار** لە وشەیەکدا و لە دوو وشەی یەك بە دوای یەکیشدا دروست ئەبێت، بە هەمان شێوە ئیقلابو ئیخفاش، بەڵام ئیدغام هەرئەبێ لە دوو وشەدا بێتو لە یەك وشەدا ئیدغام دروست نابێت وەك (دنیا) (صنوان)، بۆ نموونە.

**٢- ئیظهاری** رەها **(الإظهار المطلق)** لە یەك وشەدا هەبێت تەنیا لە حەوت وشەی قورئاندا هەیە کە چواریان یەك توخمنو بیتین لە (بنیان)و (**بنیانه**)و (بنیانهم)و (بنیانا)، سیانەکەی تر بریتین لە (قنوان)و (صنوان)و (دنیا)..

**٣- ئیظهاری** موتڵەق لە دوو وشەدا هەبێت تەنیا لە دوو ئایەتدا هەیە (**یس والقرآن الحکیم**) لەگەڵ (ن والقلم **وما یسطرون**).

واتە نابێت (نونی) سینی (یاسینەکە) دەغم بکرێت لەگەڵ (واو)ەکەی دوای خۆیداو بە هەمان شێوە نابێ نونی سورەتی (القلم)یش لەگەڵ (واو)ی دوای خۆیدا دغم بکرێ، واتە ناتوانی بڵێی (**یاسیوَالقرآن الحکیم**)، یان بڵێی (نو وّالقلم).. بەڵکو ئەبێ بڵێی (**یس والقرآن الحکیم**) و (ن والقلم وما **یسطرون**).

**٤- جۆرێکی** تریش "دەغم"و تێکەڵبوون هەیە کە تێکەڵبوونی دوو پیتی (وەك یەك)، یان (نزیك لەیەك)، یان چوون یەك هەیە، کە کاتێك "دەغم" دروست ئەبێت کە یەکەمیان (زەنەدار) بێت و دووەمیان (بزواو) بێت:

* وەك یەك: واتە: دوو (**باء**) یان دوو (دال) یان دوو (سین).. هتد.

* نزیك لەیەك: واتە: شوێنی دەرچوونی ئەو دوو پیتە نزیك بن لە یەك وەك: (کاف)و (قاف)، یان (لام)و (**راء**).

* یەك جنس بن: وەك (دال)و (**تاء**)و (**ذال**)و (**ظاد**)و (**طاء**)و (**تاء**)، (**باء**)و (میم).

* بەیەکەمیان ئەوترێت "ئیدغامی موتەماسیلەین" (**إدغام المتماثلین**)، وەك:

**- قد دخلوا... قدّخلوا.**

**- اضرب بعصاك ... إضربّعصاك.**

**- ربحت تجارتهم .. ربحتّجارتهم.**

**- یدرککم .. یدرکّم.**

واتە: پیتی یەکەم کە (زەنە)ی هەیە ئەچێتە ناو پیتی دووەم کە بزاوەو (**متحرّك**)ەو هەردووکیان ئەبنە یەك پیتی (**شدّە**)دار.

* به دووه‌میان ئه‌وترێت (إدغام المتقاربين)، وه‌ك:

(نخلقكم)، ئه‌بێته: (نخلكّم)، قافه‌كه تێكه‌ڵ به كافه‌كه ئه‌بێت.

**(بل رفعه الله)**، ئه‌بێته: **(برّفعه الله)** لامه‌كه تێكه‌ڵ به رائه‌كه ئه‌بێت.

(وقل ربی زدنی علما)، ئه‌بێته: (وقرّبی) لامه‌كه تێكه‌ڵ به رائه‌كه ئه‌بێت.

* به سێیه‌میان ئه‌وترێت (إدغام المتجانسين) وه‌ك:

قد تبين .. قتّبين

عبدتم .. عبتّم

أجيبت دعوتكما .. أجيبدّعوتكما.

هه‌ندێ له زانایان به ئیدغامی (متجانس)و **(متماثل)** (متقارب) ئه‌ڵێن: (إدغام كامل)، ته‌نیا له حاڵه‌تی (ق)و (ك)دا نه‌بێت كه ئه‌وترێت (إدغام ناقص)، هه‌روه‌ها له حاڵه‌تی **(ط)**و (ت)دا نه‌بێت وه‌ك **(بسطت)**، **(فرطت)** كه ئه‌م دوو حاڵه‌ته پێی ده‌وترێت (ئیدغامی ناقیص)، چونكه به ته‌واوی ده‌غم نابێت.

## ته‌وه‌ره‌ی سێیه‌م: یاساكانی "مه‌دده‌كان"

مه‌دده: واته درێژكردنه‌وه‌ی هه‌ر سێ پیتی (ی)و (ئه‌لیف)و (واو) كه پێیان ئه‌وترێت (پیته‌كانی مه‌دد)، (حروف المد)و مه‌رجه‌كانیشی ئه‌وه‌یه كه پێش (ئه‌لیفه‌كه) (سه‌ر = **فتحه**) هه‌بێت‌و پێش (یائه‌كه) (ژێر = كسر) هه‌بێت‌و پێش (واوه‌كه) (بۆر = **ضمة**) هه‌بێت، واته ئه‌گه‌ر وانه‌بوو ئه‌وه درێژ ناكرێنه‌وه وه‌ك **(سَوء)** بۆ نموونه.

مه‌دده‌كان به گشتی دوو جۆرن:

١ـ مه‌ددی ئه‌صلی.

٢ـ مه‌ددی فه‌رعی

مه‌ددی ئه‌صڵی بریتییه له (مه‌ددی سروشتی) واته هه‌رسێ پیته‌كه‌ی "مه‌دد" به سروشتی ده‌ربڕرێن، وه‌ك (قال) بۆ ئه‌لیف‌و (یقول) بۆ (واو)و (قیل) بۆ **(یاء)**.

رێژه‌ی درێژكردنه‌وه‌كه‌شی بریتییه له دوو جوڵه‌ی په‌نجه كه سه‌روخوارێكی پێ بكه‌ی.

بۆیه‌ش پێی ئه‌وترێت (سروشتی)، چونكه سروشتی ساغی هه‌موو كه‌سێ ئه‌و وشانه به (مه‌دده)وه ئه‌خوێنێته‌وه، واته به (قال) ناڵێ: **(قَلَ)**، یان به (یقول) بڵێ: **(یقُلُ)**، یان به (قیل) بڵێ: **(قِلٌ)**.

"مەددی فەرعی" یش ئەکرێتە دوو بەشی سەرەکی:

بەشی یەکەم: مەددی **عاریض**

بەشی دووەم: مەددی لازم

"مەددی لازمەکە"شی ئەبێتە دوو بەشی تر:

(لازمی قورس)و (لازمی سووك).

هەندێ لە زانایان راستەوخۆ (مەدد) ئەکەن بە سیازدە بەشەوە:

١ـ **المد الواجب المتصل**: ئەو وشەیەیە، پیتی مەددەکە و (همزە) لەیەك وشەدا بێت، وەك: **"جآء، سوُء، شآء، سیئ)**.

٢ـ **المد الجائز المنفصل**: ئەو وشەیەیە کە پیتی (مەددەکە) و (هەمزە) لە دوو وشەدا بن و (فصل) کەوتبێتە نێوانیان، وەك: **"یآأیهاالناس، قُوا أنفُسَکُمْ)**.

٣ـ **المد العارض للسکون**: ئەوەیە کە لەسەر وشەکە وەستایو سکون دروست بوو، پیتی پێش وەستانەکە پیتی (مد) بێت، وەك: (**عقاب، خالدون، خبیر**).

٤ـ **المد البدل**: ئەوەیە (همزە) پێش پیتی (مد)ەکە بکەوێت، وەك: **"آدم، إیمان"**.

٥ـ **المد العوض**: بریتییە لە وەستان لەسەر (تەنوینی سەر = فتحە) وەك (**علیماً، حکیماً**).

٦ـ **المد اللازم المثقل الکلمي**: بریتییە لەوەی دوای (حرفی مد) پیتێکی (مشدد) بێت، وەك: (**الضالّین، الصاخّة، الطامّة**).

٧ـ **المد اللازم المخفف الکلمی**: بریتییە لەوەی دوای پیتی (مەددەکە) سکون بێت، وەك: (**آلْآن**) کە لە سورەتی (یونس)دا دووجار هاتووە.

٨ـ **المد اللازم المثقل الحرفي**: وەك سەرەتای سورەتەکان: بریتییە لە هەشت پیت کە رستەی (**نقص عسلکم**) هەمووی کۆدەکاتەوە، کە بریتین لە ئایەتەکانی (ص)و (مریم)و (ق)و (شوری)و (یس). (**الم، المر، ن، ص، کهیعص، حم،..**).

٩ـ **المد اللازم المخفف الحرفي**: بریتییە لە پێنج پیت کە رستەی (**حي طهر**) کۆیان ئەکاتەوە وەك (**حم، یس و طه و الر**).

١٠ـ **المد اللین**: بریتییە لە دوو پیت (واو)و (یا و) بەو مەرجەی خۆیان (سکون = زەنە)یان ببێتو لە پێشەوەیان (فتحە) ببێت وەك: (**بَیت، خَوف**).

١١ـ المد الصله: بريتييه له درێژكردنەوەی **(هاء)** كاتێك كه (همزه)، يان (پيتێكی بزواو) به دوايدا بێت، وەك: **(أنه كان)**، يان **(له مافي السموات)**، ئەميش دوو جۆری هەيه: (صلەی كبری)و (صلەی صغری)، ئەگەر (همزه) هات ئەو (كبری)يەو ئەگەر پيتی بزواو بوو ئەوە (صغری)يه.

١٢ـ المد الفرق: (مەددێكی شازه)و تەنيا له چوار شوێنی قورئاندا هەيه **(آذكرين)**، **(آللّه خير)**، **(قُلْ آللّهُ أذِنَ لَكُمْ)**.

١٣ـ المد التمكين: هەموو دوو (يائێك) به دوای يەكدا بێن يەكێكيان (ساكن) بێتو له پێشەوە (كەسره) ی هەبێت وەك (حييتم) (النبيين).

رێژەی درێژكردنەوەی هەريەك لەو سيازده (مەددانه)ی سەرەوه بەم شێوەيەن:

١ـ پێنج جووڵه (خمس حركات).

٢ـ دوو جووڵه، يان چوار، يان پێنج جولّه.

٣ـ شەش جولّه، يان چوار، يان دوو، باشتروايه شەش جووڵه بێت.

٤ـ دوو جووڵه.

٥ـ دوو جووڵه.

٦ـ به سێ ئەليفو شەش جووڵه.

٧ـ به سێ ئەليفو شەش جووڵه.

٨ـ به سێ ئەليف، يان دوو ئەليف ئەخوێنرێتەوە.

٩ـ دوو جووڵه.

١٠ـ چوار جووڵه.

١١ـ دوو جووڵه بۆ (صغری)و (شەش) جووڵه بۆ (كبری).

١٢ـ چوار جووڵه.

١٣ـ دوو جووڵه.

## تەوەرەی چوارەم: ياساكانی (ڕێ)

پێتی "ڕێ" يان (راء) به سێ شێوه له قورئاندا ئەخوێنرێتەوە:

يەكەم: به باريكی.

دووەم: به قەڵەوی.

سێیەم: دروستە بە هەردوو بارەکە.

یەکەم: ڕێی قەڵەو

* هەر کاتێك پیتی (ڕێ) (بۆر، یان سەر)ی هەبوو ئەوە بە قەڵەوی ئەخوێنرێتەوە، وەك: **(رَبنا، رُزقنا)**.

* هەرکاتێك پیتی (رێ) سکونی هەبوو، بەڵام پێش (رێ)یەکە (سەر، یان بۆر) هەبوو ، وەك: **(مرحمةٌ، عرش)** یان **(مرسلین، غرفة، مرضعة)**..

* هەر کاتێك پیتی (ڕێ) سکونی هەبوو، بەڵام پێش (رێ)یەکە هەمزەی وەصڵ هەبوو پێش هەمزەکە (**فەتحە**، یان **ضەممە**) هەبێت، وەك: (إرجعوا الى أبیکم).

* هەر کاتێك پیتی (رێ) سکونی هەبوو، بەڵام دوای (رێ)یەکە یەکێك لە پیتەکانی **(إستیعلاء)**[1] هەبوو، وەك: **(قرطاس، مرصاد، فرقة..)**.

دووەم: ڕێی باریك

* هەرکاتێك (ڕێ) کەسرەی هەبوو، ئیتر لە سەرەتا یان لەناوەڕاستی یان لە کۆتایی وشەدا بێت. وەك **(رِزقا)** **(وفِي الرِقاب)**، **(واذكرِ اسم رَبِك)**

* هەرکاتێك پیتی (رێ)یەکە یەکێك لە پیتەکانی **(لین)** بێت وەك: (قدیر) (خیر).

* کاتێك کە (رێ)یەکە ساکن بێتو پێشەوەی (سکونی ئەصڵی) بێتو بەدوای یائەکەدا پیتی **(استعلاء)** نەیەت وەك: (**انذرهم**، فرعون، مریه).

سێیەم: بەهەردوو بارەکەدا ئەخوێنرێتەوە:

* کاتێك کە (رێ)یەکە سکونی ببێت لە پێشەوە کەسرە (ژێر) ببێتو لەدواشیەوە یەکێك لە پیتەکانی **(إستعلاء)** هەبێت وەك: (فرقه)، **(عين القطر)** (مصر).

## تەوەری پێنجەم: پیتەکانی (قەلقەلە)

قەلقەلە: واتە لەراندنەوەی پیتەکانی قەلقەلە کاتێك زەنەی لەسەر بێت یان بزواو بێت، بەڵام لەسەری بووەستی.

پیتەکانی قەلقەلە پێنج پیتنو لە وشەی **(قطب جد)**دا کۆبوونەتەوە.. بۆ نموونە:

---

[1] پیتەکانی (إستعلاء) حەوت پیتن کە رستەی: (خص ضغط قظ) کۆیان دەکاتەوە.

ـ خلق، الحق، مقتدرا

ـ **لوط، مطلع**

ـ وتب، مريب، يبصرون

ـ بروج، **يجعلون**

ـ عنيد، فقد

**هەندێ تێبینی:**

**١ـ** قەلقەلە دوو جۆرە: "قەلقەلەی گەورە"و "قەلقەلەی بچووك" گەورە وەك ئەو حاڵەتانەی پیتی قەلقەلەکە ئەکەوێتە ناوەڕاستی وشە، بۆ نموونە (**تجعلون**) گەورەش وەك ئەو حاڵەتانەی کە ئەکەونە کۆتایی وشە وەك (بروج، مسد).

**٢ـ** باشوایە لەراندنەوەی (ب)و (ج)و (د) تۆزێك بەلای دەنگی (ژێر = کسرە)دا بچێت، چونکە ئەوانە لە پیتە (نەرمەکانن) وەك (أحد) يبصرون، **يجعلون**، واتە وەك ئەوەی بڵێ (**أحدِ**)یان (**يبِصرون**).

**٣ـ** هەردوو پیتی (**ط**)و (ق) یش باسوایە لەکاتی لەراندنەوەدا بە لای (**بیۆر**) یان (سەر) دا بچن، وەك (اقرأ، **اطعام**) واتە وەك ئەوەی بڵێ (اقرا)یان (**أطَعام**).

**٤ـ** ئەگەر پیتی (قەلقەلە) بە (مشدد)ی کەوتە کۆتایی وشە، پێویستە دەنگی نیوە هەمزەیەکی ساکن وەربگرێ وەك: "الحقّ، الحب، وتب".

ئەمانە بە کورتی بریتی بوون لە یاساو باسو خواستەکانی (تجويد)، هەرچەندە چەند باسو خواستی تر لەم بابەتەدا هەیە، کە لەبەر درێژنەبوونەوەی کتێبەکە ئێمە بە پێویستمان نەزانی باسیان لێوە بکەین، وەك: نیشانەکانی وەستان لەسەر ئایەتەکان (علامات الوقف)، یان باسی سروشتی پیتەکانی زمانی عەرەبی (صفات الحروف)، یان باسی ئادابی قوران خوێندن و رەوشتەکانی قورئان خوێنو چۆنێتی خوێندنەوەی (**بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ**) و (**أستعاذة**)و (لامەکان)و (میمەکان)و هەرکەس ویستی زانیاری زیاتر لەوبارەیەوە پەیدا بکات با هاوڕێیەتی یەکێك لە کتێبەکانی (تجويد) بکات، بۆ نموونە: (فن التجويد)ی (عزت دعاس)، یان (أحکام التجويد **القرآن**) ی (محمد سعيد ملحس)، یان (هدايه المستفيد فی علم التجويد) بکات کە بە درێژی باسی بابەتەکانی (تجويد)یان کردووە.

# باسی دووەم: زانستی تەفسیر

لەم باسەدا سێ بابەت هەیە:

بابەتی یەکەم: مێژوی ئەم زانستە.

بابەتی دووەم: مەرجەکانی کەسی موفەسیر

بابەتی سێیەم: گرنگترین کتێبەکانی تەفسیر، چ کوردییەکانو چ عەرەبییەکان.

## بابەتی یەکەم: مێژوی زانستی تەفسیر

راستە قورئان کتێبێکی عەرەبییە و ماناکانی تا ڕادەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە, کەچی خوای گەورە بە پێغەمبەر **(صلی الله علیه وآله وسلم)** ئەفەرموێ: **(وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ) (النحل :٤٤)**. واتە: ئێمە ئەم قورئانەمان ناردووەتە سەرت بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی ڕۆشن بکەیتەوە کە خوا چی بۆ ناردوون، تا بەڵکو بکەونە بیرکردنەوە. کەواتە کاری پێغەمبەر **(صلی الله علیه وآله وسلم)** لەگەڵ ئەم قورئانەدا بریتییە لە **"**بەیان**"** و ڕۆشنکردنەوەی زیاتری ماناکانی, بۆیە پێغەمبەر **(صلی الله علیه وآله وسلم)** ئەفەرموێ: **"لا انی أوتیت القران مثله معه"**.[١] ئاگاداربن! کە من خوای گەورە وەك چۆن قورئانی پێداوم واش شتێکی تری وەك قورئانی پێداوم, (واتە: سوننەتەکان) ئیمامی شافعیش ئەفەرموێ: **"کل ما حکم به رسول الله فهو مما فهمه من القرآن"**. واتە: هەموو ئەو بڕیارانەی پێغەمبەر **(صلی الله علیه وآله وسلم)** داویێتی, بریتییە لە تێگەیشتنی خۆی بۆ قورئان.

ئەم زانستە **"**واتە زانستی تەفسیر**"** هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە **(صلی الله علیه وآله وسلم)** دەستی پێکردووە و لە سەردەمی ئەصحابەدا: (ڕەزای خوایان لێ بێت) گرنگی دان بە تەفسیر زیادی کرد و لە ناو قوتابیانی صەحابەدا **"**موفەسیری**"** زۆر پەیدا بوون و تا ئەهات گرنگیدان بە تەفسیری قورئان زیاتر ئەبوو تا گەیشتە ئەوەی چەند جۆرێك تەفسیر بۆ قورئان دروست بوو.

---

[1] رواه ابوداود مختصر تفسیر ابن کثیر، (١٢/١):

ـ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) ئەفەرموێ کە ئایەتی: (الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَـئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ) (الأنعام: ٨٢).[١] هاتەخوارەوە خەڵکی زۆر نارەحەت بوون و هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) و عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا جا کاممان زوڵم لە خۆی ناکات؟!

پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەفەرموێ: **"انه ليس الذى تعلمون, الم تسمعوا ما قال العبد الصالح: ان الشرك لظلم عظيم, انما هو الشرك"**.[٢] ئەمە ئەوە نییە ئێوە ئەیزانن، مەگەر گوێتان لە قسەی ئەو پیاوچاکە نەبوو کە ئەڵێ: هاوەڵدانان بۆ خوا ستەمێکی گەورەیە، ئەو ستەمە مەبەست پێی هاوەڵدانانە بۆ خوا.

ـ پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) دەربارەی (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ) (الكوثر: ١) فەرمووی: **"الكوثر نهر أعطانيه ربي في الجنة"**. کەوسەر ڕووبارێکە خوای گەورە داوێتی بە من لە بەهەشتدا.[٣]

ـ لە تەفسیری ئایەتی: (الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَى وُجُوهِهِمْ إِلَى جَهَنَّمَ ..) (الفرقان: ٣٤) دا ئەنەسی کوڕی مالیك ئەفەرموێ: کابرایەك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) و عەرزی کرد: باشە قوربان! کافر چۆن بە دەموچاو ئەڕوات بەڕێوە لە ڕۆژی قیامەتدا؟ پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) فەرموی: **"اليس الذي امشاه على رجلين في الدنيا قادرا على ان يمشيه على وجهه يوم القيامة"**.[٤]باشە کەسێك کە لە دونیادا بتوانێ لەسەر دوو قاچ بیبات بەڕێوە ناتوانێ لە قیامەتیشدا لەسەر دەموچاوی بیبات بەڕێوە؟

ـ لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین و سەردەمی صەحابەدا چەند کەسی تەفسیرزانیان تێدا هەڵکەوت لەوانە: هەر چوار خەلیفە ڕاشدینەکەو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی **ثابت** و ئەبو موسای ئەشعەری و عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر...

---

[1] الانعام/ ٨٢, مانای ئایەتەکەش ئەوەیە: ئەو ئیماندارانەی کە زوڵم تێکەڵ بە ئیمانەکەیان ناکەن هەر ئەوانە بێترس ئەبن و لە سەر ڕێگەی هیدایەت ئەبن.

[2] رواه البخاری.

[3] رواه مسلم واحمد.

[4] رواه البخاری, لە "کتاب التفسیر" دا.

- له ناو تابیعینیشدا قوتابییه‌كی زۆر له ده‌وری ئه‌م صه‌حابه ته‌فسیرزانانه كۆبوونه‌وه و هه‌ریه‌كه‌یان له هه‌رێمێك له هه‌رێمه ئیسلامیه‌كاندا بوونه "مه‌رجه‌ع" بۆ ئه‌م زانسته.

- سه‌عیدی كوڕی جوبه‌یر و موجاهید و عه‌كریمه و **طاوسی** كوڕی كیسانی یه‌مانی و **عه‌طای** كوڕی ئه‌بی ڕه‌باح, له مه‌ككه‌دا و له ده‌وری "عه‌بدوڵلای كوڕی عه‌بباس" كۆبوونه‌وه.

- عه‌لقه‌مه و مه‌سروق و ئه‌سوه‌دی كوڕی یه‌زید و عامری شه‌عبی و حه‌سه‌نی به‌صری و قه‌تاده له عێراقدا له ده‌وری عه‌بدوڵلای كوڕی مه‌سعود كۆبوونه‌وه و بوونه مه‌رجه‌عی هه‌رێمی عێراق.

- زه‌یدی كوڕی ئه‌سله‌م‌و ئه‌بولعالیه‌و موحه‌مه‌دی كوڕی كه‌عبی قوره‌ظی له "مه‌دینه"داو له ده‌وری ئوبه‌ی كوڕی كه‌عب كۆبوونه‌وه‌و بوونه مه‌رجه‌عی ئه‌هلی مه‌دینه‌و چوارده‌وری.

- له سه‌رده‌می نووسینه‌وه‌ی زانسته‌كانیشدا كه به (عصر التدوین) ناو ئه‌برێت، زانایانی ئیسلام ده‌ستیان دایه نووسینی "ته‌فسیری قورئان" به تایه‌بتی ته‌فسیری ئه‌و ئایه‌تانه‌ی كه پێغه‌مبه‌ر (**صلی الله علیه وآله وسلم**) كردوونی، یان صه‌حابه كردوونی، یا یه‌كێك له **تابعین**.. بۆ نموونه:

- یه‌زیدی كوڕی هارون (١١٧ كۆچی مردووه)، یان شوعبه‌ی كوڕی حه‌جاج (١٦٠ كۆچی مردووه)، یان سوفیانی كوڕی عوینه (١٩٨ كۆچی مردووه)، یان وه‌كیعی كوڕی جه‌ڕاح (كه ماموٚستای ئیمامی شافیعی بووه) (١٩٧كۆچی كردوه)، یان ئاده‌می كوڕی ئه‌بی ئه‌ییاس كه (٢٢٠ كۆچی مردووه).. هه‌رچه‌نده ئه‌و زانایانه كتێبه‌كانی خۆیان كه له ته‌فسیردا دایان ناوه هیچی نه‌ماوه‌و به‌ڵكو ده‌ماوده‌م ته‌فسیره‌كانیان له كتێبه‌كانی (ته‌فسیری **مأثور**)دا ئه‌گوزارێته‌وه.

- پاش ئه‌مان چه‌ند زانایه‌كی تر ده‌ستیان دایه ته‌فسیر كردنی قورئان له‌سه‌رتاوه تا كۆتایی وه‌ك (ئیبن ماجه) كه ساڵی (٢٧٣ كۆچی) مردووه، یان ئیمامی (**طبری**) كه (٣١٠ كۆچی) مردووه، یان ئه‌بی حاته‌م كه (ساڵی ٣٢٧ كۆچی) مردووه، یان حاكم كه ساڵی (٤٠٥) كۆچی مردووه.

- پاش ئەم چەرخەش هەندێ زانای تر هاتن و دەستیان دایە تەفسیرکردن، بەڵام هەر پابەندبوون بە تەفسیری **(مأثور)**[1]ەوە.

- پاشان سەردەمی دەمارگیری مەزهەبی هاتە پێشەوەوە هەر کۆمەڵە زانایەك سەر بە مەزهەبێکی دیاری کراوبوون دەستیان دایە تەفسیرکردن تا پشتی بنەما مەزهەبییەکانی خۆیانی پێ ڕاست بکەنەوە، بۆیە تەفسیر ئەو ڕەونەقو کەمەندکێشییەی هەیبوو، نەیماو ڕاستو ناڕاست لەگەڵ یەکتریدا تێکەڵ کران، هەر زانا کە لە زانستێکدا باڵادەست بوو، هات ئەو زانستەی خۆی ئاخنییە ناو تەفسیرەکەی وەك:

- (فەخرەدینی ڕازی) کە لە زانستەکانی فەلسەفەو مەنتیق دا باڵادەست بوو تەفسیری (الکبیر)ی دانا، کە پڕیەتی لە قسەو ڕاوبۆچونی فەیلەسوفو حەکیمەکان.

- **(قورطبي)** و (جەصاص) کە لە فیقهدا باڵادەست بوون، تەفسیرەکانیان پڕ کرد لە پرسەکانی (**فقه**)و شەریعەت.

- **(ثعلبي)** و (خازن) کە لە مێژوودا باڵادەستییان هەبوو، هاتن تەفسیرەکانیان ئاخنی بە ڕوداوە مێژوویەکانی کۆنو تازە ـ بە نیسبەت سەردەمی خۆیانەوە ـ.

- (ڕمّانیو جوبائیو **قاضي** عبدالجبارو زەمەخشەری)یش کە لە ڕێبەرانی موعتەزیلە بوون هاتن ئایەتەکانی قورئانیان بەپێی بنەماکانی ئیعتزال تەفسیرو تەئویل ئەکرد.

- شیعەمەزهەبەکانیش بەهەمان شێوە تەفسیری قورئانیان بەو شێوەیە ئەکرد کە پشتی بنەماکانی مەزهەبی شیعەگەری ڕاست بکاتەوە وەك مەلا موحسنی کاشانی.

- سوفیە سوفتائییەکانیش وەك ئیبن عەرەبی بۆ نموونە ملی ئایەتەکانی قورئانی لار ئەکردەوە تا بازاڕ بۆ بۆچوونە نادروستەکانی خۆی دروست بکات.

بەم شێوەیە قورئان بوویە پەناگاو فریادڕەسی هەموانو هەریەکەی ئەیویست مانایەك لە ئایەتەکاندا دروست بکاتو دەربهێنێ، کە جاری وا هەبوو بە هیچ شێوەیەك ئەو ئایەتە نە لەدوور نە لە نزیك ئەو مانایەی نەئەدا بە دەستەوە. بۆ نموونە:

- شیعەکان ئەڵێن: **(إِنَّ هَـذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ..)**. یانی ئەم قورئانە دەستی خەڵك ئەگرێت تا ئیمامەکانی شیعەیان پێبناسێنێو تەسلیم بەوانیان بکات.[1]

---

[1] تەفسیری (مأثور) بریتیە لەو تەفسیرانەی کە بە ئایەت یان بە حەدیس یان بە قسەی صەحابە و تابعین و پێشەوایانی ئایین ئەکرێتو لەو ڕێوڕەسمە لانادات.

ـ یان ئەڵێن: (يُؤتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً..) (البقرة: ٢٦٩). بریتییە لە: "ناسینی ئیمامو بەگوێکردنی"[٢].

ـ یان ئەڵێن: (فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ). واتە: (دەستگرتن بە ئیمامەکانی شیعەوە).[٣]

* سۆفیەکان ئەڵێن: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ) ئەمە ئاماژەیە بۆ شەڕکردن و جیهاد کردنی دەروون، چونکە دوژمنترینی دوژمن بریتییە لەو نەفسو دەروونەی کە مرۆڤ خۆی هەیەتی".[٤]

ـ یان لە تەفسیری (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) دا ئەڵێن: "الباء بره لأرواح الأنبياء بألهام الرسالة والنبوة والسين سرّه مع أهل المعرفة بألهام القربة والأنس، والميم فتنة على المريدين بدوام نظره اليهم بعين الشفقة والرحمة..."[٥]

ـ هەروەها ئەڵێن: (إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ) (المطففين: ٢٢) (وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ) (الإنفطار: ١٤) "نعيم"و بەهەشت برتییە لە ناسینو بینینی خوا بە دڵو "جحيم"و جەهەننەمیش بریتییە لە دەروونەکان کە ئاگرێکی کڵپەداری تێدایە".[٦]

* موعتەزیلەکان ئەڵێن:

ـ کە خوای گەورە ئەفەرموێ: (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ * إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ) (القيامة: ٢٢ـ٢٣). مەبەست پێی چاوەڕوانیو ئومیدبوونە بە خوا نەك بینینو سەیرکردن،[١] چونکە

---

[1] بورقوعی کە زانایەکی شیعە مەزهەبە و توێژینەوەی رەخنەیی لەسەر مەزهەبەکەی خۆی کردووەو دەڵێت: نسب للامام قولاً ليثبت ان القرآن هادٍ للأمام بعد ما أورد الآية: (إِنَّ هَـذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ). قال الإمام: "التي هي أقوم" هو الإمام، ولم يصل فهم الراوي الى أن (التي هي) مؤنث وليس لنا إمام مؤنث! وهذه الآية لا تتعلق بالإمام إطلاقاً". واتە: ئیمامەکانی ئەوان پیاون، کەچی ئەوان (هي)یان بەکارهێناوە بۆیان، کە بۆ (مێ) بەکاردێت. (كسر الصنم/ ص١٦٩) العلامة البرقعي.

[2] تفسير الصافي، فيض الكاشاني، (٢٢٨/١).

[3] **هەمان سەرچاوە، (٢١٥/١).**

[4] لطائف الإشارات، القشيري، (١٧٣/٤).

[5] حقائق التفسير، أبوعبدالرحمن السلمي الصوفي، (٩/١).

[6] **هەمان سەرچاوە، (١٥٢١/٣).**

موعتەزیلەكان قەناعەتیان بە بینینی خوا نییەو ئەڵێن خوا نابینرێتو مومكین نییە ببینرێت.

بەم شێوەیە تەفسیری قورئان ئەركە سەرەكییەكەی كە بریتی بوو لە هیدایەتدانی خەڵك و دەستگرتنیان بوو بۆ ئەوەی یاساو بنەما شەرعییەكانیان پێبناسێنێتو گوێ بۆ خواو پێغەمبەری خوا بگرنو گوێڕایەڵییان بكات، ئەم ئەركە سەرەكییە نەماو تەفسیری قورئان بوو بە پەردەیەك لەبەردەم ماناو مەبەستو هێزی كێشندەی قورئانداو ئەو بەرەكەتو پیرۆزو رۆحانیەتەی نەما، كە زۆر پێویست بوو بۆ عەودالانی رێگەی ئیسلامەتی.

* تەفسیری قورئان ئەو سەردەمانەشی بڕیو هات تا گەیشتە ئەم سەردەمە تازانەی ئێمە و تەفسیركردن بوویە چەندین قوتابخانە وەك:

- قوتابخانەی تەفسیر بە (**مأثور**).
- قوتابخانەی تەفسیر بە (**رأی**).
- قوتابخانەی تەفسیر لە رووی زمانەوانییەوە.
- قوتابخانەی تەفسیری سۆفییانە.
- قوتابخانەی تەفسیری باتنیانە.
- قوتابخانەی تەفسیری ئیعجازی.
- قوتابخانەی تەفسیری دەعەوی.

- پاشان هەركەسەو بەپێی سەرسامبوونو هاوڕابوونی بۆ قوتابخانەیەك لەو قوتابخانانە دەستیان دایەی تەفسیرنووسینو دونیای فكرو نووسینیان پڕ كرد لە تەفسیری قورئان.

* بەناوبانگترین كتێبەكانی تەفسیر كە بە پێی قوتابخانەی تەفسیر بە (**مأثور**) نووسراون:

١- ئەو تەفسیرەی دراوەتە پاڵ (ئیبن عەبباس).
٢- تەفسیری (ئیبن عویینە).
٣- تەفسیری (ئیبن ئەبی حاتەم).
٤- تەفسیری (ئیبن عەطییە).
٥- (بحر العلوم)ی ئەبی لەیثی سەمەرقەندی.

---

[1] الكشاف، الزمخشري، (٤٩٩/٢).

٦ـ تەفسیری (ئیمامی **طبری**) کە ناوی (**جامع البیان في تفسیر القرآن**)ە.

٧ـ تەفسیری (ئیمامی بەغەوی) کە ناوی (معالم التنزیل)ە.

٨ـ تەفسیری (جەلالەدینی **سیوطی**) کە ناوی (**الدر المنثور في التفسیر بالمأثور**).

٩ـ تەفسیری (ئیبن کەسیر) کە ناوی (تفسیر **القرآن العظیم**)ە.

١٠ـ تەفسیری (شەوکانی) کە ناوی (فتح القدیر)ە.

* بەناوبانگترین تەفسیر بە (راوبۆچوون) نووسراون:

١ـ تەفسیری ئەبوعەلی جوبائی.

٢ـ تەفسیری **قاضي** عبدالجبار بەناوی (**تنزیه القرآن عن المطاعن**).

٣ـ تەفسیری زەمەخشەری **"الكشاف عن حقائق غوامض التنزیل و عیون الأقاویل في وجوه التأویل"**.

٤ـ (مفاتیح الغیب) فەخرەدینی رازی.

٥ـ (مدارك التنزیل وحقائق التأویل) ی نەسەفی.

٦ـ (لباب التأویل فی معانی التنزیل)ی ئیمامی خازن.

٧ـ (**البحر المحیط**)ی ئەبی حەییان.

٨ـ (أنوای التنزیل وأسرار التأویل)ی ئیمامی بەیضاوی.

٩ـ (تفسیر الجلالین) جەلالەدینی محلی و جلال الدینی **سیوطی** .

* بەناوبانگترین تەفسیرەکان لە رووی زمانەوانییەوە:

١ـ کەشافی زەمەخشەری.

٢ـ (تأویل مشکل **القرآن**)ی ئیبن قوتەیبە.

* بەناوبانگترین تەفسیرەکانی ئەهلی تەصەوف:

١ـ (**تفسیر لطائف الاشارات**)ی قوشەیری.

٢ـ (حقائق التفسیر)ی **أبوعبدالرحمن السملي**.

* بەناوبانگترین تەفسیرەکانی باتنییەکان:

١ـ التفسیر الکبیر، مرزا غلام ئەحمەدی قادیانیو تەفسیرەکەی محمد علی لاهوری قادیانی.

٢ـ تەفسیرەکانی (إبن عربی)و حەللاج.

* بەناوبانگترین تەفسیرەکان لە رووی زانستی فیقهییەوە:
١ـ أحكام القرآن / للجصاص.
٢ـ أحكام القرآن / لأبن العربي.
٣ـ تفسير آيات الأحكام / لعلي السايس.
٤ـ أضواء البيان / للشنقيطى.
٥ـ تفسير آيات الأحكام / لمناع القطان.
* بەناوبانگترین تەفسیری قورئان لە رووی ئیعجازی زانستییەوە:
١ـ الكشاف: ئیعجازی رەوانبێژی.[1]
٢ـ الجواهر في تفسير القرآن: الشيخ طنطاوى جوهري.
٣ـ تفسير المنار: الشيخ رشيد رضا.
٤ـ التفسير البيانى للقرآن الكريم: عائيشة عبدالرحمن (بنت الشاطىء).
* بەناوبانگترین تەفسیری دەعەوی بۆ قورئان کرابێت بریتیە لە:
١ـ تەفسیری (في ظلال القرآن)ی سيد قوطب.

## بابەتی دووەم: مەرجەکانی کەسی موفەسیر

زانایان جگە لەوەی جۆرەکانی تەفسیریان باس کردووەو هەروەها توێژەکانی پیاوانی تەفسیریشیان باس کردووە، باسی وردیشیان دەربارەی مەرجەکانی کەسی موفەسیر کردووە لەوانە:

١ـ کەسی موفەسیر ئەبێت خاوەنی "عەقیدەو بیروباوەڕێکی ڕێكو راست بێت"، چونکە عەقیدەی راستو رەوان جگە لەوەی کاریگەری رۆحی بەسەر نووسینەکەو خوێنەرانییەوە

[1] ئیبن خەلدون لە (المقدمە: ص٤٩١)دا باسی ئەوە ئەکات کە یەکێك لە ئەهلی سوننەت لە تەورێزدا کتێبێکی رەخنەیی لەسەر ئەم (کشاف)ە نووسیوەو تێیدا ئەوەی سەلماندووە کە بەلاغەتی قورئان بەو شێوەیەی کە (معتزلە)ەکان بۆی ئەچن لەکەدار ئەبێت و ئەرکەکەی لەدەست ئەدات، بەڵام بە پێچەوانەوە بەوشێوەیەی کە ئەهلی سوننەت مانای لێکئەدەنەوە راستو دروست دەرئەچێت.. جا ئیبن خەلدون دوای ئەم قسە ئەڵێ: "**فاحسن فى ژلك ماشاۆ... وفوق كل ژى عيلم عليم**".

بەجێ دەهێڵێت ڕێگەش لە موفەسیرەکە ئەگرێت کە ملی ئایەتەکان خوار بکاتەوە بۆ ماناو مەبەستێك کە ئایەتەکان هەڵی ناگرن و ئەو مانایە نادەن بە دەستەوە.

**٢ـ** کەسی موفەسیر ئەبێت ئارەزوپەرست نەبێتو بە شوێن حەزو ئارەزووەکانی خۆیدا نەگەڕێت لە قورئاندا، وەك چۆن (شیعەکانو موعتەزیلەکانو قەدەرییەکانو توندڕەوەکان و قادیانییەکان) کتێبەکانی خۆیانیان بەو ڕا شازو نالەبارانە ئاخنیوەو هەرکەس هەندێ ئاگاداری هەبێت خێرا پێیان ئەزانێت.

**٣ـ** ئەبێت سەرەتا بۆ تەفسیرکردنی قورئان پەنا بۆ قورئان خۆی بەرنو ئەم ئایەت بەو ئایەتو ئەم سورەت بەو سورەت تەفسیر بکەن، چونکە وەك زانایانی متمانەداری ئەم ئوممەتە دەریانخستووە قورئان خۆی خۆیی تەفسیر کردووەتەوە، ئەوەی لە ئایەتێکدا بە (مجمل) هاتبێت ئەوە لە ئایەتێکی تردا بە (مفصل)ی هاتووە، ئەوەشی لە ئایەتێکدا بە کورتی وترابێت لە ئایەتو سورەتی تردا بە درێژی باسی لێوەکراوە.[١]

**٤ـ** پاش ئەمە پێویستە کەسی موفەسیر پەنا بۆ سونەتی پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** بەرێت بۆ تەفسیرکردنی قورئان، چونکە ئەوە لە شتە زانراو و پێویستەکانی ئەم دینەیە کە بزانن پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** ڕاڤەکەرو ڕۆشنکەرەوەی ماناو مەبەستەکانی قورئانە، وەك ئەفەرموێ: (**..وأنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ**) (النحل: ٤٤). یان ئەفەرموێ: (**إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللّهُ ..**) (النساء: ١٠٥). دەی پێغەمبەریش **(صلى الله عليه وآله وسلم)** ئەم کارەی کردووە.

---

[1] شتێکی سەیرم لە کتێبکدا بینی، ئەڵێ: خوای گەورە بە کورتی لە هەندێ شوێنی قورئاندا باسی ئەوە ئەکات کە زەویو ئاسمانەکانی لە (شەش) ڕۆژدا دروست کردووە، کەچی لە سورەتی (فصلت)دا بە درێژی باسی ئەو شەش ڕۆژەی کردووە!! سەیر لەوەدایە سوورەتەکەش ناوی (فصلت)ە واتە: تەفسلیپێدراو!! ئایەتەکە ئەفەرموێ: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ * قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَاداً ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ * وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاء لِّلسَّائِلِينَ * ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ اِئْتِيَا طَوْعاً أَوْ كَرْهاً قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ * فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاء أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظاً ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ) (فصلت : ٨ ـ ١٢).

ئیبن تەیمییە (بەرەحمەت بێت) ئەفەرموێ: **"يجب أن يعلم أن النبي بيّن لأصحابه معاني القرآن، كما بين لهم ألفاظه، فقوله تعالى: (لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ) يتناول هذا وهذا"**.

**٥ـ** ئەگەر ئەو تەفسیرە لەناو سوننەتی پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)** دا دەست نەکەوت پێویستە پەنا بەرێت بۆ راو بۆچوونو قسەی ئەصحابەی پێغەمبەر **(صلى الله عليه وآله وسلم)**، چونکە: قورئان لە ناو ئەواندا هاتووەتە خوارەوەو ئاگایان لە ماناو مەبەستەکانی هەبووە، بەرەیەکی نەجیبزادەو زۆر موسڵمانیش بوون، سەلیقەی عەرەبیزانیشیان لە خەڵکی تر زیاتر بووەو خاوەنی (علم)و (عمل)ی بەکەڵکیش بوونو پێغەمبەریش **(صلى الله عليه وآله وسلم)** شایەتی باسو پاکییان بۆ ئەدات ئەفەرموێ: **"خير القرون قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم"**.[1]

**٦ـ** ئەگەر لە ژیانو قسەو راوبۆچوونی صەحابەکاندا ماناو مەبەستی ئایەتێکمان دەست نەکەوت پێویستە کەسی موفەسیر بگەڕێتەوە بۆ پیاوانی موفەسیری ناو (تابعين)، بەتایبەت ئەوانەیان کە ناودارن لەناویاندا وەك قوتابییەکانی ئیبن عەبباسو قوتابییەکانی زەیدی کوڕی ثابتو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو هەروەها..

(تابعين) کەسی وایان تێدا هەڵکەوتووە کە تەفسیری هەموو قورئانی لەدەم صەحابەکانەوە وەرگرتووە، ئایەت بە ئایەتو سورەت بە سورەت بۆ نموونە: موجاهید ئەڵێ: **"عرضت المصحف على ابن عباس ثلاث عرضات من فاتحته الى خاتمته، استوقفه عند كل آية واسأله عنها"**.[2]

**٧ـ** ئەگەر کەسی موفەسیر تەفسیری ئایەتێکی لە قورئاندا دەست نەکەوت و لە سوننەتیشدا دەستی نەکەوتو لە ژیاننامەو قسەو رەفتاری (ئەصحابو تابعين)یشدا دەستی نەکەوت، پێویستە پەنابەرێت بۆ بنەماکانی زمانی عەرەبی، چونکە ئەم قورئانە بە عەرەبی هاتۆتە خوارەوەو ماناو مەبەستی هەر وشەیەکیش یان بە "شەرع"، یان بە "زمان"، یان بە "عورف"، دیاری دەکرێت وەك ئیبن تەیمییە لە رووی لێکۆڵینەوەو بە دواداچوونیدا دەریخستووە".[3]

---

[1] رواه البخاري.

[2] مختصر تفسير ابن كثير/ مقدمة، ص١٣.

[3] موجز الأصول في كيفية التعامل مع أحاديث الرسول (صلى الله عليه وآله وسلم)، هی نووسەر، ص٢٥.

"موجاهید" ئەڵێ: **"لا يحل لأحد يؤمن بالله واليوم الآخر ان يتكلم في كتاب الله إذا لم يكن عالما بلغات العرب"**.[1] واتە: حەڵاڵ نییە بۆ کەسێك کە ئیمانی بە خواو ڕۆژی دوایی بێت کە قسە لە کتێبی خوادا بکات و شارەزایی لەهجەو زمانەکانی عەرەب نەبێت.

لەمەوەیە هەندێ ئەوە بە مەرج ئەگرن کە کەسی موفەسیر پێویستە شارەزای باشی لە "زمانی عەرەبیو نەحو و صەرفو بەلاغەو .." دا ببێت، چونکە زمانی عەرەبی بە (سەر)ێك، یان (بۆر)ێك، یان (زەنە)یەك ماناکانی ئەگۆڕێتو کەسی نەشارەزا دەم لە تەفسیری قورئان بکوتێت ئەکەویتە هەڵەی گەورەوەو خەڵکیش بەهەڵەدا ئەبات.

کابرایەك وتبووی: لە قیامەتدا هەموو کەسێکی کۆترباز و ڕاوچی پەلەوەرەکانی خۆی ئەخرێنە ملی، وتبویان چۆن؟ وتبووی: قورئان ئەفەرموێ: **(وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ )**!! کابرا وای زانیبوو کە **(طائره)** یانی پەلەوەرەکەی خۆی، لە کاتێکدا ئەو ئایەتە یانی (نامەی کردەوەکانی) نەك (پەلەوەرەکانی).[2]

یان کابرایەك وتبووی: **"فأمه** هاویه" واتە قوڕ بەسەر خۆشیو دایکیشی. لە کاتێکدا ئەو ئایەتە یانی (هاویە) ـ کە ناوێکی تری جەهەنمە ـ ئەبێتە شوێن و سەرچاوەی کافران.

ئیبن قوتەیبە لە (مشكل **القرآن**)دا شتی زۆر سەیرو ناوازە لەم بارەیەوە باس ئەکات و باسی نهێنییەکانی زمانی عەرەبی ئەکات، دکتۆر (فازل السامرائی)یش لە کتێبی (التعبير **القرآني**) دا بە هەمان شێوە زۆر نهێنی زمانی عەرەبیو (سەرو بۆرو ژێرو زەنە) ئەکاتو هەرکەس بیەوێ با بۆیان بگەڕێتەوە.

زانایان پاش ئەم مەرجانە چەند مەرجی تر لە ڕووی ئەوەوە باس ئەکەن کە پێویستە کەسی (موفەسیر) تێیدا بێت تا بتوانێت هێزی بشکێت بەسەر دەرهێنانی ماناو مەبەستەکانی قورئاندا لەوانە:

٨ـ زانینی (زانستەکانی قورئان = علوم **القرآن**) وەك زانستی خوێندنەوەکانی قورئان، یان زانستی "توحیدو یەکتاپەرستی" تا لە قسەکردنی لە ئەو ئایەتانەدا بە هەڵەدا نەچێت کە باسی نزیکبونەوەی عەبدو خوا ئەکات، یان باسی دەستو چاوو ڕووی خوا **(جل جلاله)** دەکات.. گرنگترین زانستی قورئانی پیرۆرز بۆ موفەسیر بریتییە لە زانینی (بنەماکانی

---

[1] مباحث في علوم القرآن / مناع القطان، ص٣٢٢.

[2] ثقافة الداعية/ يوسف القرضاوي.

تەفسیر = أصول التفسیر) و زانستی (أسباب النزول)و (ناسخو منسوخ)و مەبەستەکانو راستییەکانی ئەم زانستە.

**٩ـ** سەلیقەو عەقڵ، کە بە راستی مرۆڤ بەسەلیقەو عەقڵ ئەتوانێ نهێنی دەربخات و لە ماناو مەبەستی قسەکەر حاڵی ببێت.

حەزرەتی عومەر لەچەند صەحابی پرسیاری کرد، ئەرێ مەبەست لە (**إنا جاء نصر الله والفتح**) چی بێت کە خوای گەورە پاش ئەوە فەرمان بە پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**) ئەکات تەسبیحات بکاتو تەوبە تازە بکاتەوە، ئەوان هەریەکەی شتێکیان وت: عەبدوڵڵای کوڕی عەباس کە بە تەمەن لەوانی تر منالتر بوو وتی: قوربان! من وای بۆ ئەچم کە ئەوە ئاماژەیە بۆ نزیکبونەوەی "ئەجەل"ی پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**)، چونکە وادەرئەکەوێ پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**) ئەرکی سەرشانی تەواو کردوەو سەرکەوتنی بەدەستهێناوەو ئیتر پێویستە بگەڕێتەوە بۆ خزمەتی پەروەردگاری خۆی! حەزرەتی عومەریش فەرمووی: "منیش هەر هەمان رای تۆم هەیە بۆ ئەو ئایەتانە". [1]

١٠ـ بەراستی ئەم خاڵەی تریش کە لای من گرنگەو پێویستە کەسی موفەسیر پێوەی پابەندبێت ئەوەیە "حەقبێژ" بێتو لە خوا نەبێ لەکەس نەترسێتو ماناو مەبەستەکانی قورئان نەشارێتەوە لەبەر ترسێك، یان لەبەر تەماعێك، یان لەبەر هەر شتێکی تر.

ئەو کەسەی لە ژێر سێبەری قورئاندا ئەژی و ئەیەوێت مانا و مەبەستەکانی "خوای موتەعال" بە خەڵکی بڵێ پێویستە نەترس بێت و دەست لە ژیانی خۆی بشۆرێت.

ـ (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێناوی مانای ئایەتێکی قورئاندا لە زینداندا گیانی لە دەست دا.

ـ (ئیبن تەیمیە) و (ئیبن قەیمی جەوزیە)ی شاگرد و هاوڕێی لە سەر تەفسیری قورئان ژیانیان لە زیندانەکان دا سەرف کرد.

ـ (سەید قوتب) لە سەر تەفسیر کردنی ڕاستەقینەی قورئان و دەرخستنی ماناکانی و مەبەستەکانی ئەو کتێبە ژیانی خۆی دانا, کاتێکیش کە داوای ئەوەیان لێکرد لەو تەفسیر کردنەی بۆ قورئان پەشیمان ببێتەوە, عەفو دەکرێت و ئازاد ئەبێت و پلەی وەزیریشی پێ ئەدرێت فەرموی: **"اعتذر عن ماذا؟ کیف اعتذر وکان عملي لله؟! ان کنت محبوسا بحق فانا ارتضي حکم الحق, و ان کنت محبوسا بباطل فانا اکبر من ان اعتذر لباطل"**.

---

[1] سەیری : عمر بن الخطاب / الصلابی (ص٣٢٥) بکە.

که ویستیان له بەردەم پەتی سێدارەکەیدا دەستی ببەستن, فەرمووی: **اتظنون انی أفرّ من الجنة, بینی وبین الجنة خطوات, ان قطعتها کنت مع أصحاب رسول الله في الجنة:** ئەڵێن لەو کاتەدا: **جمال عباالناصر:** دارێکی لێ ئەدات و ئەڵێ پێی: **"اتتفلسف حتی و انت قادم علی الموت".**[1]

ـ ئەحمەدی مفتی زادە لە سەر تەفسیرکردنی جەریئانەی بۆ قورئان، ژیان و مانی خۆی دانا.

ـ کاك ناصری سوبحانی لە سەر تەفسیری ئایەتەکانی (ویلایەت) گیانی سپارد بە پەروەردگاری.

ـ سەعیدی نورسی لە سەر تەفسیر و دەرهێنانی حەقیقەت و ماناکانی قورئان هەر ڕۆژەی لە زیندانێکی ناسیونالسیتە تورکەکاندا بوو.

١١ـ بەراستی ئەم مەرجەش ئەگەر لە گرنگیدا لەوانەی پێشوو گرنگتر نەبێت ئەوە بە دڵنیایەوە وەك ئەوان گرنگە، ئەویش ئەوەیە: پێویستە کەسی موفەسیر, کەسێکی بە ڕەوشت و زۆر موسڵمان بێت, کەسێك بێت لە خوا بترسێ, بە ئەدەب بێت لەگەڵ خوادا, بە ئەدەب بێت لەگەڵ پێغەمبەری خوادا.

ـ خوای گەورە ئەفەرموێ: **(إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا) (النور: ٥١).**

ـ خوای گەورە ئەفەرموێ: **(فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ) (النور: ٦٣).**

ـ هەر خوای گەورە ئەفەرموێ: **(و ان تطیعوه تهتدوا).**

ـ هەر ئەو ئەفەرموێ: **(وما آتاکم الرسول فخذوه و ما نهاکم عنه فانتهوا)** زانایان ئەفەرمون: زانست باوەش بۆ پیاوی موسڵمان و لە خوا ترس ئەکاتەوە و نهێنییەکانی خۆی بۆ دەرئەخات, هەر موسڵمانێتی و تەقوادارییە وا ئەکات قسەی موفەسیر کاریگەری لە سەر خوێنەرانی دابنێت.[2]

---

[1] بۆ زیاتر شارەزا بوون لە ژیانی ئەم موفەسیرە جەریئە سەیری: (سید قطب من المیلاد الی الاستشهاد)ی (صلاح الدین الخالدی) بکە.

[2] مباحث في علوم القران/ص٣٢٣, زۆرێك لە خاڵەکان لەم سەرچاوەیە وەرگیراون بە مانا نەك بە دەق.

## بابەتی سێیەم: گرنگترین کتێبەکانی تەفسیر چ کوردییەکان و چ عەرەبییەکان

لە بابەتەکانی پێشوودا باسی جۆرەکانی تەفسیر و جۆرەکانی کتێبی تەفسیرمان کرد و لێرەدا تەنیا گرنگترینیان باس ئەکەین بۆ خوێنەرانی کورد بە گشتی و توێژی لاوان بە تایبەتی.

**تەفسیرە عەرەبیەکان:**

١ـ تەفسیری (**مختصر** تفسیر ابن **كثير**) هی: **ئیبن کثیر**: کە زانایان بە کورتەیەکی تەفسیری ئیمامی **"طبری"** ئەزانن.

٢ـ تەفسیری (فتح القدير) هی ئیمامی شەوکانیە، کە تەفسیرێکی نایاب و پڕ سوودە و لاوی موسڵمان بێ منەت نابێت لێی.

٣ـ تەفسیری (**في ظلال القران**) کە هی (**سید قطب**)ە و تەفسیرێکی پڕچێژە و نووسەر بە خوێنەکەی خۆی گیانی بە بەریدا کردووە.

٤ـ تەفسیری (الجامع لاحكام القران) کە هی **"ئیمامی قرطبی"**یە, ئەم تەفسیرە جۆرێکە لە **"**موسوعات**"** و لایەنە جیا جیاکانی (بەلاغە) و (**منطق**) و (ئەحکام) و تەفسیری (غريب) و (أسباب نزول) و (**قراءات**) هەموو باس ئەکات و خوێنەر فێری (ترجيحات) ئەکات و زانیارییەکی زۆری دەربارەی قورئان و زانستەکان قورئان ئەداتێ.

**تەفسیرە کوردییەکان:**

تەفسیری کوردی مێژووی دوور نییە و لەم کۆتایانەدا دەستی پێکردووە و مێژووەکەی لە سەد ساڵ کەمترە، هۆکەشی ئەوەبووە کە زۆر لە زانایان براوایان وابووە کە قورئان مومکین نییە بکرێتە کوردیو هەرکەس بیکاتە کوردی گوناهی ئەگات، تەنانەت وتاری هەینی کە دروشمێکی گەورەی ئیسلامە لەناو کورددا هەر پەنجا ساڵێك ئەبێت بە کوردی وتار ئەدرێت و ئەویش هەر بە عەرەبی ئەدرا.

مامۆستا شیخ موحەممەدی خاڵ کە تەفسیری (خاڵ)ی دانا هەندێك کەوتنە دژایەتی کردنی، مامۆستا مەلا عوسمانیش کە شێوازی تەفسیری گۆڕی لە شێوازێکی تەقلیدییەوە بۆ

شێوازێکی هاوچەرخ، هەندێك لێی کەوتنە تەقە، بە هەرحاڵ ئەوەی کە لێرەدا پێویستە بوترێت ئەوەیە کە تەفسیری کوردی چەند جۆرێکە لەناو کورددا:

جۆری یەکەم: چەند سورەتێکی تایبەتی تەفسیر کردووە.

جۆری دووەم: مانای کورتی بۆ ئایەتەکان کردووە وەك (وەرگێڕانێك).

جۆری سێیەم: هەموو قورئانی تەفسیر کردووە.

ئەوانەی چەند سورەتێکیان تەفسیر کردووە وەك مامۆستا (شێخ موحەممەدی خاڵ)، (ئامینە صدیق عەبدولعەزیز)، (ژیان عەبدولحەمید) و (مەلا موستەفای گولّپی)و هەروەها ئەوەی وەك وەرگێڕان تەفسیری ئایەتەکانی قورئانیان کردووە وەك: "بورهانی ئەمینی: تەفسیری ئاسان"، مەلا موحەممەد مەلا صالّحی بامۆکی "موفرەداتی قورئان"، مامۆستا هەژار موکریان "تەفسیری قورئان"، تەفسیری قورئانی "ئیبراهیمی"، هەروەها مامۆستا **نظام الدین عبدالحمید** (تەفسیری گولّشەن)..

ئەوانەش کە تەفسیری هەموو قورئانیان کردووە (مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز، مامۆستا سعیدی زمناکۆیی، مامۆستا مەلا ئەحمەد کاکە مەحمود..

باشترین تەفسیری قورئان وەك "موفرەدات"، تەفسیرەکەی مامۆستا مەلا موحەممەد مەلا صالّح بامۆکییە، چونکە سەرەتا ئەو پرۆژەیە پرۆژەیەکی "جەماعی" بوو، چەند کەسی باش و موسلّمان و بوێر دەستیان پێ کرد، بەلاّم لە پاشاندا بەرێز مامۆستا مەلا موحەممەد مەلا صالّح تاجی خستە سەر پرۆژەکەو لەلایەك تەواوی کردو لە لایەکیش پێداچوونەوەی باشی بۆ کردو خۆشیو بەشداربووانیشی تووشی ئەو خێرە گەورەیە کرد.

ئەم تەفسیرە جگە لە مانای وشەیی گشت ئایەتەکان، هەموو ئەو فەرموودانەشی هێناوە کە لە رێگەیەکەوە یان زیاتر یارمەتی کەسی موفەسیر ئەدات بۆ تەفسیرکردنی ئایەتەکانو زیاتر حاڵی بوون لە ماناو مەبەستەکانی، زیاد لەمەش "هۆی دابەزینی ئایەتەکان"ی باس کردوەو ماناو مەبەستەکانیشی دەربڕیوە.

ـ باشترین تەفسیریش کە بە درێژی تەفسیری قورئانی کردبێت، بریتیە لە تەفسیرەکەی مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز، کە ئەکرێ بوترێت: تەفسیرەکەی مامۆستا مەلا عوسمان کورتەو پوختەی تەفسیری (**في ظلال القرآن**)[1]ی "**سیدقطب**"ە (بە رەحمەت بن).

---

[1] یەکێك لە قوتابییەکانی مامۆستا مەلا عوسمان ماستەرنامەیەکی نووسیوە لەسەر تەفسیرەکەی مامۆستا مەلا عوسمان بەناوی (الشیخ عثمان عبدالعزیز ومنهجه في التفسیر)ە.

ـ بەڵام ئەوەی کە شێوازێکی تری گرتوەتە بەر نە "مفردات"ەو نە "تەفسیری تەواویشە" بریتییە لە تەفسیرەکەی مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحمود، کە شێوازێکە لە نێوان ئەو دوو شێوازەداو بە یەکێك لە تەفسیرە گرنگەکانی ناو کتێبخانەی کوردی دائەنرێت.

تەفسیرەکەی مامۆستا مەلا کەریمی (مدرس)یش کە بە ناوی "تەفسیری نامی" نووسیوویە، گرنگی تایبەتی خۆی هەیەو زیاتی گرنگی بە بواری "فقهو شەرع" داوەوە هەر چەندە زمانەکەی زمانێکی تێکەڵە لە وشەی کوردیو عەرەبیو زیاتر ئەوانە سودی لێ ئەبینن کە پاشخانی زانستی یان هەیە.

## باسی سێیەم: زانستی "مەککی"و "مەدەنی"

سەرەتا پێویستە بڵێن" مەککی" واتە ئەو ئایەتانەی کە لە قورئاندا ناو نراون "مەککی" و مەبەستیش پێیان ئەو ئایەتانەن کە پێش کۆچکردن بۆ "مەدینە" دابەزیوون.

مەبەستیش بە "مەدەنی" ئەو ئایەتانەن کە لە دوای کۆچی پێغەمبەرەوە **(صلی الله علیه وآله وسلم)** بۆ مەدینە دابەزیوون و لە قورئانیشدا ناونراون **"مدني"** .

ئەم کۆچی پێغەمبەرە **(صلی الله علیه وآله وسلم)** بۆ مەدینە وەك چۆن بوو بە ناوبڕ بۆ دوو قۆناغی جیاواز لە ئیشکردندا, هەرواش بوو بە ناوبڕ بۆ دوو شێوازی جیاواز لە دابەزینی قورئاندا. ئەمە چۆن؟ پاش هیجرەت حاڵی موسڵمانان گۆڕانی زۆری بە سەردا هات لە بێهێزییەوە بۆ بە هێزی, حاڵی قورئانیش گۆڕانی بە سەردا هات و بابەتەکانی گۆڕان, ئایەتەکانی سوورەتە مەککییەکان گرنگیان بە "عەقیدە" و ئایەتە مەدەنییەکانیش گرنگیان بە "شریعە" ئەدا زیاد لە شتی تر، زانایان گرنگی زۆریان داوە بەوەی دەریبخەن چەند سورەت و چەند ئایەت لە قورئاندا مەککییە و چەندیان مەدەنییە, ئەوەی زانایان بە دوادا چوونیان بۆ کردووە لەم مەسەلەیەدا چەند جۆرێکە:

١ـ ئەو ئایەت و سورەتانە کامانەن کە لە مەککەدا دابەزیوون.

٢ـ ئەو ئایەت و سورەتانە کامانەن کە لە مەدینەدا دابەزیوون.

٣ـ ئەو ئایەت و سورەتانە کامانەن کە زانایان رایان یەك نییە دەربارەی مەککی و مەدەنیان.

٤ـ ئەو ئایەت و سورەتانە کامانەن کە لە مەککەدا دابەزیون کەچی حوکمیان وەك هی (مدنی)یە.

٥ـ ئەو ئایەت و سورەتانە کامانەن کە لە مەدینەدا دابەزیون کەچی حوکمیان وەك هی (مکی)یە .

٦ـ ئەو ئایەتە "مەککی"یانە کامانەن کە لە سورەتە مەدەنییەکاندا هەن.

٧ـ ئەو ئایەتە مەدەنیانە کامانەن کە لە سورەتە مەکییەکاندا هەن.

٨ـ ئەو ئایەتە مەدەنیانە کامانەن کە لە " مەکی" ئەچن.

٩ـ ئەو ئایەتە مەککییانە کامانەن کە لە " مدنی" ئەچن.

١٠ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە مەککەوە براون بۆ مەدینە.

١١ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە مەدینەوە براون بۆ مەککە.

١٢ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە زستاندا دابەزیون.

١٣ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە هاویندا دابەزیون.

١٤ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە شەودا دابەزیون.

١٥ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە ڕۆژدا دابەزیون.

١٦ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە" سەفەردا" دابەزیون.

١٧ـ ئەو ئایەتانە کامانەن کە لە شاردا دابەزیون.

لە کتێبەکانی "**علوم القرآن**" دا نمونە بۆ هەریەك لەوانە هێنراوەتەوە بەپێی ریوایەتی مێژوویی.

ئەمانە چەند مەسەلەیەکی سەرەکین و تەوەرەکانی بریتییە لە باسی" مەککی" و " مدنی" و بۆ ئەم مەبەستەش ناونراوە" زانستی مەککی" و "مەدەنی" .

زانایان ئەڵێن".[1]

نزیکترین ئامارێك کە کرابێت بۆ سورەتە مەدەنی و مەککییەکان بریتییە لە :

١ـ بیست سورەت "مەدەنییە"، کە ئەمانەن (**البقرة, آل عمران, النساء, المائدة, الأنفال, التوبة, النور, الأحزاب, محمد, الفتح, الحجرات, الحديد, المجادلة, الحشر, الممتحنة, الجمعة, المنافقون, الطلاق, التحريم, النصر**).

٢ـ دوازدە سورەتیش ڕای جیاوازی لە سەرە کە ئەمانەن (الفاتحه, الرعد, الرحمن, الصف, التغابن, **التطفيف**, القدر, البينه, الزلزله, الاخلاص, الفلق, الناس ) .

---

[1] مباحث في علوم القران, مناع القطان, ص٥.

**٣ـ** ماچکردنی قورئان بە کارێکی خێرو موستەحەب ئەزانن و بەڵگەشیان ئەوەیە کە هەندێ لە ئەصحاب قورئانیان ماچ کردووە وەك ئیبن عومەرو عەکریمەی کوڕی ئەبوجەهلو "قیاس"یش ئەکەنە سەر ماچکردنی بەردە رەشەکەو منالّی خۆت، کە هەردووکیان دیاری خوای گەورەن، دیارترینی ئەو زانایانەی رایان وایە ئیمامی (نەوەویو **سیوطی و قرطبي**)یە.

نەوەوی ئەفەرموێ: لە "مسند دارەمی"دا بە سەنەدێکی "صحیح" ئەو حەدیسەمان ریوایەت کردووە کە "عەکریمەی کوڕی ئەبوحەهل" قورئانی ماچ ئەکردو ئەیفەرموو: "کتاب ربی، کتاب ربی"، وەقورتوبیش ئەفەرموێ: سەعیدی کوڕی سەکینە ئەفەرموێ: ئەوەیان بۆ گێڕاومەتەوە کە جارێکیان پیاوێك سەیری پارچە پێستیەك ئەکات "**بسم الله الرحمن الرحيم**"ی لێنووسراوە، هەڵێدەگرێتو ماچی ئەکاتو ئەیخاتە سەر چاوی، خوای گەورە لەبەر ئەو کارە لێی خۆش ئەبێت.[1]

پاش ئەم گواستنەوانە مامۆستا فرج تۆفیق ئەڵێت: قسەی هەڵبژاردە ئەوەیانە کە زانایانی رای سێیەم ئەیکەن، چونکە "**آثار**"ێکی زۆر لەوبارەیەوە ریوایەت کراوە و ئەو کارەش بەرز راگرتنی قورئانی تێدایە.[2]

## باسی سێیەم: خێری قورئان خوێندن بۆ مردوو

زانایانی ئیسلام دوو جۆر راو بۆچوون دەردەبڕن لەم باسەدا. رایان لە دروستو نادروستی قورئان خوێندن لە سەر مردوو یان لەسەر قەبری مردوو، رایان لەسەر ئەوەی ئایا ئەو قورئان خوێندنەو خێرەکەی ئەگات بەو مردووە یان نا ؟!

زۆربەی زانایان لەوانە ئیمامی مالیك و شافیعی و ئیمامی ئەحمەدو فەتوای ناو مەزهەبی ئەبوحەنیفە رایان وایە کە قورئان خوێندن لەسەر مردوو یان لەسەر قەبری مردوو نەك هەر دروستە، بەڵکو خێری گەورەشی تێدایەو بەڵگە شەرعییەکانیش پشتی ئەم رایە ئەگرنو لەو بەڵگانە فەرمودەی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) کە ئەفەرموێ: "**من دخل المقابر فقرأ سورة (يس) خفف عنهم يؤمئذ وكان له بعدد من فيها حسنات**).[3]
زانایان دوو بەڵگەی عەقڵی باس ئەکەن، یەکەمیان: قورئان بە بەرکەتەو لەهەر شوێنێکدا

---

[1] الجامع لأحكام القرآن، (٩١/١).
[2] المدخل، ص١٢٨.
[3] المغنى، (٤٧١/٢)، والروض المربع، (٢٦/٢).

بخوێنرێ بەرەکەت ئەو شوێنە دائەگرێ. دووەمیان: قەبرستانیش شوێنێکە سەلامکردن و دوعاکردن و زیکرکردن تێیدا دروستە، بۆیە قورئان خوێندنیش بە هەمان شێوازە دروستەو ئەم رایەش لە رووی بەڵگەو زۆری ئەو زانا موعتەبەرانەی پشتیوانی لێ دەکەن رایەکی بەهێزە.[1]

سەبارەت بەوەش ئایا خێری قورئان خوێندن ئەگاتە مردوو یان نا ؟!

زانایانی ئیسلامی دوو رایان هەیە: یەکەمیان: پێی ناگات. دووەمیان: پێی ئەگات.

ئیمامی شافیعی (بەرەحمەت بێت) خۆیو کۆمەڵێکی زۆریش لە قوتابییەکانی رایان وایە کە خێری قورئان خوێندن ناگاتە هیچ مردوویەكو بۆ ئەم فەتوایەشیان پشت بە چەند بەڵگەیەك ئەبەستن لە قورئان و لە فەرمودە.. لەوانە:

خوای گەورە ئەفەرموێ: **(وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى) (النجم: ٣٩)**. واتە: هیچ شتێك چنگی مرۆڤ ناکەوێ ئەوە نەبێت خۆی ئەیکاتو قورئان خوێندنەکەش شتێك نییە مردووەکە خۆی بیکات بۆیە پێی ناگات.[2] ئەو فەرمودەیەش ئەکەنە بەڵگە کە ئەفەرموێ: **(اذا مات ابن آدم انقطع عمله الا من ثلاث صدقة جارية أو علم ينتفع به او ولد صالح يدعو له)**. ئیمامی شیرازی دانەری **(المهذب)** کە ئیمامی نەوەوی شەرحی لەسەر کردووە بە کتێبی (المجموع) ئەفەرموێ: **(ولا يلحق الميت مما يفعل عنه بعد موته بغير اذنه الا دين يقضى عنه أو صدقة يتصدق بها عنه او دعاء يدعى له.. واما ما سوى ذلك من الثواب كقراءة القرآن وغيرها فلا يلحق الميت لما روى أبوهريرة (رضي الله عنه) أن النبي (صلى الله عليه وآله وسلم) قال: اذا مات ابن آدم انقطع عمله الا من ثلاث صدقة جارية أو علم ينتفع به او ولد صالح يدعو له)**.[3]

بەڵام رای زۆربەی زانایان پێچەوانەی ئەم رایەی ئیمامی شافعی و قوتابییەکانێتیو ئەفەرموون: خێری قورئان خوێندن ئەگاتە کەسی مردوو .. ئەم رایەش رای ئیمامی مالیكو ئەبوحەنیفەو ئەحمەدی کوڕی حەنبەلو هەندێ قوتابی مەزهەبی شافیعیو ئیبن حەزمی

---

[1] سەیری: المدخل، ص٢٣٤ تا ص٢٤٣ بکە.

[2] المغني، ٤٧٧٢١. المحلى، ٧/٤، پەراوێزی: المدخل، ص٢٥٨.

[3] المدخل، ص٢٤٣.

**ظاهیری و خەنیەلییەکان**و ئیمامی نەوەویش ئەم رایەی پێ پەسەندە و تەنانەت ئیبن قودامە ئیجماعی زانایانی ئیسلامی لەوەدا ئەبینێ کە لەسەر ئەم رایەن.[١]

ئەم زانایانەش بەڵگەیەکی زۆر دێننەوە بۆ راکەیان لە فەرمودە شیرینەکانی پێغەمبەرەوە (**صلى الله عليه وآله وسلم**)، لەوانە:

١ـ دایکمان عائیشە (رەزای خوای لێ بێت) ئەفەرموێ: کابرایەك هاتە لای پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دایکم گیانی سپاردو قەناعەتم وایە ئەگەر بیتوانیایە قسە بکات ئەوە خێری باشی ئەکرد، من ئەگەر خێری بۆ بکەم پێی ئەگات؟ پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) فەرمووی: بەڵێ. (**متفق عليه**).

٢ـ حەسەنی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە ــ کە سەرۆکی هۆزی خەزرەج بوو ــ بە پێغەمبەری وت کاتێك کە دایکی مرد، ئەی پێغەمبەری خوا ئەکری خێر لە جیاتی دایکمان بکەم بۆی؟ فەرمووی: بەڵێ. وتی: کام خێرە گەورەیە؟ فەرمووی: ئاودێری. جا حەسەن ئەڵێ: ئەو کانیو ئاوانەی کە ئەمرۆ خەڵکی ئاوی لێهەڵدەگرنەوە هەمووی هی بنەماڵەی سەعدە لە مەدینەدا.. ئەم فەرمودەیە ئیمامی ئەحمەدو نەسائی ریوایەتی دەکەن.[٢]

ئیمامی **طحاوي** لە "**العقيدة الطحاوية**"دا ئەفەرموێ: (**وفي دعاء الأحياء وصدقاتهم منفعة للأموات**)[٣].. راڤەکەری ئەم عەقیدەیەش کە "ئەبی العز الدمشقی"یە، راڤەیەکی زۆرو درێژی ئەو "دەق"ە ئەکات و قسەی ئەوانە بەبەڵگەوە رەت ئەکاتەوە کە ئەڵێن خێرو قورئان خوێندن ناگاتە مردوو لەو سێ رێگیەوە نەبێت، کە فەرموودەکەی ئەبوهورەیرە باسی کردووە، بۆ نموونە ئەفەرمووی: "چ قورئانو چ حەدیس و چ ئیجماع و قیاسی صحیحیش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە مردوو کەڵك وەرئەگرێت لەو خێرانەی بۆی ئەکرێت با خۆشی (سبب) نەبووبێت تێیدا".[٤] و پاشان بە درێژی ئایەتەکانو حەدیسەکان و ئیجماع و قیاسە

---

[1] اعلام الموقعين، (١٠٩/٢).

[2] نيل الأوطار، (١٠٤/٤).

[3] شرح العقيدة الطحاوية، تحقيق عبدالله التركي وشعيب أرناؤوط، ص٦٦٢.

[4] هەمان سەرچاوە، ص٦٦٥.

صەحیحەکانیش باس ئەکاتو وەڵامی ئەوانەش ئەداتەوە کە بەڵگەی دژ بەمانە باس ئەکەن.. تا ئەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئەفەرموێ: **"واما قراءة القرآن وإهدائها للميت تطوعا بغير أجرة فهذا يصل اليه كما يصل ثواب الصوم والحج"**.[1]

لەمانەوە دەردەکەوێت کە قسەی راستو گونجاو ئەوەیە کە مردوو خێری قورئان خوێندنی پێ ئەگاتو هیچ جیاوازی نییە لەوەدا کە خێری (حەج)و (رۆژوو)و (قەرز)و (قوربانی)و (دوعا بۆ کردن)ی پێ بگات، کە هەموویان حەدیسی (صحيح) یان (حسن)یان لەسەر هاتووە، بەڵام خێری قورئان خوێندن بۆی یان لەسەر قەبرەکەیی پێی نەگات! بەڵام زانایانی ئیسلامی چەند مەرجێکیان بۆ ئەم خێر پێ گەشتنە دانەناوە لەوانە:

**١ـ** مردووەکە خۆی وەسیەت بکات، کە ئەمە قسەی (شیرازی)و (ئیبن حەزم)و جگە لەوانیشە.[2]

**٢ـ** دوای قورئان خوێندنەکە بڵێ: خوایە خێری ئەم قورئان خوێندنە بگەیەنە فلانو فلان بۆ نموونە.. کە ئەمەش قسەی یەکێکی وەکو (نەوەوی)[3]و هەندێ لە (مالیکییەکانە)[4].. (نەوەوی) ئەفەرموی: (**والاختيار أن يقول القاريء بعد فراغه: اللهم أوصل ثواب ما قرأته الي فلان**).. مالیکییەکان وا ئەفەرموون: (ئەگەر هەر کەسێك ئەیەوێت بەرەکەتی قورئان و خێرەکەی بگاتە مردوو بێ ئەوەی خیلافی لەسەر دروست ببێت با کارەکە وەك دوعا لێ بکاتو بڵێ: **اللهم أوصل ثواب ما أقرأه لفلان أو قرأته**)، ئیتر ئەو کاتە مردووەکە خێری قورئان خوێندنەکەی دەست ئەکەوێت و قورئان خوێنەکەش خێری دوعاکەی دەست ئەکەوێت).[5]

**٣ـ** ئەبێ بەبێ کرێ قورئانەکە بخوێنێ، نەك بە کرێو پارە بۆ برینەوە. وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

---

[1] هەمان سەرچاوە ص٦٧٣.

[2] المدخل في فقه القرآن، ص٢٥٩.

[3] المدخل، ص٢٥٣.

[4] المدخل، ص٢٥٧.

[5] المدخل، ص٢٥٧.

## باسی چوارەم: قورئان خوێندن بەبێ دەستنوێژ

یەکێك لەو باسانەی کە زۆر قسەو باسی لەسەرەو ئەبێتە مایەی دڵعادزی هەندێك موسڵمان لە برا موسڵمانەکانی تری ئەوەیە کە لە مەسەلەی دەستنوێژگرتندا بۆ قورئان خوێندن بێ مویالاتە و وەك پێویست ئەدەب بە خەرج نادات.. زانایانی ئیسلام لەم مەسەلەیەدا دوو رایان هەیە کە بە ویستی خوا ئێمە هەردووکیان رۆشن ئەکەینەوەو پاشان رای دروستو هەڵبژێراوی لای زانایان باس دەکەین..

رای یەکەم: ئەوەیە بە هیچ شێوەیەك دروست نییە بەبێ دەستنوێژ نەدەست لە قورئان بدرێتو نە بشخوێنرێتەوە.

رای دووەم: ئەوەیە کە دروستە بەبێ دەستنوێژ دەست لە قورئان بدرێتو بشخوێنرێتەوە..

بەڵگەی دەستی زانایانی پشتیوان بۆ رای یەکەم: بریتییە لە هەندێ بەڵگەی شەرعی لە قورئانو فەرمودەوە لەگەڵ هەندێ لە ئیجتیهادو (قیاسی شەرعی)دا..

١ـ بەڵگە قورئانییەکان، گەورەترین و دیارترین بەڵگەی دەستی ئەم زانایانە ئەو ئایەتەی سورەتی (الواقعه)یەکە کە ئەفەرموێت: (**إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ * فِي كِتَابٍ مَّكْنُونٍ * لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ**) (الواقعه: ٧٧ـ ٧٩). واتە: ئەم قورئانە قورئانێکی زۆر بە کەڵكو پیرۆزەو لە ناو کتێبێکی شاراوەدایەو کەسە پاکەکان نەبێت دەستی لێ نادەن.. ئەم زانایانە ئەفەرموون:

أ ـ **"لایمسه"** (ئەمرە) لە صیغەی (خبر)دا، واتە (دەست مەدەن لە قورئان کاتێك نەبێت کە پاك بن.. ئەم جۆرە صیغانەش لە قورئاندا زۆرە وەك ئەفەرموێ: (**ومن دخله كان آمنا**)، یان ئەفەرموێ: (**وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ**) کە لە یەکەمیاندا فەرمان بەوە دەکات (ئەمان) بدرێتە ئەو کەسەی کە ئەچێتە ناو کەعبەوەو لە دووەمیان فەرمان ئەکات بە دایکان کە دوو ساڵ شیر بدەنە مناڵەکانیان لە کاتێکدا هەردوکیان بە صیغەی (خبر) هاتوون و مەبەست پێیان (ئەمر)ە.

ب ـ ئەفەرمون: ئەگەر **"لوح المحفوظ"** کە قورئان تێیدا نووسراوەتەوە جگە لە فریشتە پاکەکان نەبێت دەستی بۆ نەبەن، کەواتە پێویستە لەسەر زەویشدا هەمان رێز لە قورئان بگیرێو بە دەستی بێ دەستنوێژەوە دەستی بۆ نەبرێت.

٢ـ ئەفەرموون: پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) لە حەدیسی ئیمامی (**تیرمذی**)و **"إبن ماجة"**دا ئەفەرموێت:

"**لا تقرا الجنب والحائض شيئاً من القرآن**"، ئەمە لەفزی (**تیرمذی**)و "**إبن ماجه**"یەو (**دارقطنی**)ش بە (لەفزی): "**لاتقرأ الجنب والحائض والنفساء القرآن**".

مانای حەدیسەکە ئەفەرموێ: (نەلەش پیسو نەحەیزدار و نەزەیستان، نابێ قورئان بخوێنن).

**٣ـ** فەرمودەیەکی تریش ئەگوازنەوە کە پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**) لەنامەیەکیدا بۆ (**عەمری کوڕی حوزام**) ئەینێرێ ئەم دەستەواژەیەی تێدا ئەنووسی: "**ولا یمس القرآن الا طاهر**"، کە ئەبوداودو دارەقوتنی ریوایەتی ئەکەن.[1]..

**٤ـ** ئەم فەرمودەیەش ئەکەنە بەڵگە کە حەزرەتی عەلی ئەیفەرموێت: (کان رسول الله (**صلی الله علیه وآله وسلم**) **لا یحجبه عن القرآن شيء لیس الجنابة**) (**رواه الترمذي وصححه**).

لەو بەڵگانەو ئیجتیهادی زۆرێك لە زانایانەوە هەوادارانی ئەم رایە پێ لەسەر ئەوە دائەگرن کە نە (**خوێندنەوەی قورئان**)و نە (**دەست لێدان**)ی نە (نووسینەوەی) **دروست** نییە بۆ کەسێك نەبێت کە دەستی بە دەستنوێژەوە بێتو هیچ بێنوێژییەکی گەورەو بچوکی پێوەنەبێت.

بەڵگەی دەستی زانایانی پشتیوان بۆ رای دووەم:

ئەم زانایانە دوو جۆر بەڵگە دێننەوە بۆ رایەکەی خۆیان:

جۆری یەکەم: وەڵامدانەوەی هەموو ئەو بەڵگانەی کە دەستەی یەکەم ئەیهێنن بۆ پشتگیری رایەکەیان.

جۆری دووەم: هێنانەوەی باسە کە بۆ سەر (ئەسڵی بەرائەتەکەی).

ئەم زانایانە بۆ وەڵامی هەریەك لەو بەڵگانەی پێشوو ئەفەرموون:

**١ـ** ئەو ئایەتەی ئەوان ئەیکەن بە بەڵگە لە جێگەی خۆیدا نییە، چونکە:

**أـ** ئەو ئایەتەی سورەتی (**الواقعة**) باسی (**لوح المحفوظ**)و ئاسمان و مەلائیکەت ئەکات و هیچ پەیوەندییەکی بە زەویو مرۆڤو قورئانەوە نییەو ئەمەش ئەسەلێمنن بەوەی:

---

[1] بۆ درێژەی ئەم باسە سەیری: (الفقه الاسلامي وادلته، وهبة زحیلي، (١/٤٥٣ء) و "التفسیر المنیر"ی هەمان نووسەر (٣٠٢/١٤) بکە.

ـ خوای گەورە ئەفەرمویت "**في كتاب مكنون**"، "مکنون"یش یانی شاراوەو پاریزراو کە لە راستییدا دەستی تەنیا (مەلائیکە) پاکەکانی پیێ ئەگات، بەلام قورئان شاراوە نییەو لە دەستی کافرانو بیباوەرانیش پاریزراو نییەو ئاشکرایەو هەموو دەستی بۆ ئەبەن، ئیبن حەزم ئەلێت: "**لا حجة لهم فيه لانه ليس أمرا وإنما هو خبر والله تعالى لا يقول الا حقا ولا يجوز أن يصرف لفظ الخبر الى الأمر الا بنص جلّي أو إجماع متيقن، فلما رأينا المصحف يمسه الطاهر وغير الطاهر علمنا أنه لم يعن المصحف وإنما عنى كتابا آخر**".[1]

ـ راناوی سەر (**يمسه**) بۆ قورئان ناگەرێتەوە، بەلکو بۆ (كتاب مكنون) ئەگەرێتەوە کە (**اللوح المحفوظ**)ە، چونکە زانستی (**نحو**) ئەلێت: "**إذا دار الضمير بين القريب والبعيد فبالقريب أولى**". و نزیکترین (**مذكور**)یش (**اللوح المحفوظ**)ە کە بە (**كتاب مكنون**)ناوبراوە.

ـ ئەلێن صیفەتی (**المطهرون**) صیفەتێکی مەلائیکەتییە، نەك صیفەتێکی بەشەری، ئەگەر وانەبوایە ئەبوو بیفەرموایە (**لايمسه الا المتطهرون**) کە ئەو کاتە ئەبوویە صیفەتێکی "کەسبی"، نەك "**جبلي**"و "**كوني**".

هـ ـ ئەم ئایەتە هاوتای ئەو ئایەتەیە کە ئەفەرموێ: (**كَلَّا إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ * فَمَن شَاء ذَكَرَهُ * فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ * مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ * بِأَيْدِي سَفَرَةٍ * كِرَامٍ بَرَرَةٍ**) (عبس: ١١ـ ١٦).[2] ئەم رایەش رای "**ئیمامی مالیکە هەروەك شێخ ئەحمەد موحەممەد شاکر**" لێوەی ئەگوازێتەوە.

ز ـ ئەلێن ئەگەر "**لايمسه**" بۆ "**نهي**" بەکاربێت قسەیەکی لاوازە، چونکە ئەوکاتە ئەبێ لە (**محل**)دا وەك "**صفة**" رۆڵ ببینێتو وشەی "**تنزيل**" کە بە دوایدا بێت، وشەیەکی بێگانە ئەبێتو ماناکەی دروست نایەتەوە.

**٢ـ** ئەو حەدیسانەش کە ئەیکەن بە بەلگە بۆ رایەکەیان هەریەکەیان زیاد لە تێبینیەکی لەسەرە:

---

[1] المحلی، لإبن حزم ٧٧/١.

[2] **دکتۆر** وهبة زحيلي **له** (التفسير المنير، ٣٠٢/١٤)دا بە حەزەرێکی زۆرەوە بەرگری لەم رایە ئەکاتو کێ ئەیەوێ بابگەرێتەوە سەری.

أ ـ ئەو حەدیسەی کە ئەفەرموێ "**ولایمس القرآن الا طاهر**" زیاد لە زانایەکی فەرمودەناس ئەفەرموون: (**ضعیف**)ە، و حەدیسی (**ضعیف**) یش لە "ئەحکام"دا بەکارنابرێتو ئیشی پێناکرێت.. لەو زانایانەی کە بە (**ضعیف**)ی ئەزانن: "ئیبن حەجەری عەسقەلانی"یە لە "بلوغ المرام"دا ئە ئەفەرمووێ: "**معلول**"ە.. هەروەها ئیمامی "**طبرانی**" ئەفەرموێ: "**في إسناده سوید ابن أبي حاتم وهو ضعیف**". لە "**الجامع الأوسط**"یشدا ئەفەرموێ: "**تفرد به سوید**"، هەروەها ئیمامی "نەوەوی" و "ئیبن حەزم" و "ئیبن کەسیر"یش بە هەمان شێوە بە "**ضعیف**"ی ئەزانن.

ب ـ حەدیسی "**لایقرأ الجنب والحائض شیئاً** من القرآن"یش بە "**ضعیف**" ئەزاننو بۆ نموونە:

١ـ (ئیبن حەجەر) لە "فتح الباري: (٣٢٤/١)دا ئەفەرموێ" أما **حدیث** ابن عمر مرفوعا (**لایقرأ الحائض** ولا **الجنب شیئا** من **القرآن**" **ضعیف من جمیع طرقه**.

٢ـ ئیمامی بوخاریو ئیمامی نەوەوی لە (المجموع: ١٥٥/٢)داو "البیهقی"یش بە هەمان شێوە حەدیسەکە بە "**ضعیف**" ئەزانن.

٣ـ **الدارقطنی** و راڤەکەری "**الدارقطنی**"یش واتە: "**العظیم آبادی**" هەر بە "**ضعیف**"ی ئەزانن ئەم ئەڵێ: لە سەنەدەکەیدا ئیبراهیمی کوڕی ئەحمەدی کوڕی مەروان هەیە کە کەسێکی (**ضعیف**)ەو ئەویش واتە (**دارقطنی**) ئەفەرموێ: "یەحیا کوڕی ئەنیسە" لەسەنەکەدەیدا هەیەو کەسێکی "**ضعیف**"ە.

ج ـ حەدیسی "**کان رسول الله لایحجبه عن القرآن شيء لیس الجنابة**"ش بەوە رەت ئەکەنەوە کە زۆرێك لە زانایانی وەك (ئیبن حەجەر)و (نەوەوی)و (بەیهەقی)و "بوخاری"و "شافعی"و "إبن جارود"و "دارقطنی" بە **ضعیفی** ئەزانن و ئەشفەرموون ئەگەر "حسن"یش بێت ئەو ە "ئیبن حەجەر" رەخنەیەك لە ئیستیدلال پێکردنی بۆ ئەم رایە ئەگرێتو ئەفەرموێت: "**في الاستدلال به نظر لأنه فعل مجرد لا یدل علی تحریم ماعداه**" (**الفتح الباري: ٣٢٤/١**). و پاشان ئەفەرموێ: "**وأجاب الطبري بانه محمول علی الأکمل جمیعًا بین الأدلة**".

هەروەها ئەشفەرموون: "ئەم حەدیسە دژ بەو حەدیسەی عائیشەبە کە لە "صحیح مسلم"دا هەیە کە ئەفەرموێ "کان النبی (صلی الله علیه وآله وسلم) **یذکر الله علی کل أحیانه**".

٣ـ دەربارەی ئەوەش کە لەفزی "**طاهر**" ئایا "**قطعي الدلالة**"یە لەوەدا کە تەنیا مانای دەستنوێژ بگەیەنێو چ "**المتطهرون**"ی ئایەتەکەو "**طاهر**"ی حەدیسەکەی "عمرو بن حزام"، یان "**طاهر**" یەکێکە لە "موشتەرەکاتی لەفزی"و بە چەند مانا دێتو کەواش بێت نابێ هەروا بەبێ "مص جلّی" یان "ئیجماعێکی بێگومان" ببڕێت بەسەر یەکێك لە ماناکانیدا.

زانایانی پشنیوانی لە رای دووەم ئەفەرموون: لەفزی "**طاهر**" لە زمانی عەرەبیو لە زمانی شەرعیدا چەند مانای هەیە:

أ ـ "**طاهر**" بە مانای (موسڵمان) دێت، خوای گەورە ئەفەرموێ: "**إنما المشركون نجس**" دڵنیابن کە کافرەکان پیسن، کەواتە موسڵمانەکان پاکنو "**طاهر**"ن.

ب ـ "**طاهر**" بە مانای ئەوە دێت لەشی پیس نەبێت، خوای گەورە ئەفەرموێ: وان كنتم جنبا **فاطهروا**"، کەواتە کەسێك لەش پیس نەبێت "**طاهر**"ە، و "**حيض**"یش هەر لە مانای "**جنب**"دایەو کە ئافرەتەکە خۆی شۆرد ئیتر "**طاهرة**"یە.

ج ـ "**طاهر**" بە مانای دەستنوێژیش دێت وەك پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەفەرموێ: "**كرهت أن اذكر الله الا على طهرا أو طهارة**". "**رواه أبوداود والحاكم وصححه، وقال على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي**" کەواتە "**طاهر**" لێرەدا بە مانای دەستی بە دەستنوێژ دێت.

د ـ "**طاهر**" بە کەسێك ئەوترێ یان بە شوێنێك ئەوترێ کە "**نجاسة**"ی بەسەرەوە نەبێت، ئەوترێ "**طهارة المكان**"، یان "**طهارة البدن**"، یان "**طهارة اللباس**".[1].

کورتەی قسەکان ئەوەیە کە لەفزی "**طاهر**" ئەو چەند مانایە بگەیەنێ کەواتە هەروا بەبێ (قرینه) ناکرێت ببڕێت بەسەر مانایەکی تایبەتدا بۆیە هەڵدەگرێ کە مەبەست بەو ئایەتە، یان ئەو حەدیسانە ئەوبێ کە دروست نییە کەسی کافر، یان کەسێکی لەش پیس، یان کەسێك جلەکانی، یان لە شوێنی پیسدا بێت، دەست بدات بە قورئانەوە[2]...

---

[1] ئەم موناقەشانەو زیاتر لەمانەش لە دەستنوسێکی چاپ نەکراوادیە بەناوی (اسكات الحائض في تحريم مس المصحف للحائض) کە مەکتەبی فەتواو دیراساتی شەرعی سەر بە راپەرینی ئیسلامی لە ٤/صفر/١٤١٨دا نووسیویانە...

[2] ئیمامی نەوەی لە (التبيان، پەراویزی المفردات ص٦٠٢)دا ئەفەرموێ: "ئەگەر پیسییەکە بەسەر لەشی کابرای بەدەستنوێژەوە بوو دروست نییە دەست بدات لە قورئان..".

ئەمە بە کورتی راوبۆچوونی زانایانی پشتیوان بوو لەو رایەی کە ئەفەرموێ "بەبێ دەستنوێژ دروست نییە دەست بدرێت لە قورئان، یان بخوێنرێ"، هەروەها ئەوەش بەڵگەی ئەوانەی کەوا ناڵێن. پێش ئەوەی قسەی دروستو (راجح) لەم مەسەلەیەدا (بەبێدەستنوێژ نابێ قورئان بخوێنرێت و دەستی لێ بدرێت) بکەین، بەکورتی ئەبێ بڵێین:

١- بەراستی ئالۆزترین پرسێك لەم مەسەلەیدا لە چۆنێتی مامەڵە لەگەڵ قورئاندا بریتییە لەم پرسە کە یەکێکە لەو مەسەلانەی یان دەلیلەکانی زۆر کەم و لاوزان، یان هەر دەلیلی نییە، کەچی زۆر سەیرە خەریکە جۆرێك لە (ئیجماع) لەناو زانایانی ئیسلامدا لەسەر ئەوە دروست بێت کە دەستدان لە قورئان یان خوێندنی بەبێ دەستنوێژ دروست نییەو نابێت قورئان وەك هەر کتێبێکی تر سەیر بکرێت، بەڵکو پێویستە زۆر بە هەیبەتەوە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.. تەنانەت زۆرێك لە زانایان بە دروستی نازانن دەست لە بەرگی قورئانیش بدرێت مادامێك لکاوە بە قورئانەکەوەو بووەتە پارچەیەك لێی، کاتیك نەبێت ئەو بەرگە، بەرگێکی سەربەخۆ بێت و وەك کیفێك قورئانەکەی تێدا هەڵگیرا بێت.

٢- پێویستە رێز لەو هەمووە فەتوایەی زانایانی ئیسلامی بگیرێتو بەبێ دەستنوێژ دەست لە قورئان نەدرێتو پەرەکانی هەڵنەدرێتەوەو نەخوێنرێتەوە، بەڵام ئەگەر (لەبەر) قورئانەکە بخوێنێت یان کەسێکی تر پەرەکانی بۆ هەڵبداتەوە یان بە دارێك یان شتێکی تر پەرەکانی ئەمدیو دیو بکات ئەوە دروستە بۆی بەبێ دەستنوێژ قورئانەکە بخوێنیێو خەتمیش بکات. ئیمامی "نەوەوی" لە "التبیان"ەکەیدا ئەفەرموێت: **"یستحب أن یقرأ وهو علی طهارة، فان قرأ محدثا جاز باجماع المسلمین، والأحادیث فیه کثیرة معروفة، قال الامام الحرمین: ولا یقال ارتکب مکروها بل هو تارك الأفضل"**.[1] نەك هەر ئەمە، بەڵکو ئیمامی نەوەوی شتێکی سەیر ئەفەرموێت کە جێگەی سەرنجە و ئەگەر ئەو نەیفەرموایە جێگەی بروانەدەبوو: ئەفەرموێ: **(فصل: في مسائل غریبة تدعو الحاجة إلیها، منها: انه اذا کان یقرأ منعرض له ریح فینبغي أن یمسك عن القراءة حتی یتکامل خروجها، ثم یعود الی القراءة)**[2]!! واتە: .. کاتیك قورئان خوێن خەریکی خوێندنی قورئان بوو "بایەکی لێ بوویەوە" پێویستە دەست لە قورئان خوێندنەکەی هەڵگرێت تا بە تەواوەتی "بالێبوونەکەی" نامێنێ، پاشان دەست بە قورئان خوێندنەوەکەی بکاتەوە!!

[1] التبیان في آداب حملة القرآن، ص٥٦٣، پەراوێزی المفردات، محمد الحمصس.

[2] هەمان سەرچاوە، ص٥٧٠ی (مفردات القرآن).

جا بۆیه (والله أعلم) قسەی کار بڕو (راجیح) لەم مەسەلەیدا ئەوەیه کە:

١ـ ڕۆیشتن لەگەڵ ئەو زانایانەدا کە بە دروستی نازانن بەبێ دەستوێژ دەست لە قورئان بدرێت کارێکی سەلامەتەو (عەینی ئەدەبە) لەگەڵ قورئان و قسەی خواداو زانایانیش زوو فەرموویانە "من قلّد عالما لقى الله سالما".[1]

٢ـ ئەگەر کەسێك ناچار بوو، یان خەریکی دەرس وتنەوە بوو، لەسەری نارەحەت ئەبوو کە حەتمەن هەر ئەبێ دەستنوێژ بگرێتەوە، ئەوە "والله أعلم" لەسەر مەزهەبی ئەو زانایانەی کە رایان وایە دەستنوێژگرتن بۆ قورئان خوێندن (فەرز) نییەو (سوننەتە)، ئەتوانن بەبێ دەستنوێژو بەبێ (حەرەج) دەست لە قورئانەکە بدەنو قورئان بخوێننو بیلێنەوە.

٣ـ هەرکەسیش هەر لە سەرەتاوە دڵی لەسەر فەتوای زانایانی رای یەکەم دانەئەمەزرا ئەوە (إن شاء الله) گوناهبار نابێتو بەڵکو وەك ئیمامی حەرەمین فەرمووی: "پێی ناوترێ تووشی کەراهەتێك بووە، بەڵکو پێی ئەوترێ چاکەکەیەکی باشی لەدەست خۆی دەرکردووە"و فەتواکەی ئیمامی (**طبری**)ش هەروایە کە ئەفەرموێ: "ئەو نەهییانە بەوشێوە مانا ئەکرێن کە ئیشێکی باشە ئەگەر وابکاتو خێری ئەگاتێ، بۆ ئەوەی هەموو بەڵگەکان پێکەوە کۆبکرێنەوە".

## باسی پێنجەم: وەرگرتنی پارە لەسەر قورئان وتنەوە

زانایانی ئیسلام دەربارەی ئەو کەسانەی کە پارە و کرێیەك وەردەگرن لەسەرە ئەوەی کە قورئان بە خەڵك دەڵێنەوە سێ قسە دەکەن:

هەندێ ئەفەرموون: دروست نییە کرێ و پارە وەربگرێ لە سەر قورئان وتنەوە، چونکە ئەرکێکی شەرعی سەرشانیەتی کە ئەم قورئانە بگەیەنێتە خەڵکی لەسەر واجباتیش کرێ وەرناگیرێ، بەڵکو ئەبێ چاوەروانی پاداشتی قیامەت بکەی لە لای خوای گەورە.

هەندێکیش ئەفەرموون: دروستە پارە لەسەر قورئان وتنەوە وەربگیرێ و هیچی تێدانییەو بەڵگەشیان ئەوەیە کە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) لە حەدیسی ئیمامی بوخاریدا ئەفەرموێ: (**أن احق ما أخذتم عليه اجرا كتاب الله**).[1]

---

[1] تربية الأولاد في الاسلام، ٢/٢٧٢.

هەندێکی تر ئەفەرموون: پێویستە پارەکە لەسەر ئەوە وەربگرێ کە فێری خوێندنەوەو قورئان لەبەرکردنی ئەکات، نەك فێری خوێندنی قورئانی ئەکات..زانایان تەقسیمبەندیەیکی جوانیان کردووە بۆ ئەم بابەتەو لەناو ریزبەندییەکدا حوکمی هەر بەشەیان بە جیا باس کردووە، نصر بن محمد السمرقندی لە کتێبی "**بستان العارفين**"دا ئەفەرموێ: "قورئان وتنەوە بە خەڵکی سێ شێوەی هەیە: یەکەم: لەبەرخاتری خوا ئەیلێتەوەو بەتەما نییە کرێی لەسەر وەربگرێ. دووەم: بەکرێ کارەکە ئەکات. سێیەم: بەبێ مەرجی پێشوەخت قورئان ئەڵێتەوەو بەڵام ئەگەر دیارییەکان بۆ هێنا وەریئەگرێت..". جا حوکمی هەریەکەیان باس ئەکاتو ئەفەرموێت: "یەکەمیان: خوای گەورە پاداشتی باشی ئەداتێ و ئەو کارەشی کاری پێغەمبەرانە (علیهم الصلاه والسلام). دووەمیان: زانایان دوو قسەیان لەسەری هەیە، هەندێ ئەفەرمون: دروست نییە، چونکە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەفەرموێ: (**بلّغوا** عنى ولو **آية**). واتە: لە جیاتی من خەڵکی فێری قورئان بکەن، ئەگەر ئایەتێکیش بێت. هەندێکیش ئەفەرموون: دروستە، بەڵام واباشە مامۆستاکە مەرجەکە بۆ (**حفظ وكتابة**)ەکە دابنێ ــ نەك قورئان خوێندنەکە ــ ، خۆ ئەگەر مەرجەکەشی بۆ قورئان خوێندنەکە دانا ئومێد دەکەم هیچی تێدا نەبێت، موسڵمانانیش پشت بە پشت ئەمەیان هێناوەو پێویستیان پێی بووە.

ئەمما بۆ سێیەمیان: زانایان هەموویان هەر بە دروستی ئەزانن، چونکە پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) خۆی مامۆستای هەموو خەڵکی بوو، هەر دیارییەکی بۆ بهاتایە قەبوڵی ئەکرد، پاشان ئەو فەرمودەیەش بەڵگەیە صەحابیەکە کە دوعای (**فاتحة**)ی خوێند بەسەر کابرای نەخۆشدا کە دووپشك پێوەی دابوو، کرێیەکی باشیان پێ داو وەرگرتوو پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) پێی فەرموو: "**واضربوا لي معكم فيها بسهم**).[1] واتە: پشکێکیش دابنێن بۆ من لەگەڵ خۆتاندا.[2]

---

[1] صحيح البخاري، كتاب الطب، باب الشرط في الرقية بقطيع من الغنم.

[2] مباحث في علوم القرآن، مناع القطان، ص١٨٣و ١٨٤.

## باسی شەشەم: جێبەجێ نەكردنی هەندێ لە داواكانی قورئان

زۆر كەس ئەوەی بۆ ئەبێتە كێشە، ئایا ئەوەی لە قورئاندا هاتووە لە (أمر)و (نهی) ئەركی سەرشانی موسڵمانو قورئان خوێن نییە كە هەمووی جێبەجێ بكات؟ ئەی باشە حوكمی ئەو كەسانە چییە كاتێك ئەبینی چەندین ئایەت هەیە كە ئەو جێبەجێی نەكردوونو گوێشی ناداتێ، حوكمی چییە، چارەسەریش بۆ ئەو حاڵەتە چییە؟

قورئانی پیرۆز بۆ هەموو مرۆڤەكان هاتووە و خوای گەورەش ئەیەوێ مرۆڤەكان پلە پلە بەم قورئانە بەرەو كەماڵ بەرێتو بەرزیان بكاتەوە، خوای گەورە ئەزانێ مرۆڤەكان هەموو یەك تواناو لێهاتوویان نییە، بۆیە ئیمان پلە پلەیەو بەهەشتیش بەو بۆنەیەوە پلە پلە كراوە، ئیمانی ئەبوبەكری صدیق وەك ئیمانی صەحابەیەكی تر نیەو ئیمانی صەحابەیەك وەك هی ئێمە نییەو ئێمەش لەناو خۆماندا هەموو وەك یەك نین لە پلەكانی ئیماندا، هەمانە زۆر بە دین، هەشمانە كەمترو هی واش هەیە لەناو ماندا مەگەر خوا لوتفی لەگەڵدا بكات ئەگینا زۆر وێرانو ئیمان لاوازە، بۆیە ئەفەرموێت: (**إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلاً كَرِيماً**) (النساء: ٣١). واتە: بەو مەرجەی كە لە گوناهە گەورەكان خۆتان بەدووربگرن، ئێمە گوناهەكانتان ئەپۆشینو ئەتانخەینە شوێنكی سوودبەخشو پیرۆزەوە.

"ئیبن كەسیر"ی موفەسیر ئەفەرموێ: "عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاص لە میسردا چەند كەسێكی ـ توندڕەو ـ كەوتنە پرسیار لێكردنی و وتیان: ئەرێ! ئێمە زۆر شت ئەبینین لە قورئاندا (فەرمانی) پێ كراوە، كەچی خەڵكی كاری پێناكەنو گوێی نادەنێ، بۆیە بە راستی ئەمانەوێ بە خزمەت ئەمیری موسڵمانان بگەینو ئەم ئیشكالە گەورەیەی لا باس بكەین، ئەویش لەگەڵ خۆیدا بردنی بۆ مەدینەو چوویە خزمەتی عومەری كوڕی خەتتاب (خوای لێ رازی بێ) حەزرەتی عومەر فەرمووی: كەی هاتوویت؟ عەبدوڵلا وتی: لە فلانە رۆژەوە هاتووم، عومەر فەرمووی: بە مۆڵەتی رەسمی هاتووی؟ "حەسەن كە راوی حەدیسەكەیە، ئەڵێ": نازانم چۆن وەڵامی ئەو پرسیارەی دایەوە، پاشان عەبدوڵلا وتی: قوربان ـ ئەمیری موسڵمانان! هەندێ خەڵك لە میسردا پرسیارو ئیشكالاتێكی زۆریان هەیە دەربارەی قورئانو ئەڵێن ئێمە شتێكی زۆر لە قورئاندا ئەبینین فەرمان كراوە بە كردنیان، كەچی خەڵكی نایان كەنو نابنین بیانكەن، جا حەزیان كرد بێنە خزمەت جەنابت بۆ ئەو

مەسەلەیە، عومەر فەرمووی: دەبرۆ کۆیان بکەرەوە بۆم، عەبدوڵڵا ئەڵێ لە (بەهو) واتە: خانوویەکی تایبەتدا[1] کۆم کردنەوە بۆیو عومەر تەشریفی هێناو کەوتە قسەکردن لەگەڵیانداو لە نزیکترین کەسیانەوە لە خۆی دەستی پێکردو فەرمووی: بە خوا سوێندت ئەدەم و بە مافی ئەم دینی ئیسلامە لەسەرت ئەتدوێنم راست وەڵامم بدەرەوە ئایا هەمو قورئانت خوێندۆتەوە؟ کابرا وتی: بەڵێ، فەرمووی: "دەی باشە هەموویت بەسەر دەروونی خۆتدا جێبەجێ کردووە؟ کابرا وتی: سوێند بە خوا نەخێر.. ئەگەر بیوتایە بەڵێ، یەخەی ئەگرت، (و ئایەت ئایەت هەمووی ئەپرسی لێی) پاشان فەرمووی: ئەی بەسەر چاوتدا جێبەجێت کردوون؟ ئەی بەسەر دەمو قسەکردنتا جێبەجێت کردوون؟ ئەی بەسەر شوێنەوارو جێگەتەوە دەرکەوتوون... یەك یەك ئەم پرسیارانەی لە هەموویان ئەکردو موناقەشەی ئەکردن... پاشان فەرموو: دایك رۆڵەرۆ بۆ عومەری کوری خەتتاب بکات، ئێوە ئەتانەوێ عومەر بێتو ئەو خەڵکە بەم قورئانە گەزو پێوانە بکات؟ خوا خۆی باش ئەزانێ کە ئێمە ئەکەوینە ناو گوناهو تاوان بۆیە ئەفەرموێ: **(إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلاً كَرِيماً) (النساء: ٣١)**. پاشان فەرمووی: خەڵکی مەدینە ئاگای لێتان هەیە؟ عەبدوڵڵا ئەڵێ: یان وتی: کەس لە خەڵکی مەدینە پێی زانیون کە هاتوون؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: خوا ئەزانێ ئەگەر خەڵکی مەدینە بەمەیان بزانیبا ئەمکردن بە پەند بۆیان".[2]

لە "عەبدوڵڵای کوری عەباس"یان پرسی: گوناهە گەورەکان چەندن، حەوتن؟ ئیبن عەباس فەرمووی: **"هن الى سبعمائة اقرب منها الى سبع، غير أنه لا كبيرة مع استغفار ولا صغيرة مع أصرار"**.[3] واتە: گوناهە گەورەکان لە حەفتا نزیکترن تا لە حەوت، بەڵام ئەوە هەیە کە گوناهـ بە گەورەیی نامێنێتەوە ئەگەر تۆبەی بەردەوامی لەگەڵدا بکرێتو گوناهیش بە بچووکی نامێنێتەوە ئەگەر بەردەوام خەریکی بیتو دەستی لێ هەڵنەگری.

---

[1] ریوایەتەکە ئەفەرموێ: "فی بهو" کە لە فەرهەنگدا بە (بهو) ئەوترێ: خانوی تایبەت بە کەسی غەریبو میوان، یان بە هۆڵی (پێشوازی ئەوترێت (بەهو).

[2] مختصر تفسیر ابن کثیر، (١/٣٨١).

[3] مختصر تفسیر ابن کثیر، (١/٣٨١).

لەمەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە راست نییە قورئان و هەموو وردەکارییەکانی بکەیتە پێوەر و مرۆڤەکانی پێ گەز بکەیتو ئەگەر لە ئایەتێك یان دواندا کورتیان هێنا، خێرا فەتوای کافریی، یان مونافیقیان بدرێت بەسەردا، قسەکەی حەزرەتی عومەر مەشخەڵێکە لە رێگەدا کە ئەفەرموێ: "قد علم ربنا أن ستكون لنا سيئات"، بۆیە ئەفەرموێ: (إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلاً كَرِيماً) (النساء: ٣١). رەچاونەکردنی ئەم فیقهەی حەزرەتی عومەر بوویە هۆی ئەوەی دەستەی (خەواریج) دروست بوونو فەتوای کافری دنیایان دەرکرد کە یەکێك لەوانە حەزرەتی "عەلی" بوو.

## باسی حەوتەم: دەرکردنی جنۆکە لە لەشدا بە قورئان خوێندن

لە سەردەمی ئێستاماندا بابەتێك بووەتە جێگەی مشتومڕی نێوان موسڵمانان ئەویش ئەوەیە ئایا جنۆکە ئەتوانێ بچێتە ناو لەشی مرۆڤەوەو کۆنترۆڵی ئەو کەسە بکات و ئەو جنۆکەیە چی بووێ بەو مرۆڤەی بڵێتو و بیکات؟ زانایانی ئیسلامیی سێ رای جیاوازیان هەیە لەم مەسەلەیدا.

رای یەکەم: جنۆکە لەچەند حاڵەتی زانراودا ئەتوانن بچنە ناو مرۆڤەوە و کۆنترۆڵی لە دەست بسەننو خۆیان چییان ویست بەو مرۆڤەی بکەن.

رای دووەم: جنۆکە بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان دەسەڵاتی ئەوەیان نییە بچنە ناو مرۆڤەکانو پاش ئەوە کونترۆڵی بکەن و بەوان قسە بکەنو بەوان شت بکەن.

رای سێیەم: کە بریتیە لە رای دکتۆرە جەستەییو دکتۆرە دەروونییەکانیش رایەکەش ئەویە کە حاڵەتی (مس)یان (جنۆکە چوونە لەش)، بریتییە لە جۆرێك لە نەخۆشی دەروونیو بەو شێوەیەش ئاسەواری خراپ لەسەر جەستەی مرۆڤ دروست دەبێت.

بەڵگەی زانایانی پشتیوان لە رای یەکەم: ئەم زانایانە ئەفەرموون: خوای گەورە لە قورئاندا و پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) لە سووننەتەکاندا و زانایانی موعتەبەر لە مێژووو لە ئێستادا بڕوایان بە کاری وەها هەبووەو مامەڵەشیان لەگەڵیدا کردووە.. ئێمە زۆر بە کورتی بەڵگەکانیان ئەڵێین:

١ـ خوای گەورە ئەفەرموێ: (**الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ**) (البقرة: ٢٧٥). واتە: ئەوانەی کە (سوو) ئەخۆن کاتێك لە گۆڕەکانیان

دێنه دەرەوە وەك ئەو كەسەی كە شەیتان چووبێتە لەشی هەر سەر سمت ئەداتو ئەكەوێ بەملاو لادا.. كەواتە شەیتان و جنۆكە ئەتوانن بچنە لەشی مرۆڤەوەو كۆنترۆڵی لەدەست بسەنن.

٢ـ پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەفەرموێ: (**إن الشيطان يجري في بني آدم مجرى الدم) رواه البخاري**، واتە: شەیتان بەهەموو ئەو شوێنانەدا ئەڕوات كە خوێن پێیدا ئەڕوات لە لەشی ئەم مرۆڤەدا، كەواتە شەیتان و جنۆكە ئەتوانن لە لەشی مرۆڤدا بێنو بچن.

٣ـ كەسێكی نەخۆشیان هێنایە لای پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەویش دەمی كردەوەو فەرمووی: "اخرج عدوّ الله، أنا رسول الله"، دەربچۆ لەلەشی ئەی دوژمنەكەی خوا، من پێغەمبەری خوام، كەواتە شەیتان و جنۆكە ئەچنە لەشی مرۆڤو ئەتوانرێت دەربكرێت.

٤ـ زانایانی وەك ئیمامی ئەحمەدو شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەو جگە لەوانیش لە كۆنداو بن بازو شێخ **عثيمين** لە زانایانی هاوچەرخدا بڕوایان بەوە بووە كە جنۆكە بچێتە لەشیی مرۆڤو هەوڵی دەركردنیشیان داوە و سەركەوتوویش بوون لەو هەوڵانەیاندا.

بەڵگەكانی رای دووەم: ئەم زانایانە بڕوایان وایە كە نەشەیتانو نە جنۆكە دەسەڵاتی وایان پێنەدراوە كە بچنە ناو مرۆڤو كۆنترۆڵی جەستەیی بكەنو داری لەدەست بسەنن، بەڵگەشیان ئەوەیە كە:

١ـ خوای گەورە ئەفەرموێ: (**إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ) (الأعراف: ٢٧)**. شەیتانو خیڵی شەیتان (جنۆكە) ئێوە ئەبینن، بەڵام ئێوە ئەوان نابینن.

٢ـ شەیتان تەنیا ئەوەندە ئەتوانێ كاریگەری لەسەر ئەم مرۆڤە دابنێ كە وەسوەسە و خەیاڵاتی بۆ دروست بكات، نەك بچێتە ناویو كۆنترۆڵی جەستەیی بكات.

٣ـ هەموو ئەو بەڵگانەش ئەهێنرێنەوە بۆ (مس)ی شەیتان و جنۆكە یان (صحيح) نین لە رووی (سند)ەوە، یان (صريح) نین لە رووی (متن)و ماناوە. بۆ نموونە ئەفەرموون:

أ ـ ئایەتەكەی سورەتی (البقرە): (**كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ) (البقرة: ٢٧٥)**. ئەمە نموونە هێنانەوەیە، نەك هەواڵ گواستنەوە، واتە: خوای گەورە نموونەو میسال دەهێنێـەوە، نەك هەواڵی رووداني شتێكی دابێت بە خەڵكی وەك ئەڵێی" فلانەكەس بە ملاولادا ئەكەوێ وەك ئەوە وایە: قەڕابەیەك مەی خوماردبێتەوە تۆ لێرەدا نموونە دێنێتەوە، نەك هەواڵی راستی رووداوێك بگوازیتەوە.

ب ـ حەدیسی **"الشیطان یجری من ابن آدم مجری الدم"**، باسی (مس) ناكات وەگەرنا ئەوە هەرچی مرۆڤەكان هەیە هەمووی (ممسوس)ن، دەی خۆ لە راستیشدا وانییەو مرۆڤەكان با شەیتانیش بە هەموو دەمارەكانیاندا هاتوچۆ بكەن، كەچی زۆر سروشتینو حاڵەتی (مس)یان بەسەردا نەهاتووە.

ج ـ حەدیسی (أخرج عدو الله انا رسول الله)ش حەدیسێكی (**ضعیف**)ەو لە مەسەلەیەكی ترسناكی وەهادا "ئیستدلالی" پێناكرێت".[1]

بەڵگەی دەستەی دكتۆرە جەستەییەكانو دەرونییەكان: ئەم دكتۆرانە براوایان بەشتێك هەیە كە پێی ئەوترێ (نەخۆشی دەروونی) كە زیاتر لە رێگەی (**ئیحاء**)ەوە دروست ئەبێت، "**ئیحاء**"یش دوو جۆرە: لە ناوەوە بۆی بكرێتو لە دەرەوە بۆی بكرێت... یانی كەسێك كە لە ناوەوە ئەوەندە بە خۆی بڵێ: من نەخۆشم.. تەواو نیم.. ئەمرم.. جنۆكە دەستی گەیشتوە پێم.. من تازە بەكەڵكی هیچ نەماوم.. كەس منی ناوێ... هتد. ئەو كەسە زۆر نابات نەخۆش ئەكەوێو حاڵەتی دەروونی تێك ئەچێتو تیائەچێت.

یان كەسێك كە لە دەرەوەی دەروونی خۆیەوە ئەوەندە پێیان وت: تۆ بە كەڵكی هیچ نایەیت، تۆ نەخۆشی.. تۆ درندەی.. تۆ ئەمەو ئەوەیت.. زۆر نابات ئەو كەسە حاڵەتی دەروونی تێك ئەچێتو توشی ئەو شتانە ئەبێت كە بەردەوام (**ئیحاء**) ئەكرێت بۆی.

ئەم (ئیحائە خارجییە)یان ئەم (ئیحائە داخلییە) دوو مەسەلەی سەلمێنراون لە زانستداو هەندێ جار بەوە تەعبیر ئەدرێتەوە كە ئەم (ئیحائە) بریتییە لە: "بەرمەجەكردنی مرۆڤ بە شتی چاك، یان بە شتی خراپ"، هەركەسێك منداڵەكەی خۆی (بەرمەجە) كرد بە شتی (سلبی) ئەوە ئەو منداڵە لەسەر ئەو سلبیاتانە رایەتو تێیدا رەنگ ئەداتەوەو بە پێچەوانەشەوە ئەگەر لەسەر شتی (ئیجابیات) منداڵەكانی (بەرمەجە) كردو بەردەوام (**ئیحاء**)ی ئەو شتانەی بۆ ئەكردن ئەوە منداڵەكانی لەسەر شتی باش رایەنو گەشەی سروشتی ئەكەن.

بەڵام راستی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە كە:

١ـ شەیتان و خێڵی شەیتان (جنۆكە یاخییەكان) خوای گەورە دەسەڵاتی ئەوەی پێداون كە (**ئیحاء**) بكەن بۆ ئەم مرۆڤەو لەناوەوە تێكی بشكێننو دەست بگرن بەسەر دەروونیداو

---

[1] ئەڵقەیەكی زانستی لە كەناڵی (الرسالة)ی ئاسمانی بە سەرپەرشتی دكتۆر (طارق السویدان) بە وردی باسی ئەمانەی كردو تێیدا پسپۆرانی لە هەوادارانی هەرسێ رایەكە كۆكردبوویەوە.

حەزو ئارەزووی گوناهکردنو یاخیبوون لە ئاینو ئەرکە ئایینیەکانی تێدا دروست بکەنو وای لێ بکەن گوێ بۆ خواو پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) نەگرێتو گاڵتەی بە دینو دینداری بێت و کار بۆ لەبنوبێخ دەرهێنانی ئاییینیش بکات!! ئەمەش جێگەی "**ئیجماعی**" زانایانەو کەس نییە لەمە خۆی هەڵوێرێ... چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ:

أ ـ (**الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ**) (**الناس: ٥**) شەیتان وەسوەسە "**ئیحاء**" ئەکات لەناو سنگەکاندا (دڵو دەروندا) هەروەها ئەفەرموێ: (**وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ**) (**الأنعام: ١٢١**). واتە: شەیتانەکان سروش ئەکەن بۆپشتیوانەکانی خۆیانو ڕاسپاردەیان بۆ دائەبەزێنن.. کە دیارە ئەوەش بە (ئیحائی داخلی) ئەکەن، یان لەخەودا بۆیان ئەکەن.

ب ـ پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) لە چەندین فەرمودەدا باس لەوە ئەکات کە شەیتانەکان چۆن وەسوەسە بۆ مرۆڤەکان دروست ئەکەنو دەروونیان ئاڵۆز ئەکەنو فێری یاخیبوونو سنووربەزاندنیان ئەکەن بۆ نمونە ئەفەرموێ: "**الرؤيا الصالحة من الله والحلم من الشيطان، فمن رأى شيئا يكرهه فلينفث عن شماله ثلاثا وليتعوذ من الشيطان فانها لا تضره". متفق عليه.**[١]

واتە: خەوی باش لەلایەن خواوە دێت بۆ مرۆڤو خەوی خراپیش لەلایەن شەیتانەوە دێت بۆ مرۆڤ، هەرکەسێك خەوی بینیو پێی ناخۆش بوو با سێ جار بەلای چەپیدا فوو (یان تف) بکاتو خۆی بداتە پەنای خوا لە خراپەی شەیتان، ئیتر ئەو خەوە زیانی بۆی نابێت.

**٢ـ** ئیسلام بۆ بەرەنگار بوونەوەی شەیتان دوو جۆر چارەسەری داناوە:

یەکەمیان: بەهێزکردنی نەفسو دڵ بە کۆمەڵێکی زۆر ویردو دوعای تایبەتی ڕۆژانە کە مرۆڤ پابەندبێت پێوەیو ڕۆژانە بیانخوێنێت ئەوکاتە خوای گەورە ئەیخاتە ناو قەڵایەکی قایمو شەیتان ناتوانێ نە لە دەرەوەو نە لە ناوەوەی ئەو مرۆڤەوە هیچ جۆرە (**ئیحاء**)ێکی بۆ بکات، بەڵکو بە پێی حەدیسی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) شەیتان زۆر لاوازو ڕەنجخەسارانە لە دوورەوە لەم مرۆڤە ئەوەستێتو هەر داخ هەڵدەکێشێ[٢].. بۆ نموونە

---

[1] نزهە المتقین ٥٧٣/١.

[2] لە کتێبەکانی "حەدیس"دا بەم بابەتە ئەوترێت: "أذكار اليوم والليلة"، باشترین گرەنتی ئەوەیە مرۆڤی موسڵمان ئەگەر هەمووشیان نەخوێنێ، زیکرە (جامیعەکان) بخوێنێ وەك ڕێسا فقهییەکە ئەڵێ: "ما لا يدريك كله لا يترك كله"..

پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەفەرموێ: "هەر کەسێك کە لە ماڵ چوویە دەرەوە ئەم دوعایە بخوێنێت: "**بسم الله، توكلت على الله ولاحول ولا قوة الا بالله**"، مەلائیکەت لە ئاسمانەوە پێی دەڵێن: "هديت وكيفيت ووقيت"، واتە: کەوتیتە سەر رێگەی راستو هیدایەتو بەشی کیفایەتیش بەرگریت وەرگرتو قەڵغانیشت بۆ دانرا تا بتپارێزێ!.. شەیتانی ئەم مرۆڤە کە هەمیشە لەگەڵێدایە بە شەیتانێکی تر ئەڵێ: ئەبێ هەڵوێستی چۆن بێت لەگەڵ کەسێکدا کە پێی وتراوە (هديت وكفيت ووقيت).[1]

دووەمیان: ئەگەر شەیتان وەسوەیەکی بۆ مرۆڤ دروست کردو فێری بیرو بیرکردنەوەیەکی خراپی کردو گیرۆدەی کرد بە گوناهێکەوە یان رەوشتێکی نادروستەوە، ئیسلام چارەسەری بۆ داناوە کە سوود لە "دوعا"و "قورئان خوێندن" وەربگرێ، چونکە ئەم قورئانە وەك چۆن کتێبێکی پڕ بەرەکەتو هیدایەتەو پڕ لە تەشریعو یاسا جۆر بەجۆرە دینیو دنیاییەکانیشە، هەرواش کتێبێکی کەمەندکێشو کاریگەرە لەسەر (دەروون)و (رۆح)و (جەستە)ی ئەم مرۆڤەش، بۆیە صەحابەی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) سودیان لە قورئان وەردەگرت بۆ چارەسەری نەخۆشییە دەروونیو جەستەییەکانیش (فەرمودەی کابرای کە دووپشك پێوەی داو صەحابەیەك سورەتی (الفاتحە)ی حەوت دار بە سەردا خوێندو چاك بوویەوە، لێرەدا دیارترین بەڵگەیە).

خوای گەورە لە زۆر ئایەتدا باسی ئەوە ئەکات کە قورئان "موبارەکە و شیفا ئامێزە" وەك ئەفەرموێ: (**وَهَـذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ**) ، یان ئەفەرموێ: (**وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ**) ... پێغەمبەریش (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەفەرموێ: "**عليكم بالشفاءين القرآن والعسل**" (**رواه إبن ماجة وغيره**)، دەست بگرە بە دوشتی شفا بەخشەوە، هەنگوین و قورئان.

لەمەوە ئەتوانین بڵێین ئەگەر کەسێك بە (ئیحای خارجی) واتە لەناو خەڵکدا زۆر ئەوەی ئەبیست فلان کەس جنۆکە چووەتە ناویو فلان مامۆستا بە قورئان دەری کرد لە لەشدا و فلانی تر واو فیساری تر وا ــ هەر کەسێك ئەو جۆرە باسانە بوونە ئیحائێکی بەردەوام بۆیو ئەو حاڵەتەی تووش بوو کە پێی ئەوترێ (مس الجن)، (**إن شاء الله**) گوناهبار نابێت کە پەنا بۆ قورئان خوێندن ببرێت بەسەریداو ئەو شتەی کە چووەتە (ژیری شاراوەیەوە = العقل

---

[1] الفقه الإسلامي وأدلته، وهبة الزحيلي، (٢٤١١/٣).

**الباطن)** به ــ ئیحائێکی خارجی ــ ئەو ناساغیەی بۆ چارەسەر بکرێت[1]، پێغەمبەریش **(صلی الله علیه وآله وسلم)** ئەفەرموێ: **(من استطاع ان ینفع أخاه فلیفعل فان الله لم ینزل داء الا ونزل معه دواء)** هەر کەسێك توای کەڵك بگەیەنێت بە برایەکی موسڵمانی با پێی بگەیەنێ، چونکە هیچ نەخۆشییەك نییە کە دەرمانی بۆ دانەنرابێت.[2]

**٢ـ** ئەوەی نکوڵی لێ ناکرێ کە (جەستە) و (دەروون یان ڕۆح) دووشتی تێکەڵن‌و چوون بەناو یەکدا و ئەمیان لەسەر ئەویان کاریگەری هەیە، لەشی نەخۆش‌و ناساغ گاریگەری خراپ لەسەر دەروون‌و گیان دائەنێ و دەروون‌و ڕۆحی ناساغیش کاریگەری خراپ لەسەر جەستەی ساغ دائەنێت‌و نەخۆشی ئەخات، لەزۆر زووەوە ئەوترێ **(العقل السلیم فی الجسم السلیم)** بەرناردشۆش ئەڵێ: ڕاست ئەوەیە بڵێی **(الجسم السلیم فی العقل السلیم)**،[3] بۆیە ئیسلام گرنگی زۆر بە دامەزراندنی (عەقیدەو بیروباوەڕ) ئەدات تا مرۆڤ لە ناوەوە مەحکەم و پتەو بێت‌و بەو هۆیەشەوە کاریگەرییە (خارجیی‌و داخلی)یەکان نەیلەرزێنن.

دکتۆرە دەروونناسەکان ئەڵێن: هەواڵێکی خۆش یان ناخۆش کە هیچ پەیوەندیەکی بەلەشەوە نییە کەچی کە ئەو هەواڵە ئەدرێت بەدەروون و ڕۆح خێرا کاریگەرییەکەی لەسەر لەش دەردەکەوێ.. کابرا بە هەواڵە خۆشەکە گەش ئەبێتەوەو سور هەڵدەگەڕێ‌و ئەکەوێتە هەڵپەڕین‌و بە پێچەوانەشەوە بە هەواڵە ناخۆش‌و دڵ تەزێنەکە کز ئەبێت‌و ڕەنگی زەرد ئەبێت‌و هی واش هەیە ئەبورێتەوە یان (جەڵتە) لێی ئەدان و ئەیخاتە جێگ یان ئەیکوژێ، لە کاتێکدا ئەو هەواڵ پێدانە مامەڵە نەبووە لەگەڵ جەستەدا، بەڵکو مامەڵە بووە لەگەڵ

---

[1] کاتی خۆی لە سەردەمی خیسلافەتی ئیسلامییدا لە دەوڵەتدا بڕێك پارەو وەقف کراوە بۆ ئەو دکتۆرانەی کە بە (ئیحاء) نەخۆشیان چاك کردووەتەوە، ئەم دکتۆرانە هاتوون دوو کەسیان لە پشتی نەخۆشەکەوە داناوە کە ئەو ئەمانی نەبینیوەو بەیەکەوە باسی نەخۆشییەکەی ئەمیان کردووە، یەکێکیان وتوویەتی: ئەرێ دکتۆر چی ئەڵێی دەربارەی نەخۆشی ئەم نەخۆشە؟ ئەویان وەڵامی داوەتەوە کە وەزعی زۆر باشەو نەخۆشییەکەی ئاسانەو چارەسەری بۆ دانراوەو هاکا چاك بوویەوە، ئەڵێن زۆرجار پاش ئەو گفتوگۆیە نەخۆشەکە هەستاوەتەوەو چاك بووتەوە!! (تأریخنا المفتری علیه، یوسف القرضاوي، ص١٤٣).

[2] ئەتوانرێت سوود لە ئەزموونی زۆری ئەو کەسانەش وەربگیرێت کەلەم بارەدا پەیدایان کردووە و کتێبیان لەسەر نوسیوە لەوانە (عالج نفسك بالقرآن)، چ **ئەوەی شەعراوی‌و چ ئەوەی** حسن رمضان.

[3] السنة مصدرا المعرفة والحضارة، ص١٧٠.

دەروونو رۆحدا، بەڵام لەبەرئەوەی (رۆح)و (جەستە) دوو شتی پێکەوە گرێدراوو تێکەڵ بەیەکن ئەم کاریگەری لەسەر ئەو و ئەو کاریگەریی (چاك یان خراپ) لەسەر ئەم دائەنێ.[1]

## باسی هەشتەم: خەتمکردنی قورئانو ویردی قورئانی

لە سەرەتاو پێشەکی ئەم کتێبەدا باسی گەورەیی و خێری قورئان خوێندنمان کرد کە خوێندنی تەنیا یەك پیت مایەی ئەوەیە کە "دە" خێرت بۆ بنووسرێ و "الم" یش یەك پیت نییەو بەڵکو (أ) پیتێکەو (ل) پیتێکەو (م) پیتێکە.. بۆیە بە درێژایی مێژوو موسڵمانان دەکۆشان بۆ ئەوەی بەردەوام دەمیان لەناو ئەم قورئانەدا بێت و بیخوێنێتەوە.. ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێ: **"وأعلم أن المذهب الصحيح المختار الذي عليه من يعتمد من العلماء أن قراءة القرآن أفضل من التسبيح والتهليل وغيرهما من الأذكار وقد تظاهرت الأدلة على ذلك والله أعلم".**[2] واتە: ئەوە بزانە رێبازی راستو دروستو هەڵبژاردە کە هەموو ئەو زانایانەی لەسەرە کە متمانەیان پێ ئەکرێتو پشت بە فەتواو قسەیان ئەبەسترێت ئەوەیە کە قورئان خوێندن چاکترە لە تەسبیحات کردنو (لا اله الا الله) کردنو ویردەکانی تریش و بەڵگەیەکی زۆریش هەیە لەسەر ئەم قسەیەو خواش باشتری ئەزانێ.

پێغەمبەری خوا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) کە (عەمری کوڕی شوعەیب لە بواکییەوەو ئەویش لە باپیرییەوە) ئەگێڕێتەوە فەرموویەتی: **"اذا ختم العبد القرآن صلّى عليه عند ختمه ستون ألف ملك".**[3]

هەروەها حەدیش ئەفەرموێ: **"ان لقارئ القرآن دعوة مستجابة فان شاء صاحبها تعجلها في الدنيا وان شاء أخرها الى الآخرة"**, روان ابن مردويه.. هەرکەسێ قورئان خەتم بکات نزایەکی لێوەردەگیرێت دوای خەتمەکە جا ئەگەر ویستی ئەوە ئەیکات بۆ کاروباری دونیاو ئەگەر ویستی دوای بخات بۆ ئاخیرەت.

---

[1] ئەم باسە قسەو خواسی زۆر هەڵدەگرێ و ئەم کتێبەی ئێمە هەرئەوەندە ئەخوازێ و ئەگەر خوا بیەوێت لە کتێبی ترو هەلی تردا مافی خۆی پێ ئەدەین.

[2] التبيان، پەراوێزی (مفردات القرآن، ص٢٢٤).

[3] رواه السيوطي في الجامع الصغير (٣٨/١).

گەورەیی قورئان خوێندن و خەتمکردنی قورئان وای کردووە کە لە هەر لە کۆنەوە گرنگی تایبەتی بدرێت بە (خەتمکردنی قورئانو دارێژانی شێوازی جۆربەجۆر بۆ خەتمکردن، کە ئێمە بە پشتیوانی خوا گرنگترین بابەتەکانی ئەم مەسەلەیە بە کورتی باس ئەکەین.

بابەتی یەکەم: چەندێ جارێ خەتمێك بكات؟

دووەم: لە کوێدا خەتم بکات؟

سێیەم: دوعای خەتمی قورئان چۆن دەست بە خوێندنەوە بکاتو چی بکات لەو کاتەدا؟

## بابەتی یەکەم: چەندێك جارێك خەتمێك بكات باشە

ماوەی خەتمکردنی قورئان لە شەرعدا دیاری نەکراوەو هەموو ئەو زانایانەش کە باس لە خەتمکردنی قورئان ئەکەن و ماوەیەکی دیاریکراوی بۆ دائەنێن پشتیان بە ریوایەتێك یان زیاتر بەستووە کە ریوایەتەکانیش پەیوەستن بە رێژەی تواناو پەرژانی ئەو کەسەوە کە خەتمەکەی بۆ دیاری کراوە، بۆ نموونە:

- زانای وا هەیە کە ماوەی خەتمکردن بە ماوەی کەمتر لە شەوو رۆژێك دائەنێت.
- زانای واش هەیە ماوەی خەتمکردن بە سێ شەوو رۆژ دائەنێت.
- زانای واش هەیە ماوەی خەتمکردن بە چوار تا شەش رۆژ دائەنێ.
- زانای واش هەیە ماوەی خەتمکردن بە حەوت رۆژ دائەنێ.
- زانای واش هەیە ماوەی خەتمکردن بە هەشت رۆژ دائەنێ.
- زانای واش هەیە ماوەی خەتمکردن بە (دوو) رۆژ دائەنێ.
- زانای واش هەیە ماوەی خەتمکردن بە یەك مانگ دائەنێ.
- زانای واش هەیە ماوەی خەتمکردن بە چل شەو دائەنێ.
- زانای واش هەیە ماوەی خەتمکردن بە دوو مانگ جارێك دائەنێ.
- زانای واش هەیە ماوەی خەتمکردن بە ساڵێك دوو جار دائەنێ.[١]

بەڵام قسەی بەهێزو هەڵبژاردە ئەوەیە کە ئیمامی نەوەوی ــ بەرەحمەت بێت ــ ئەیکات وەك ئەفەرموێ: **"إن ذلك يختلف باختلاف الأشخاص)**،[٢] چونکە لە راستیدا سەرقاڵیو

[1] بۆ بەڵگەکانی هەریەك لەو زانایانە سەیری (المدخل في فقه القرآن، فرج توفيق ص١٧٠تا ١٨١) بکە.

[2] هەمان سەرچاوە ، ص١٨١.

حاڵەتی دەروونیو جۆری کارو ئەو شتانە هەموو ڕۆڵ ئەبینن لە دیاریکردنی ماوەی خەتمکردندا، لەبەرئەوە کەسێك کە دەستی خاڵییەو سەرقاڵ نییە بە کارێکەوە باش وایە تا ئەتوانێ خەتم بکاتو ئەوەشی سەرقاڵی، یان بێتاقەتی، یان جۆری کارەکەی ناخوازێ با هەوڵ بدات لە ساڵێکدا دوو خەتم بکات، چونکە پێغەمبەری خوا **(صلى الله عليه وآله وسلم)** ساڵانە یەك خەتمی لەگەڵ حەزرەتی جوبرەئیلدا ئەکردو ئەو ساڵەش کە وەفاتی تێدا کرد دووجار خەتمی کرد لەگەڵ حەزرەتی جوبرەئیلدا، بۆیە یەکێکی وەکو ئەبوحەنیفە ــ بەرەحمەت بێت ــ ئەم حەدیسە ئەکاتە هێڵی سنووری ئەو سەرو ئەفەرموێ: **(من قرأ القرآن في كل سنة مرتين فقد أدّى حقه لأن النبي (صلى الله عليه وآله وسلم) عرض على جبريل في السنة التي قبض فيها مرتين).**[1]

## بابەتی دووەم: لە کوێدا خەتم بکرێت؟

زانایان سەبارەت بەم پرسیارە دوو ڕایان هەیە، ڕای یەکەمیان ئەوەیە لە نوێژدا خەتمەکەی بکات، ڕای دووەم: ئەوەیە کە لە دەرەوەی نوێژدا بیکات.[2] و بۆ دوعاکردنیش دوای خەتمکردنەکە ماڵو مناڵ کۆبکاتەوەوە دوعا بکەن. هەردوو ڕایەکە ئیجتیهادەو بەڵگەی لەسەر نییە، بۆیە لەهەر کوێدا بێت لەناو نوێژدا بێت، یان لە دەرەوەی نوێژدا بێت لە ماڵەوە بێتو مناڵەکان کۆبکەیتەوەو پێکەوە دوعای (خەتم) بخوێنن، یان لە مزگەوتدا بێتو خۆت بە تەنیا دوعای خەتم بخوێنی، هەموو حاڵەتەکان دروستەو خێرەو بەسە کە خوای گەورە تووشی ئەو چاکە گەورەیەت ئەکات.

## بابەتی سێیەم: چی بکات لە کاتی خەتمکردنی قورئاندا؟

زانایان چەند ڕەفتارێکی جوانایان داناوە بۆ چۆنێتی مامەڵە لە کاتی خەتمکردنی قورئاندا.

یەکەم: ئەو کەسەی کە دەگاتە کۆتایی قورئان باش وایە ماڵ و مناڵەکانی خۆی کۆبکاتەوە و پێکەوە بکەونە دوعاکردن دوای خەتمەکە، چونکە وەك حەدیسەکە فەرموی

---

[1] الاتقان في علوم القرآن، ١/١٥٠ء ١٥٠.

[2] المدخل في فقه القرآن، ص١٨٧.

هەموو کەسێك دوعایەکی لێ وەردەگیرێ دوای هەموو خەتمێك، جا ئەگەر ویستی ئەوە با بۆ دین بیکاتو ئەگەر ویبستی با بۆ دنیا بیکات.. ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ئەگێڕێتەوە کە هەر جارێك ئەنەس بگەیشتایەتە خەتمکردن خێزانیو منداڵەکانی کۆئەکردەوەو پێکەوە دوعایان ئەکرد.[1] تەنانەت ئەگەر قورئان خوێن بۆی کرا دۆستانو خۆشەویستو هاوەڵانی بانگ بکات ئەوە کارێکی باشەو رەوشتێکی ناو پێشینە صالحەکانیشمان بووە، حەکەمی کوڕی عوتبە گەورە تابیعی دەڵێ: موجاهیدو عوبادەی کوڕی ئەبی لوبابە ناردیان بە شوێنمدا و رۆیشتم بۆ لایان و وتیان: ئێمە ناردوومانە بە شوێن تۆدا، چونکە نیازی خەتمکردنی قورئانمان هەبوو، دوعاش لە کاتی خەتمکردندا وەڵام ئەدرێتەوە[2] (حەزیان کردووە بەشدار بێت لە دوعاکردنەکەدا).

دووەم: هەوڵبدات دوعایەکی (جامع) و گشتگیر بکات و هەموو موسڵمانانی تێدا بەشدار بکات، ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێ: "دوعاکردن لە کاتی خەتمکردنی قورئاندا، کارێکی زۆر پەسەندو موستەحەبەو ئێمەش لە (مسند الدارمی)دا لە حومەیدی ئەعرەجەوە (رحمه الله) ئەو حەدیسەمان ریوایەت کردووە کە ئەفەرموێ: **"من قرأ القرآن ثم دعا أمّن على دعائه أربعة آلاف مَلَكٍ"**.[3]

بۆیە پێویستە زۆر بلاڵێتەوە لە دوعاکردنەکانیداو داوای شتی گرنگ بکاتو ئەو دوعانە بکات کە بۆ دینو دونیا ئەشێن، هەرچەندە باش وایە زۆربەی دوعاکانی یان هەموو دوعاکانی هەر بۆ کاروباری ئاخیرەت و کاروباری موسڵمانانو چاکبوونی دەسەڵاتی ئیسلامیی بێت.."[4]

زانایان کتێبی تایبەتیان لەسەر دوعای خەتم داناوەو هەریەکەی ئەوەندەی پێی زانیبێ هەوڵی داوە دوعا (**مأثور**)ەکان کۆیکاتەوەو لە شیوەی دوعا دایان بڕێژێتەوە.

---

[1] المدخل، ص١٩١.

[2] هەمان سەرچاوە، ص١٩٢.

[3] واتە: هەرکەسێك دوای قورئان خوێندن (خەتمکردن) دەستی کردە دوعا کردن، چوار هەزار مەلائیکە (ئامین) ئەکەن لەگەڵیدا.

[4] الاذکار ص٩٦.

مامۆستا فرج تۆفیق ئەڵێ: (لە کتێبخانەی قادری)دا کتێبێکی دەستنووسم دیوە کە بیستو چوار دوعای درێژی تێدایە هەمووی پاش خەتمکردنی قورئان ئەخوێنرێن.[1]

سێیەم: سورەتی (الاخلاص) دووجار یان زیاتر بخوێنرێ بۆ ئەوەی ئەگەر هەڵەو کەموکورتییەکیش هەبێت لە خەتمەکەیدا سورەتی (الاخلاص) بۆی پڕ بکاتەوە، چونکە (**حدیث صحیح**) هەیە دەربارەی ئەوەی کە خوێندنی سورەتی (الاخلاص) هاوتای سێ یەکی قورئان ئەوەستێت.

چوارەم: رەچاوکردنی (الحال المرتحل) لە خەتمکردندا.. پێغەمەری () ئەفەرموێ: (**أفضل الناس الحال المرتحل، قیل وما الحال المرتحل؟ قال الخاتم المفتتح، صاحب القرآن یضرب من اوله الی آخره کلما حل ارتحل**).[2] واتە: باشترین کەس ئەوەیە لە حاڵەتی (حاڵو مورتەحەل)دا بێت، وتیان قوربان (حاڵو مورتەحەل) چییە؟ فەرمووی: ئەو کەسەیە کە قورئان خەتم ئەکاتو یەکسەر دەست بە خەتمێکی تریش ئەکاتەوە، هاوڕێی قورئان لەسەرەتاوە کە دەست پێ ئەکات تا ئەگاتە کۆتاییەکەی چۆن دەستی پێ کردوە هەرواش دەست پێ ئەکاتەوە.

بۆیە هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: (ئەو کارە سوننەتە بە بەڵگەی ئەم فەرمودەیەی ئیبن عەبباس کە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ئەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**) کە ئەگەییە (**قل أعوذ** برب الناس) سەرلەنوێ ئەهاتەوە لە (**الحمد**)ەوە دەستی پێ ئەکردەوەو پاشان سورەتی (**البقرة**)ی ئەخوێندو تا ئەگەییشتە (**أولئك هم المفلحون**)، پاشان دوعای خەتمی ئەخوێند و دوای ئەوە هەڵدەسا.[3]

پێنجەم: رۆژووی گرتنی ئەو رۆژەی خەتمەکەی تیا ئەکرێ..

ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێ: کارێکی چاکە ئەو رۆژەی خەتمەکەی تێدا ئەکەی تێیدا بەرۆژوو بیت، چونکە ریوایەت کراوە بە (صحیح)ی لە تەڵحەی کوڕی موترەف و موسەییبی کوڕی رافیعو حەبیبی کوڕی ئوبەیەوە کە هەرسێکیان (تابیعیو کوفی)ین (بەرەحمەت بن) کە

---

[1] المدخل، فرج توفیق ص١٩.

[2] المدخل، ص١٩٧.

[3] المحلی ١٨٦/٣، پەراوێزی (المدخل، ص١٩٧).

دوای خەتمی قورئان ئەو ڕۆژە بە ڕۆژوو ئەبوون.[1] ئەم قسەیەش ئیمامی (**سیوطی**و باجوری)یش دووپاتی ئەکەنەوە.[2]

## باسی نۆیەم: دەنگ خۆشکردنو لاوانەوەی قورئان و گریان لە خۆهێنان

پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەفەرموێ: **"ليس منا من لم يتغن بالقرآن"**.[3] واتە: لە ئێمە نییە کەسێك ئاواز و دەنگخۆشی نەدات بە قورئان (یانی هەروەك قسەی ناو کتێبێکی تر قورئانیش بخوێنێتەوە) هەروەها ئەفەرموێ: **"**خوا مۆڵەتی داوین کە قورئان بە ئاوازەوە بخوێننەوە**"**.[4]

لەبەرئەوەی قورئان کتێبێکی ساناو سادە نییەو نابێت چ دەست بۆ بردنو چ خوێندنەوەیو چ تەفسیرکردنی وەك هەموو کتێبێکی تر بێت کە هەیەو مامەڵەی لەگەڵدا ئەکرێت.. بۆیە قورئان بەبێ دەستنوێژ دەستی بۆ نابرێ. بەبێ ئاواز پێدان ناخوێنرێو بەبێ زانیاری تەواو تەفسیر ناکرێو هەرکەسیش قورئان یەکسان بکات بە هەر کتێبێکی تر ئەوە بەر ئەو هەرەشەی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەکەوێ کە لە سەرەوە هێنامان.

لەبەرئەمانە زانایان و لەوانە (ئیمامی نەوەوی) ئەفەرموێ: (**أجمع العلماء على استحباب تحسين الصوت بالقرآن وأقوالهم وأفعالهم مشهورة نهاية الشهرة**).[5] واتە: هەموو زانایان لەسەرئەوە کۆکن کە دەنگ خۆشکردن لە کاتی قورئان خوێندندا کارێکی باشە، قسەو ڕەفتاری زانایانیش لەم بارەیەوە ئەوپەڕی زانراو دیارن.

گریان لە کاتی قورئان خوێندندا یان خۆگریاندنو گریان لە خۆهێنان کارێکی خێرو پڕ سودە بۆ قورئان خوێن، لە لایەك سونەتێکی پێغەمبەرە (**صلى الله عليه وآله وسلم**) لەلایەکیش پشوو بە دڵو مێشك ئەدات و ئامادەیان ئەکات بۆ بیرکردنەوەی ساغ لە مانا

---

[1] المدخل، ص١٩٩.

[2] المدخل، ص١٩٩.

[3] رواه أبوداود.

[4] متفق عليه.

[5] مقردات القرآن، ص٥٦٩.

جوانەکانی ئایەتەکانو ئەوەش شتێکی داواکراوە لە شەرعدا پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەفەرموێ: (**اقرأوا القرآن وابكوا، فان لم تبكوا فتباكوا**).[1] واتە: قورئان بخوێننو بگرین، ئەگەر گریانتان نەئەهات بەزۆر گریان بە خۆتان بهێنن. هەروەها ئەفەرموێت: (**أحسن الناس قراءة الذي إذا قرأ رأيت أنه يخشي الله**).[2] واتە: چاکترین خوێندنەوەی قورئان هی ئەو کەسەیە کە کاتێك قورئانەکە ئەخوێنێ تۆ بۆت دەرئەکەوێت کە لە خوا ئەترسێ، "واتە ئەوەندە بەناسکیو غەمبارییەوە ئەیخوێنێ هەست بە ترسی خوا ئەکەیت لە خوێندنەوەکەیدا". پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) خۆی کە قورئانی ئەخوێند صەحابەی کیرام، وایان ئەزانی سنگی پیرۆزی ئەڵێی مەنجەڵە و لەسەر ئاگر دانراوەو ئەکوڵێ.[3] حەزرەتی ئەبوبەکر لە تاو گریان نوێژی باش پێ نەئەکرا، حەزرەتی عومەر لە نوێژی بەیانیەکیدا سورەتی (یوسف)ی خوێند دەنگی گریانی ئەگەیشتە ریزەکانی دوای داوە، عەبدوڵلای کوڕی عەباس دوو جۆگەلەی رەش لەسەر روومەتی دروست بوو بوو لەتاو گریانی لە قورئان خوێندندا، موحەممەدی کوڕی سیرین بەشەودا خەڵك گوێی لە گریانی بوو کە قورئانی ئەخوێند، ئەبوحەنیفە هەموو شەوێك کە دەستی بە قورئان خوێندن ئەکرد گریانی لێ بەرز ئەبویەوەو دراوسێکانی بەزەییان پێیدا ئەهاتەوە، (حارسی موحاسبی) کە شەوی لێ ئەهات بە قوتابییەکی دەنگخۆشی خۆی ئەوت قورئانمان بۆ بخوێنە و ئەویش دەستی پێ ئەکردو ئەمانیش دەستیان بە گریان ئەکرد.[4]

ئیمامی غەزالی جوان ئەفەرموێت: "گریان شتیکی سوننەتە لە کاتی قورئان خوێندنو لەلای قورئان خوێندندا، بۆ ئەوەش بگەیتە ئەو حاڵەتە رێگەکەی ئەوەیە غەمباری بهێنیت بۆ دڵتو بیر لەو هەمووە هەڕەشەو وادەو پەیمانانە بکەیتەوە کە لە قورئاندا باسیان هاتووە، ئەو پەیمانو گرێبەستانە بێنەوە یادی خۆت کە لەگەڵ خوادا کردوتەو پاشان بیر لەوە بکەوە کە چەندە کەمتەرخەمیت تێیاندا، جا ئەگەر حاڵەتی تایبەتی بۆ دڵت دروست نەبو، ئەوە

[1] التبيان ، النووي، پەراوێزی: (مفردات القرآن، ص٥٦٧).
[2] الجامع الصغير، (١٨/١).
[3] المغني، (٤٧/٢).
[4] سەیری : المدخل، ص٢٢٧ تا ٢٣٤ بکە.

بگری بۆ ئەو شتە بە نرخەی کە بزرت کردوە، چونکە بە ڕاستی گەورەترین موسیبەت و لێقەومان ئا لێرەدایە.[١]

پێغەمبەری خوا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) گوێی لە ئەبوموسای ئەشعەری بوو کە قورئانی ئەخوێندو ئەیلاواندەوە، زۆر لای خۆش بوو، کە ئەبوموسا لە نوێژەکەی بوویەوە، پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) فەرمووی: **"ياأبا موسى لقد أوتيت مزمارا من مزامير آل داود"**. ئەبوموسا (نای)یەك لە (نایەکانی) بنەماڵەی داودت پێدراوە. ئەبوموسا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر بمزانیبا گوێم بۆ ئەگری ئەوە خۆشتر ئەمخوێند".[٢]

لەم بابەتەدا تێبینییەك هەیە پێویستە بوترێت ئەویش ئەوەیە هەندێك کەس ئەوەندە (ئاواز) ئەدەن بە قورئان نزیك ئەبێتەوە لە (مقامات)و (گۆرانی)و قورئان ئەرکەکەی خۆی کە بریتییە لەبردنی مرۆڤەکان بەرەو کەماڵی عەقڵیو دەروونیو کۆمەڵایەتی لەدەست ئەدات، بۆیە پێویستە ئەوە بزانرێ (ئاوازدان) بە قورئان وەك فەرمودەکە ئەفەرموێ (التغنّی) نابێت ڕۆچوونو زیادەڕووی تێدا بکرێت لە (حەرامێکەوە) کە سەیرکردنی قورئانە وەك هەر کتێبێکی تر بەرەو حەرامێکی تر بڕوات کە بریتییە لە یەکسان کردنی قورئان بە (مقامات)و (گۆرانی) وەك هەندێك لە قورئان خوێنەکانی ئەم سەردەمە فێری بوون و لاسایی مەقامی فارسیو حیجازی پێئەکەوە.

## باسی دەیەم: جیاوازی نێوان قورئان و کتێبە ئاسمانییەکانی تر

هەرچەندە ئەم باسە زۆر پەیوەندی نییە بە باسەکانی (زانستەکانی قورئان)ەوە، بەڵام ئێمە حەزمان کرد ئەگەر کورتەیەکی زۆر کورتیش بووە دەربارەی ئەو کتێبە ئاسمانییانە بنووسین کە ئەمرۆ خەڵکی ناموسڵمان لەبەردەستیاندایەو کاری پێ ئەکەنو بانگەشەی بۆ ئەکەن.. لە دونیادا باس لە دوو دینی تری ئاسمانی ئەکرێ کە ئاسەواریان وەك (کتێب) ماوەتەوە، ئەویش ئاینی مەسیحیو ئاینی یەهودییە.[٣]

---

[1] أحياء علوم الدين، (١/٢٨٤).

[2] متفق عليه.

[3] ماوەیەکە لە کوردستانیشدا باس لە (ئاڤێستا)و دینی زەردەشتییەت ئەکرێ و جۆرێك لە بازاڕ گەرمکردن و بانگەشە بۆ کردنی لەناو هەندێ نووسەردا بۆ دروست بووە، هەندێ لە ژێر ناوی ئەوەدا کە ئایینی کۆنی کوردە و

## سەرچاوەکانی ئایینی (مەسیحی) و ئایینی (یەهودی):

"نەصاراکان" دوو جۆر کتێب بە پیرۆز ئەزانن: کتێبەکانی سەردەمی کۆنو کتێبەکانی سەردەمی تازە. بە کتێبەکانی سەردەمی کۆن (العهد القدیم) ئەوترێ (تەوراتو ئەسفارەکانی موسا). بە کتێبەکانی سەردەمی تازەش (العهد الجدید) ئەوترێ (ئینجلیەکانو نامەکانی پێغەمبەران)[1]. هەرچەندە چەندین (ئەسفار) هەیە لای یەهودییەکان جێگەی

---

پێویستە کورد بگەڕێتەوە سەری و خاوەنی ئایینی خۆماڵی خۆی بێت! و هەندێ لە ژێر ناونیشانی ئەوەدا کە سەرچاوەی زمانو رێزمانی کوردە و پێویستە زیندوو بکرێتەوەو هەندێکیش لە نووسەرانی دیار لە بناغەوە ئەوە رەت ئەکەنەوەو "زەردەشتیەت" بە کەلەپورێکی کوردی نازانن و گاڵتەشیان بەوانە دێت کە لە خولیای هەوڵی لەوشێوەدان لەوانە: (پرسیارەکان تینوی وەرامن)، ئەو بەشەی پەیوەندی بە لەتیف هەڵمەتەوە هەیە.

[1] کتێبەکانی سەردەمی کۆن سێ بەشی سەرەکییە: بەشی یەکەم: (تەوراتە) کە (پێنج ئەسفاری تێدایە): (سفری تەکوینو سفری خروجو سفری ئەحبارو سفری عددو سفری تەثنیە). بەشی دووەم: ئەسفارەکانی پێغەمبەرە پێشووەکان، کە ئەمیش دوو لقی گەورەیە: أ ـ ئەسفاری پێغەمبەرە پێشووەکان، کە شەش ئەسفاری تێدایە: سفری یەسوعو سفری مازییەکانو سفری صاموئیلی یەکەمو سفری صاموئیلی دووەمو سفری پاشا یەکەمینەکانو سفری پاشا دووەمینەکان). ب ـ ئەسفاری پێغەمبەرە دواییەکان: کە چواردە ئەسفاری تێدایە، کە ئەمیش دوو لقی تری تێدایە سێ ئەسفاریان تایبەتە بە (ئەشعیاو ئیرمیاو حەزقیال)ەوە کە سێ پێغەمبەری گەورەی جولەکەنو یازدە سفریشیان پەیوەند بە یازدە پێغەمبەری بچووکەوە بە ناوەکانی (هوشع، یونیل، عاموس، عوبدیا، یونان، میخا، ناحوم، حبقوق، حجی، زکریا، ملاخی..).

بەشێ سێیەم: مەکتوباتەکانە کە سیازدە سفری تێدایەو ئەکرێتە سێ لقی سەرەکی:

أ ـ کتێبە گەورەکان کە سێ سفری تێدایە: مەزامیری داود کە کۆمەڵێك سرودی ئایینییە، پەندەکانی سولەیمان، مێژووی ئەیوب کە چیرۆکی ئەیوب پێغەمبەرە.

ب ـ پێنج گۆڤارەکە: کە پێنج سفری تێدایە: سرودی جەژنی فوسح، راعوث، لاواندنەوەکانی ئیرمیا، جامیعە، ئیستین.

ج ـ کتێبەکان کە پێنج سفری تێدایە: هەواڵەکانی رۆژی یەکەم، هەواڵەکانی رۆژی دووەم، نەحصیا، عەزرا، دانیاڵ.

کتێبەکانی سەردەمی تازەش دوو بەشی سەرکییە: ئەسفارە مێژوییەکان، ئەسفارە فێرکارییەکان.

١ـ ئەسفارە مێژووییەکان بریتین لە: أ ـ چوار ئینجیلەکەی کە کلێسا دانی پێدا ناون: کە بریتین لە (متی، مرقس، لوقا، یوحنا)، ب ـ پەیامی کارەکانی پێغەمبەران (نوێنەران)، کە ئەدرێتە پاڵ (لوقا)و (بۆڵص) کە مامۆستای (لوقا) بووەو ئەوبوو باسی (کوڕی خوا)ی هێنایە ناو مەسیحییەت.

بڕوایە کەچی لای مەسیحییەکان جێگەی بڕوا نین، چونکە بڕوایان وانییە ئەوانە سروشی خودایی بن.

ـ ژمارەی ئەو ئینجیلانەی کە کلێسا دانی پێیاندا ناوەو سەلماندوونی بریتییە لە چوار ئینجیل کە ئەمانەن: ئینجیلی (متى) و ئینجیلی (مرقس)و ئینجیلی (لۆقا)و ئینجلیی (یوحنا)، بەڵام مێژوو ئەوەمان بۆ ئەگێڕێتەوە کە لەسەردەمی کۆندا چەندین ئینجیلی تر نووسراونەتەوەو دەست بە دەستیان پێ کراوەو جێگەی بڕوای خەڵکی نەصرانی بووەو کاریان پێ کردووە، وەك (ئینجیلی (مرقیون)و ئینجیلی (دیصان)و ئینجیلی (مانی)و ئینجیلی (سبعین)و ئینجیلی (برنابا)و ئینجیلی (تەزکیرە)و ئینجیلی تریش... بەڵام لە کۆتایی سەدەی دووەمو سەرەتای سەدەی سێیەمدا کلێسا ویستی سنورێك بۆ کتێبەکانی ئینجیل دابنێتو هات تەنیا چوار ئینجیلی لەو هەمووە ئینجیلە پەسەند کردو سەلماندنی ئەویش ئەمانەن: (متى)و (مرقس)و (لوقا)و (یوحنا)، ئیتر نازانرێ هۆی رەتکردنەوەی ئەو ئینجیلانەی تر چی بووەو مەسەلەکە چییە، هەرچەندە هەندێك لە زانایان کە لێکۆڵینەوەیان لەو ئینجیلانەی تردا کردووە دیدیان بۆ ئەوە ئەروات کە ئەو ئینجیلانەی تر بە ئاشکرا باس لە هاتنی پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله علیه وآله وسلم) ئەکەن، ئاماژە بە چەند ئایەتی قورئان دەدەن، بۆ نموونە لە ئینجیلی (برنابا) دا کە دکتۆر (محمد علی قطب) لێکۆڵینەوەیەکی زانستی جوانی لەسەر کردووە.

## ئەم ئینجیلانەی مەسیحییەکان لە کوێوە هاتوون؟

حەزرەتی مەسیح (علیه السلام) دوازدە قوتابی زۆر نزیکی لە خۆی هەبوو کە پێیان ئەوترا (حەوارییەکان)، (متى) یەکێك بوو لەوانە.

---

٢ـ ئەسفارە فێرکارییەکان کە بیستو یەك پەیام ئەگرێتەوە، کە هەموویان بە زمانی یۆنانی نووسراونەتەوە: یازدە پەیامیان هی (بولص)ە، سێ پەیامیان هی (یوحنا)یە، دوو پەیامیان هی (بطرس)ە، پەیامێکیان هی (یعقوب)ە، پەیامێکی تر هی (یهوذا)یە، پەیامێکیان کە ناوی (خەوەکەی یوحنای لاهوتییە).. ئەمە جگە لەو ئینجیلانەی تر کە کلێسا دانیان پێدا نانێتو رەتیان ئەکاتەوە، وەك (ئینجیلی بەرنابا). سەیری: "أسس العقيدة الاسلامیة دکتۆر عبدالرحمن حسن المیدانی، ص٥٥٩ تا ٥٨٩" بکە.

یەکەم: ئینجیلی[1] (متی): مەسیحییەکان بەم حەوارییانە ئەڵێن: (نوێنەران = رسل) کە کاریان ئەوەبووە مژدەی حەزرەتی مەسیح بدەن لە وڵاتاندا، ئەم (متی)ایە وڵات بە وڵات گەڕاوە دوای ئەوەی کە مەسیح راکێشراوەتەوە بۆ ئاسمان تا مژدەی گەڕانەوەی بداتو راسپاردەکانی ئەو بگەیەنێت بە خەڵکی، لە ساڵی (٧٠)ی زایینیدا لە (حەبەشەدا) وەفاتی کردووە لە ئەنجامی شکەنجەدانێکی زۆورەوە کە هەوادارێکی پاشای حەبەشە کردویەتی، "متی" ئەم ئینجیلەی بە زمانی (عیبری) یان (سیریانی) نوسیوەتەوەو کۆنترین روونووسی ئەم ئینجیلە بە زمانی یۆنانی هەیە، هەرچەندە ریوایەت مێژووییەکان یەك دەنگ نین لەوەدا کە مێژووی نووسینەوەکەی کەی بووە، "هۆرن" ئەڵێ: "ئینجیلی یەکەم لە ساڵی (٣٧)ی زاین، یان لە ساڵی (٤١)دا، یان لە ساڵی (٤٣)دا یان لە ساڵی (٤٨)دا، یان لە ساڵی (٦١)دا، یان لە ساڵی (٦٢)دا، یان لە ساڵی (٦٣)دا، یان لە ساڵی (٦٤)دا نوسراوەتەوە"ت.و کەسیش نازانێ ئەوکەسە کێ بووە کە ئینجیلەکەی گۆریوەتە سەر زمانی یۆنانی، هەندێ ئەڵێن (یوحنا) بووە، هەرچەندە باسی خەڵکی تریش ئەکەن، نکولی لەوە ناکرێت کە ساغ نەبوونەوەی روونووسی بنەڕەتی ئەم ئینجیلەو مێژووی وەرگێڕەکەی و زانینی حاڵو ئەحواڵی ئەم وەرگێڕەو رێژەی دینداری و ئەمانەتپارێزیو شارەزایی لە هەردوو زمانی (عیبریو یۆنانی)دا، هەڵقەی گەورە گەورەن لە لێکۆڵینەوەی زانستی داو ئەم ئینجیلە متمانەی خۆی لەدەست دەدات.

دووەم: ئینجیلی (مرقس): مورقوس یەکێك نەبوو لە (حەوارییەکان)، هەرچەندە یەکێك بوو لەوانەی هەرزوو چوو بەدەم بانگەوازی حەزرەتی مەسیحەوەو یەکێکە لەو حەفتا کەسەی کە پاش بەرزبوونەوەی ـ مەسیح ـ بۆ ئاسمان گوایە (روح القدس) دابەزیوەتە سەریان (بەپێی قسەی مەسیحییەکان) و ئەم (مرقس)ە نکولی لەوە ئەکرد کە مەسیح خوا بێت، بۆیە بتپەرستەکانی ئەو کاتەی میسر پیلانێکی لێ دەگێڕنو ئەیخەنە زیندانو پاشان لە ساڵی (٦٢)ی زاینیدا دەیکوژن، ئەم ئینجیلەش بە زمانی یۆنانی نوسراوەتەوەو گوایە **(بطرس)** کە گەورەی حەوارییەکان بوو لە (مرقس)ی وەرگرتوە لە رۆمادا، هەرچەندە **(بطرس)** لە گەورە حەوارییەکانەو (مرقس) لە قوتابییەکانێتی، کەچی ئەو لەئەمی وەرگرتووە!

[1] وشەی ئینجیل لە زمانی یۆنانیدا واتە (مژدەدان). علوم القرآن، أحمد عادل کمال، ص١٦٥.

ریوایەتێکی تری مێژووی هەیە گوایە ئەم ئینجیلە (مرقس) خۆی نووسیویەتییەوە دوای ئەوەی (**بطرس**) و (بولس) مردوون.

هەرچۆن بێت لەناو ئەو ریوایەتانەدا ناتوانرێ مکوڕی لە سەر ئەوە بکرێ کە فلاَنە کەسیان بە دلَنیاییەوە ئینجیلەکەی نووسیوەتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە مێژووی نوسینەوەکەی جیاوازی زۆری تێدایە هەیە بە سالَی (٥٦)ی ئەزانێو هەشە سالَی تر باس ئەکاتو تا (٦٥) ی زاینی هەر قسەی لەسەر کراوە.

سێیەم: ئینجیلی (لوقا): "لوقا" یەکێك بوو لە قوتابییەکانی (بولس)و و قوتابی حەزرەتی ـ مەسیح ـ خۆی نەبوو، تەنانەت قوتابی قوتابییەکانیشی نەبووە، ئەلَێن: "لوقا" کابرایەکی ئە**نطاکی**یەو لە "ئە**نطاکیە**" دا لە دایك بووە، ئەشلَێن: کابرایەکی رۆمانییەو لە ئیتالیادا لە دایك بووە، ئەلَێن کابرایەکی دکتۆر یان وێنەگر بووەو ئینجیلی بۆیۆنانییەکان نووسیوەتەوە هەشە ئەلَێن: بۆ میسرییەکانی ئەنووسیەوە، مێژووی ئەم نوسینەش هەندێ بە سالَی (٥٣)و هەشە بە (٦٤)ی زاینی ئەزانێ.

چوارەم: ئینجیلی "یوحنا".. ئەم ئینجیلە لەلایەن (یوحنا) ناوێکەوە نووسراوەتەوەو هەندێ ئەلَێن: "یوحنا" حەوارییەو هەندێکیش ئەلَێن: "یوحنا" یەکی ترەو "یوحنا"ی حەواری نییە، هەندێك ئەلَێن قوتابیەکی قوتابخانەی (أسکندریە) نوسیویەتییەوە، لە سەدەی دووەمی زاینیدا گروپێك بەناوی گروپی (یوجین) نکولَی لەم ئینجیلە ئەکەنو هەموو ئەوەش ئەدەنە دواوە کە دراوەتە پالَ (یوحنا)، تەنانەت لە (**دائرة المعارف البریطانیة**) دا کە پێنجسەد زانای نەصرانی بەشدارە لە دروستکردنیدا لەوێدا ئەلَێ: "ئینجیلی "یوحنا" گومان لەوەدا نییە کە کتێبێکی هەلَبەستراوەو دروستکراوە".

ئەم ئینجیلە تاکە ئینجیلێکە کە بەبێ پەردە باس لە خوایەتی حەزرەتی مەسیح ئەکات (سبحان الله عما یصفون). ئەلَێن: بیرۆکە ئەوە دروست بوو بۆ هەندێ خەلَك کە ناکرێ (عیسی) خوا بێت، بۆیە داوایان لە "یوحنا" کرد کە ئینجیلێك بنووسێ و ئەوە رۆشن بکاتەوە کە لە راستیدا (عیسی) خۆی خودایە... (**العیاذ بالله**). مێژووی نووسینەوەی ئەم ئینجیلە بە سالَی (٦٥و ٦٨و ٦٩و ٧٠و ٨٩و ٩٥و ٩٦و ٩٨) مەزندە ئەکەن.[١]

---

[1] زۆربەی ئەو زانیاریانەمان لە (علوم القرآن، أحمد عادل کمال) وەرگرتووە، ل١٥٦بۆ ١٦٧. هەروەها (أسس العقیدە الإسلامیە)ی مەیدانی ل٥٥٩ تا ل٥٨٩.

## ئینجیلەکانی تر لە کوێن و چیان تێدایە؟

هەموو ئەو کەسانەی کە قسەو چیرۆکی مەسیحیان نووسیوەتەوە (سەلامی خوای لێ بێ) ناویان ناوە (ئینیجل) واتە مژدەکانی حەزرەتی مەسیح، یەکێکیش لەوانە کە مژدەکانی حەزرەتی مەسیحی نوسیوەتەوە کەسێکە بە ناوی (برنابا)، "بەڕنابا" یەکێکە لە گەورە حەوارییەکانو بەڵکو وەك لە ئینجیلی (لوقا)دا هاتووە ئەم "برنابا"یە:

ـ پیاوێکی زۆر بەخشندەو ماڵبدە بووە بە پێغەمبەران لە پێناوی سەرخستنی دیندا.

ـ پیاوێکی پاكو بێ غەلو غەش بووە و پڕ بووە لە نوری پیرۆزو خاوەن ڕێزو گەورەیی بووە.

ـ پیاوێکی ئیشکەر بووەو "روحی قودس" لەگەڵ "بولس"دا هەڵیبژاردوون تا برۆن دین بلاوبکەنەوە.

ـ خالۆی (مرقس) بووەو کە خاوەنی ئینجیلی تایبەتی خۆیەتی کە سەرچاوەی دووەمە لای مەسحییەکان.[1] ئەم ئینجیلی برنابایە یەکێکە لەو ئینجیلانەی کە کڵیسا یاساغای کردوون و لەسەدەی پێنجەمی زاینیەوە و دروست لەسەر دەستی پاپا (گلاسیوس)ی یەکەمەوە خوێندنەوەی ئەم ئینجیلە حەرام کراوە!!

## ئەم ئینجیلە چی تێدایە کە دژ بە ئینجیلەکانی تر بێت؟

ئەم ئینجیلە وەك شێخ محمد رشید رضا[2] و (رحمه الله)ی هیندی[3] و پاش ئەوانیش یەکێکی وەکو (محمد علی قطب) لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە چەند خاڵێکی تێدایە کە کڵێساو قەشەو پاپاکان لێی بێزارنو نایانەوێ دانی پێدا بنێن لەوانە:

١ـ ئەوە رەت ئەکاتەوە کە حەزرەتی عیسا کوڕی خوا بێت ـ **سبحانه وتعالی** ـ . ئەوەتا بە دەق هاتووە **"أيها الأعزاء.... ان الله العظيم العجيب قد افتقدنا في هذه الأيام بنبيّه**

---

[1] نظرات في انجيل برنابا المبشر بنبوة النيي محمد (صلى الله عليه وآله وسلم) ، محمد علي قطب ، ص٤٣.

[2] خاوەنی (دار المنار).

[3] خـاوەنی کتـێبی (إظهـار الحـق)ە، کـە لێکۆڵینەوەیـەکی وردو زانـستیانەی تێدایـە لەسـەر مەسـحییەتو سەرچاوەکانیان.

**"يسوع المسيح" برحمة عظيمة للتعليم والآيات التي اتخذها الشيطان ذريعة لتضليل كثيرين بدعوى التقوى مبشرين بتعليم شديد الكفر، داعين المسيح ابن الله".**

٢ـ رەتكردنەوەی بیروباوەڕی سێگانەیی (**التثليث**)... بەدەق هاتووە لە ئینجیلی برنابادا کە ئەڵێ: "... **فنرجوك من كل قلبنا ان ترضي بازالة الفتنة التي ثارت بسببك، لان فريقا يقول: انك الله، وآخر يقول: انك ابن الله، ويقول فريق انك نبي... فأجاب يسوع: .. إني أشهد أمام السماء واشهد كل ساكن على الارض اني بريء من كل ماقال الناس عني من اني أعظم من البشر .. لأني بشر مولود من امرأة، عرضة لحكم الله، اعيش كسائر البشر عرضة للشقاء العام".**

**٣ـ** لە خاچدانی ـ حەزرەتی مەسیح ـ رەتئەکاتەوە، ئەوەتا بەدەق هاتووە **"الحق أقول ان صوت يهوذا وشخصه بلغت من الشبه بـ"يسوع" ان اعتقد تلاميذه والمؤمنون به كافة انه "يسوع" كذلك خرج بعضهم من تعاليم "يسوع" معتقدين ان يسوع كان نبيا كاذبا".**

٤ـ ئینجیلی برنابا بەدەقو بەسێ شێوە مژدەی هاتنی حەزرەتی موحەممەد (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەدات بە خەڵکی: جارێك بە ناوی بێ پێچوپەنای خۆی (**محمد**)و دووجار بەرەمزو لە رێگەی صیفەتەکانییەوە، ئەوەتا ئەڵێ: "**.. ولكن سيأتي بعدي "مسيا" المرسل من الله لكل العالم..**" لە شوێنێکی تردا ئەڵێ: "**.. لكن رسول الله متى جاء يعطيه الله ما هو بمثابة خاتم يده فيحمل خلاصا ورحمة لامم الارض الذين يقبلون تعليمه.. وسيأتي بقوة على الظالمين ويبيد عبادة الاصنام بحيث يخزي الشيطان".**[1]

٥ـ ئەیسەلمێنێ (ذەبیح) و فیداکە بریتییە لە حەزرەتی ئیسماعیل.

ئەم ئینجیلی "برنابا"یە مێژووی دۆزینەوەی ئەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی پازدەهەمی زاینیو یەکەم روونووسی ئەم ئینجیلە کە بە زمانی (ئیتاڵی) نووسراوەتەوە و لەسەر دەستی (فرامینو)ی راهیب ئاشکرا کراوە، کە لە کتێبخانەکانی پاپا (سکتس)ی پێنجەمدا دەری هێناوە، ئەم ئینجیلە ئەو ماوە زۆرە بە شاراوەیی ماوەتەوەو پاشان ئەم (فرامینو)یە کە راهیبێکی مەسیحییەو بە پاڵنەری لێکۆڵینەوەی زانستی دەستی کەوتووە.. پاش ئەم فرامینویە ئەم نوسخەی ئینجیلە ئەکەوێتە دەست راهیبێکی تر بە ناوی "کریمر"

[1] هەموو ئەو دەقانە لە کتێبی (نظرات في انجيل برنابا، محمد علي قطب) وەرگیراوە.

که له کۆشکی پاشایەتی (بروسیا) دا که دەوڵەتێکی مەسیحی بووە، جارێکی تر ئەم ئینجیلەی ئاشکرا کردووەو پاش ئەم دەست بە دەست کردنە گەیشتوەتە دەوڵەتی (ڤیینا) کە پایتەختی (نەمسا)یەو ئەویش هەر دەوڵەتێکی مەسیحی مەزهەب بووە لە ساڵی (١٧٣٨) بۆ یەکەمجاریش روونووسێکی ئیسپانی ئەدۆزرێتەوە لە دەوڵەتێکی مەسیحییداکە دەوڵەتێکی دەمارگیری مەسیحی وابوو لەسەر لاشەو کەللەسەری دەوڵەتێکی ئیسلامیی رماو دروست بوو بوو که دەوڵەتی ئیسپانیایە.

پاشان ئەم روونووسە "ئیسپانیە"ی وەرگێردراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی لەلایەن رۆژهەڵاتناسێکی مەسحییەوە بە ناوی (دکتۆر سایل)و لای هەموو کەسیش ئاشکرایە کە رۆژهەڵاتناسانی مەسیحی چەندێك بە تەنگ دینو مەزهەبی خۆیانەوەن و بەرگری سەرومالّی لیّ دەکەن.. ئەمانە هەمووی بۆ ئەوە ئەڵێین کە هەندێ گومان لەم ئینجیلە ئەکەن گوایە دەستێکی موسڵمان نووسیویەتی و خزاندویەتییە ئەو شوێنانە... دەی باشە ئینجیلێك کە:

١ـ بە کۆی دەنگی مێژوونووسان یەکەم روونووسی لە زمانی ئیتاڵیو لە ئیتاڵیادا دۆزرابێتەوە لەلایەن (کریمر)ی راهیبەوە لە ساڵی (١٧٠٩)داو

٢ـ لەدەستی ئەمەوە گەشتبێتە دەستی کۆشکی پاشایەتی ڤییەنا کە دەوڵەتێکی دەمارگیری مەسیحی بوە لە ساڵی (١٧٣٨)ی زاینیداو

٣ـ یەکەم روونووسی ئیسپانی لە ئیسپانیای مەسیحی دە دەریکەوێ کە ئەو دەوڵەتە قڕی خستە ناو موسڵمانان لە ئیسپانیادا و

٤ـ رۆژهەڵاتناسێکی مەسیحی وەکو (سایل) لە روونووسە ئیسپانییەکەیەوە بیگۆڕێتەوە سەر زمانی ئینگلیزیو

٥ـ پاش هەموو ئەمانە قەشە (فرامینو) و لە رێگەی لێکۆڵینەوەی زانستی خۆیەوە بگەرێت بەشوێن ئەو ئینجیلەدا، چونکە (ئەریانوس) لە کتێبێکی دا باسی کردووە و ئاماژەی بەو ئینجیلە داوە و پاشان ئەم (فرامینو)یە روونووسێکی ئەم ئینجیلە لە کتێبخانەی پاپا (سەکتۆس)ی پێنجەمدا بدۆزێتەوە[1] و دەست بە خوێندنەوەی بکاتو ویژدانی هانی بدا لە ژێر رۆشنایی ئەو ئینجیلەدا موسڵمان ببێت. .. ئایا ئەمە مایەی ئەوەیە کە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ص٤٩و ٥٠.

مەسیحییەکان بە چاوی گومانەوە بڕوانن بۆ ئەو ئینجیلە یان ئەبێت مایەی ئەوە بێت بە خۆیاندا بچنەوەو سەرلەنوێ لە خوایەتی حەزرەتی مەسیحو پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد ((**صلى الله عليه وآله وسلم**)) ورد ببنەوەو گوێ بۆ (عەقڵ)و (مەنتیق) بگرنو وەك قەشە (فرامینو) ملکەچی دەربڕن بۆ هەقو راستی؟!

لەم چەند زانیارییانەی کە رابوورد ئەگەینە چەند راستییەك حەزئەکەم بەکورتی لێرەدا بیانووسم:

١ـ ئەم کتێبانەی کە چ مەسیحیو چ یەهودی ناویان ناوە (العهد القديم)و (العهد الجديد) کە مەبەستیان بە یەکەمیان تەوراتو نامەکانی موسایە (سەلامی خوای لێ بێ) و مەبەستیان بە دووەمیان ئینجیلەکانو نامەکانی حەوارییەکانە، کەسیان بە سەنەدێکی نەپچڕاو (سند متصل) نەگەیشتووە بە خەڵکی، بەڵکو هەر هەموویان نزیکەی پەنجا شەست ساڵ دوای حەزرەتی مەسح نووسراونەتەوە.

٢ـ هەریەك لەو ئینجیلانەش کە نووسراونەتەوە بە دەستی کەسێك نووسراوەتەوە کە هەڵدەگرێ قسەی خۆی تێکەڵ کردبێ وەك (وشە)و وەك (بیرۆکە)و وەك (مانا)شو هەڵیش دەگرێ زۆر شت هەیە لەبیری کردبێتو لەبیری نەمابێت.

٣ـ مەسیحیەت دوای هەڵکێشانەوەی حەزرەتی مەسیح تووشی راوەدونانو شکەنجەو ئازاری زۆربوونەوە، بە تایبەتی لە لایەن یەهودییەکانەوە، بۆیە هەر یەك لەو حەوارییانە و قوتابییەکانیان ئاوارەی وڵاتان بوونو کەوتنە ژێر چاودێریو کەسێك یان دەسەڵاتێك یان دەسەڵاتدارێك نەبو لەو رۆژانەدا کە ئەم قوتابیانەو مژدەکانی حەزرەتی مەسیح بگرێتە باوەشو کار بۆ نووسینەوەو پاراستنییان بکاتو ریوایەتە مێژوویەکانیش باس لەوە ئەکەن کە لەو ماوەیەدا ئینجیلەکان نوسراونەتەوە.

٤ـ هەر پاش ئەوەی کە ـ حەزرەتی مەسیح ـ لە دایك ئەبێت و سروشی لە خواوە بۆ دێت یەهود ئەچنە بنکڵێشەی حاکمی رۆمانی ئەو کاتە کە ناوی (قەیسەر **طيبارۆس**) ئەبێ ئەویش فەرمانی دەستگیرکردنی حەزرەتی مەسیح ئەداتو لە خاچی ئەداتو دەست بە گرتنی شوێنکەوتەکانیشی ئەکات، پاش ئەم قەیسەرەش دوو قەیسەری تر دێن کە تاڵاوی دنیا ئەکەن بە قوڕگی قوتابیانی حەزرەتی مەسیحداو قڕان ئەخەنە ناو مەسحییەکانەوە، لەسەردەمی قەیسەری دووەمیاندا "متی" ئینجیلەکەی خۆی ئەنووسێتەوە بە زمانی "عیبرانی" و "یوحنا" کە ئینجیلێکی تایبەتی بە خۆشی هەیە وەریئەگێڕێتە سەر زمانی

"یۆنانی". سەختترین سەردەم بۆ مەسیحییەکان سەردەمی پاشا (نیرۆن) بوو لە ساڵی (٦٤) زاینیو پاشان سەردەمی پاشا (تراجان) لە ساڵی (١٠٦) زاینی و سەردەمی (دیسیوس) بوو لە ساڵی (٢٤٩) زاینیدا و "پاشا نیرۆن" بەوە تۆمەتباری ئەکردن گوایە ئەمانە (ڕۆما)یان سوتاند بێت بۆیە کەوتنە ئەشکەنجەدان و ئازار دانیان بە شێوەیەك کە مێژوو کەم شتی وای بە خۆیەوە بینیوە. بۆ نمونە:

ئەهاتن ئەم مەسحییانەیان ئەگۆڕی و جلی ئاژەڵیان لە بەر ئەکردن و فرێیان ئەدانە بەر سەگی هار و ئەوانیش لەت و پەتیان ئەکردن.

ئەهاتن لە خاچیان ئەدان و جلێکی چەوری نەوتینیان لە بەر ئەکردن و پاشان لە شەودا ئاگریان تێ بەر ئەدان و وەك چرا بە کاریان ئەهێنان بۆ ڕووناککردنەوەی ڕێگە و بانەکان و (نیرۆن) خۆی لە ژێر ڕۆشنایی ئەم (چرا ئادەمیانە) هاتووچۆی ئەکرد.

(مەرقس) ئینجیلەکەی خۆی لەم سەردەمەدا نووسییەوە لەو کاتەدا لە "رۆما" بوو هەروەها (لوقا)ش ئینجیلەکەی خۆی لە سەردەمی ئەم قەیسەرەدا نووسییەوە.

پاشا ئەم سەردەمە (یوحنا)ش ئینجیلەکەی خۆی نووسییەوە و لە سەردەمی (دەقلیدیانووس)دا نزیکەی سێ سەد هەزار مەسیحی کوشت کە ساڵی (٢٨٤) زاینی ئەکات ئەوانەی مێژووی مەسیحییەت ئەنووسنەوە ئەو هەمووە ئەشکەنجە و ئازار و تۆقاندنە ئەکەنە هۆ کە (سند)ی نەپچڕاو نییە بۆ ریوایەتی کتێبەکانیان و ئەوەش وا دەکات کە پەنا بۆ کاری نهێنی ببرێت و لە کاتی نهێنی و خۆشاردنەوەشدا چەندین شت ڕوو ئەدات کە ڕاستی مەسەلەکان ئەشارێنەوە و دڵنیایی کز دەبێت لە مرڤدا بۆ راستی ئەو زانیارییانە.

**٥-** خوای گەورە کەباسی ئایینی مەسیحییەت و یەهودییەت ئەکات ئەفەرموێ (یکتمون ما انزلنا من الکتاب), هەروەها ئەفەرموێ: (**یحرفون الکلم عن مواضعه**). هەروەها ئەفەرموێ (**ویل للذین یکتبون الکتاب بایدکم ثم یقولون هذا من عندالله و ما هو من عندالله و یقولون علي الله الکذب وهم یعلمون**). جیاوازی نێوان ئەم ئینجیلانەش لە ناو خۆیاندا و جیاوازیان لەگەڵ ئینجیلی (برنابا)دا و جیاوازیان لە گەڵ قورئانیشدا, ئەو دڵنیاییە ئەدات بە مرۆڤی عەودالی ڕاستی کە ئەو کتێبانە دەستکاری زۆر کراون و بیر و ڕای بەشەری زۆریان تێکەڵ بووە و بەو شێوەیەش نێوان زەوی و ئاسمانیان لەگەڵ قورئان و حەدیسی پێغەمبەردا (**صلی الله علیه وآله وسلم**) هەیە.

قورئان که هەر لە سەردەمی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) خۆیدا هەمووی نووسرایەوە و پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) لە ڕێگەی نووسەرانی (وحی) یەوە کە ژمارەیان لە (٤٠) کەس زیاتر بوو بەو شێوەیەی کە لە حەزرەتی جوبرەئیلەوە وەری گرتبوو (وشە) بە (وشە) گەیاندیە نووسەرانی (سروش) و پاشان حەزرەتی ئەبوبەکر لە ڕێگەی لیژنەی تایبەت و بەڵگە نامەی ورد و وردکردنەوە و وەردکردنەوەی هەموو ئەو پەڕە و پارچە قورئانانەوە کە هەبوون جارێکی تر قورئان دوای یەك ساڵ لە مردنی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**) کۆکردەوە و نووسیەوە[1] و پاشان چۆن لە سەردەمی حەزرەتی عوسماندا, لە ڕووی ئەو قورئانەوە چەندین نوسخەی تر نووسرایەوە و نێردرا بە هەرێمەکاندا تا خەڵکی گومانیان لە سەر قورئان بۆ دروست نەبێت و بە دەردی یەهودو نەصارا نەچن, دوایی کەس نەزانێ کامە قسەی خوایە و کامە قسەی خەڵکی ترە کە خراوەتە ناو کتێبی خواوە.

٦ـ لەو زانیاریانەی پێشووەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کتێبە ئاینەکانی تر، چونکە ئەرکی سەرشانی هەڵگرانی ئەو دینە بوە بیپارێزن و بیگەیەنن, کەلێن و کەموکورتی زۆریان تێکەوتووە و هەریەکەی لە لایەکەوە هەوڵێکی شەخصی خۆی داوە بۆ ئەوەی زۆرترین ڕاسپاردە و ڕێنماییەکانی ئەو پێغەمبەرە (**صلى الله عليه وآله وسلم**) کۆبکاتەوە و بیگەیەنێتە خەڵکی, یەکێکی تر بە جۆرێکی تر و ئەوەی تریش بە جۆرێکی جیاواز لە هەمووان, بۆیە کارەکە وای لێهاتووە جیاوازی و ناسازی زۆر لەو کتێبانەدا دروست بوون و جیاوازییەکانیش شتی ورد و ناگرنگ نین، بەڵکو شتی گەورە و زۆر هەستیارن چ بیر و باوەڕ دەربارەی" خوای موتەعال یان دەربارەی پێغەمبەران یان دەربارەی یاسا و هەڵسوکەوتەکان"، یان دەربارەی خوای گەورەو بەندەکانی...

خوای گەورە دەربارەی پاراستنو ئەرکی پاراستنی ئەو کتێبانە ئەفەرموێ: (**لِلَّذِينَ هَادُواْ وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَابِ اللّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَاء**) (**المائدة: ٤٤**). وشەی (**اسْتُحْفِظُواْ**) واتە داوای ئەوەیان لێکرابوو کە کێتبەکانی خۆیان بپارێزن.. بەڵام خوای گەورە دەربارەی پاراستنی قورئان ئەفەرموێ: (**إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ**) (**الحجر: ٩**) کە بە ئاشکراو بە چەند دڵنیا کردنەوە ئەفەرموێ (ئێمە خۆمان قورئان

---

[1] لە پێشەوە بە درێژی و وردەکاریەوە پرۆسەی نووسینەوەی قورئانمان باس کردووە چۆن لیژنەی بۆ دانراوە و ڕەچاوی وردترین سیستمی نووسینەوە کراوە بۆ کۆکردنەوە و نووسینەوەی قورئان, تکایە بۆی بگەڕێنەوە.

ئەپارێزین) ئەوەبوو کە پاراستنی ئەو کتێبانە سپێردرا بە خەڵکەکە خۆی نەیانتوانی وەك پێویست بیپارێزنو دەستی خەڵکی (کەم دین)، یان (بێ دین)ی پێگەیشتو ئەمان لەبەر (ستەمکاری خۆیان) و ئەوان لەبەر (نەزانینی خۆیان) ئەو هەموو کارەساتەیان بەسەر ئەو دینانەدا هێنا، بەڵام کە خوای گەورە وادەی پاراستنی قورئانی دا، هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) ئەوە هەمووە کەرەسەیەی بۆ فەراهەم کرد و پاشان هەر لە ساڵی یەکەمی دوای مردنی پێغەمبەردا (**صلى الله عليه وآله وسلم**) و دورست دوای شەڕی خێڵی (موسەیلەمەی درۆزن) خستییە دڵی صەحابەوە کە هەموو قورئان لەیەك (بەرگ)دا کۆبکەنەوە تا لە نەفەوتانی تەنانەت ئایەتو پیتێکیشی دڵنیا بن، ئەوەبوو لەسەردەمی عوسمانیشدا (رەزای خوای لێ بێت) خوای گەورە هەلومەرجەکانی وا رێکخست صەحابە بیر لە زیادکردنی روونووسی ئەو قورئانە بکەنەوەو بە هەرێمەکاندا بڵاوی بکەنەوە تاخوای گەورە بۆ هەتا هەتایە دڵنیایی بداتە خەڵکی کە ئەم قورئانە هەر ئەو قورئانەیە کە خوای گەورە دایە جوبرەئیلو ئەویش دایە حەزرەتی موحەممەد و ئەویش (**صلى الله عليه وآله وسلم**) گەیاندییە صەحابەکانو ئەوانیش بەئەمانەتەوە (رەزای خوایان لێ بێت) نووسیانەوەو گەیاندیانە هەموو مرۆڤایەتی..

ئەمانە وامان لێ ئەکات کە قورئان وەك هیچ کتێبێکی تری ئاسمانی، یان زەمینی سەیر نەکرێت، بەڵکو مامەڵەی تایبەتی لەگەڵ بکرێت، بە راسپاردەی خوا دابنرێتو بەو رۆحیەتەوە چۆك لەبەردەمیدا دابدرێت وەك عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رەزای خوای لێ بێت) ئەفەرموێ: **"ان من كان قبلكم رأوا القرآن رسائل من ربهم فكانوا يتدبرونها بالليل ويتفقدونها في النهار"**.[1] واتە: ئەوانەی پێش ئێوە واسەیری قورئانیان ئەکرد کە ئەمە چەند نامەیەکی خوای گەورەیەو بۆ ئەوان هاتووە، بۆیە بە شەو بەردەوام لێی وردئەبوونەوەو بەرۆژیش بەردەوام هەر لەبیرو خولیای ئەودا بوون.

هەزار سەڵاتو سەلامیش لەسەر پێغەمبەری ئازیز بێت، کە ئەفەرمویت: **"ان هذا القرآن هو حبل الله المتين، وهو النور المبين، وهو الشفاء النافع، عصمة لمن تسمك، ونجاة لمن تبعه". رواه ابن مردويه**.[2] واتە: ئەم قورئانە حەبلی توندوتۆڵی خوایە، هەر ئەم

[1] التبيان، النووي، پەراوێزی: مفردات القرآن، ص٥٦١.

[2] مختصر تفسير ابن كثير، علي الصابوني، (٣٠٥/١). تەفسیری ئایەتی: (واعتصموا بحبل الله جميعا).

قورئانە ڕووناکییەکی ئاشکرایەو هەر ئەم قورئانە شفابەخشێکی بە کەڵکە، قورئان قەڵغانە بۆ کەسێك دەستی پێوەبگرێو ڕێگای ڕزگارییە بۆ کەسێك کە شوێنی بکەوێ.

# وتەی کۆتایی

خوێنەرانی بەرێز! بە تایبەتی نەوەی نوێی دڵ پڕ لە ئومێد!

پاش ئەوەی کە لە نووسینی ئەم کتێبە بوومەوەو کۆتاییم بەباسە پێویستو هەستیارەکانی هێنا، وام بە باشزانی کە کورتەیەکی باسو بابەتەکانی ئەم کتێبە بنووسمەوە کە من بۆ خۆم پاش لێبونەوەم لە کۆکردنەوەی ماددەکانی نووسینەکە ئەم کورتەیەم بۆ دروست بوو:

١ـ ئەم قورئانە دەریایەکی بێ بنەو ئێمەی موسڵمانیش هەریەکەو بە مشتی بچووكو گەورەی خۆمان ئاوی لێ هەڵدەگۆزینو پێویستییەکانی خۆمانی پێ بەرێ ئەکەین.

٢ـ قورئان ئەو خەزێنە گەورەیەیە کە پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**) دەربارەی ئەفەرموێت: **"كتاب الله، فيه نبأ ما قبلكم وخبر ما بعدكم، وحكم ما بينكم هو الفصل ليس بالهزل من تركه من جبار قصمه الله ومن ابتغى الهدى في غيره أضله الله، وهو حبل الله المتين وهو الذكر بالحكيم، وهو الصراط المستقيم، وهو الذي لاتزيغ به الأهواء، ولا تلتبس به الألسنة ولا يشبع منه العلماء، ولا يخلق على كثرة الرد، ولا تنقضي عجائبه هو الذي لم تنته الجن اذ سمعته حتى قالوا: (إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآناً عَجَباً * يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ) (الجن: ٢). من قال به صدق ومن عمل به أجر ومن دعا اليه هدي الى صراط المستقيم". الترمذي..**

٣ـ ئەم قورئانە کتێبێکی ئاسایی نییە لە ماناو مەبەستو بابەتەکانیدا، بۆیە نووسینەوەو پاکنووس کردنو زیادکردنی و روونووسەکانیشی کارێکی ئاسایی نەبووەو زۆر ورد ئەنجامدراوەو پرۆسەیەکی ئاشکرا بووە.

٤ـ قورئان لە خوای گەورەوە بەو چۆنییەتەی کە هەر خۆی ئەیزانێ دابەزیوەتە سەر (**اللوح المحفوظ**) و لەوێشەوە بەیەکجاری دابەزیوەتە سەرئاسمانی دونیاو هاتووەتە (**بيت العزة**) و لەوێشەوە بەپێی پێویست هاتووەتە سەر دڵی پێغەمبەر (**صلی الله علیه وآله وسلم**).

٥- پێغەمبەریش **(صلی الله علیه وآله وسلم)** بە ئەمانەتەوە لە ڕێگەی زیاتر لە چل کەسی تایبەتەوە کە تەرخانی کردوون بۆ قورئان نووسیینەوە ئەم قورئانەی وشە وشە نووسیوەتەوەو لە تەمەنی مویارەکی خۆیدا قورئان لە (الفاتحه)ەوە تا (الناس) بە صەحابەکان نووسیوەتەوەو بە چەندانیشی لەبەرکردووەو بە هەرکەسیشی نووسیوەتەوە پێش ئەوەی بڕوات پێی خوێندووەتەوەو ئەگەر هەڵەیەکی لە نووسینەکەدا کردبایە بۆی ڕاست ئەکردەوە..

٦- ڕاستە لە سەردەمی پێغەمبەردا **(صلی الله علیه وآله وسلم)** هەموو قورئان لەلای خۆی بە نووسراوی یان لای کەسێکی تایبەت دانەنرابوو، بەڵکو ئەوەی ئەنوسرایەوە دەست بە دەستی ئەکردو لەبەرئەکرا، بەڵام هەر زوو، دروست لە سەرەمی حەزرەتی ئەبوبەکردا خێرا لیژنەی تایبەتو پسپۆڕ دانرا بۆ کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان بەپێی سیستمێکی وردی زانستی کە مرۆڤ ئێستا وردی ئەکاتەوەو لێی ئەکۆڵێتەوە سەرسام ئەبێت لەو وردەکاریانەی صەحابە کردوویانە بۆ نووسینەوەی ئەم قورئان کە چۆن:

- کارەکەیان بە ئاشکراو بەدیار چاوی هەموانەوە ئەنجامداوە.
- خەڵکی پسپۆڕ لە ئەو کارەدا تەرخان کراوە بۆ ئیشەکە وەك زەیدی کوڕی سابت بۆ نموونە.
- مەرجی زۆر قورس دانراوە بۆ وەرگرتنی قورئانی نووسراو، یان لەبەرکراو.
- بەسەرپەرشتی ئەبوبەکر خۆی بووە کە خەلیفەو سەرۆکی دەسەڵاتە ئیسلامییەکە بووە.
- خوێندنەوەی **(شاذ)**یان وەرنەگرتووە ... هتد.

٧- پاش ئەوە لە سەردەمی حەزرەتی عوسمانیشدا لەبەر ئەو قورئانە کە بەو هەمووە وردەکارییەوە نووسرایەوە، چەندان نوسخەی لەبەر گیرایەوەو لەگەڵ کەسی پسپۆڕو شارەزادا دەنێردران بە هەرێمە ئیبسلامییەکاندا بۆ ئەوەی ڕێگە بۆ جیاوازیو خوێندنەوەی ناپەسەند نەهێڵنەوە.

٨- پاش ئەو سەردەمانەش ئەهلی ئیسلام بەهەموو شێوەیەك عەوداڵی خزمەتکردنی ئەم قورئانە بوون و ئەوەی بوبێتە مایەی زیاتر پاراستنو گەورە ڕاگرتنی قورئان بۆیان کردوە وەك:

- جوانکردنی ڕێنووس و نووسینەوەی پیتەکانی.
- سەرو بۆرو ژێر بۆ کردنی.

ـ تەقسیمبەندی کردنی (جوزئەکانو حیزبەکانو سورەتەکانو ئایەتەکان).
ـ ئەوەی پەیوەندی بە قورئانەوە نەبوویێت دووریان خستۆتەوە لێی وەك تەفسیر، یان حەدیس.
٩ـ بابەتەکانی قورئان کە بە راستی بەڵگەی گەورەیی قورئانن بریتین لە دو لقی گەورە:
یەکەم: یاساو ئەحکامەکان.
دووەم: جگە لە یاساکان.
١٠ـ بابەتە یاساییەکانی قورئان واتە ئەو بابەتانەی کە پێویستە وەك یاساو سیستمی ژیان سەیر بکرێنو کۆنترۆلی بیرو دڵو کۆمەڵگەو دەسەڵات یان پێ بکرێت کە ئێمە کردومانە بەسێ بەشی گەورەوە وەك شوێنەوار هەڵگرتنی زانایانی کۆن کە ئەویش بریتین لە:
١ـ یاسا تایبەتەکان بە (بیروباوەڕەوە).
٢ـ یاسا تایبەتەکان بە رەوشتەوە.
٣ـ یاسا تایبەتەکان بە کۆمەڵگەو دەسەڵاتەوە.
١١ـ هەریەك لەو یاسایانەشمان پۆلێن کردووە بۆ ماددەو بڕگەی جۆراوجۆر کە یارمەتی خوێنەر ئەدات باشتر و ئاسانتر کۆنترۆڵی مەباحیسەکان بکات.
١٢ـ بابەتی جگە لە یاساکانیش وەك بابەتە یاساییەکان پۆلێنکارییەکی وردمان کردووەو کردوومانەتە حەوت جۆر بابەت:
ـ چیرۆکە قورئانییەکان.
ـ نموونە هێنانەوەکانی قورئان.
ـ بەڵگە گەردوونیو دەروونییەکان.
ـ سوێندە قورئانییەکان.
ـ پەیمانو هەڕەشەکان لە قورئاندا.
ـ موناقەشەو بنەماکانی حیوار لە قورئاندا.
ـ ئیعجازە قورئانییەکان.
١٣ـ لە باسی ئیعجازی قورئانیدا بەدرێژی باسی پێنج جۆر ئیعجازمان کردووە، کە هەندێکیان جۆرە ئیجتیهادێکی تێدایەو بەپشتیوانی خوای گەورە لێکۆڵینەوەمان بۆ کردووە، ئەو پێنج ئیعجازەش بریتین لە:
ـ ئیعجازی زمانەوانی.

- ئیعجازی تەشریعی.
- ئیعجازی بونیەوی.
- ئیعجازی ژمارەیی.
- ئیعجازی زانستی.

١٤ـ زانستەکانی قورئان بریتین لە هەموو ئەو زانستانەی باس لە گۆشەیەك لە گۆشەکانی ئەم قورئانە ئەکەن وەك:

- زانستی تەجوید.
- زانستی تەفسیر.
- زانستی مەککیو مەدەنی
- زانستی عامو خاص
- زانستی **مطلق**و مقید
- زانستی ناسخو مەنسوخ
- زانستی غەریبی قورئان.
- زانستی موحکەمو موتەشابیھ.
- زانستی ئەسباب نزول.
- هەندێ زانستی تازەی تری سەردەم.

١٥ـ لە بەشی کۆتایی کە بەشی چوارەمی کتێبەکەیە هەموو ئەو هەڵسوکەوتانەمان داوەتە بەر لێکۆڵینەوە کە خەڵکی هەندێ ئەمسەرو هەندێ ئەوسەری مەسەلەکەیان لێ گرتووە وەك:

- مەسەلەی هەستانەوە لەبەر قورئان.
- ـ ماچ کردنی قورئان و خستنە سەرچاو.
- قورئان خوێندن بۆ مردوو، یان لەسەر مردوو.
- قورئان خوێندن بەبێ دەستنوێژ.
- جێبەجێ نەکردنی هەندێ لە داواکارییەکانی قورئان.
- دەرکردنی جنۆکە و ویردی قورئانی.
- جیاوازی نێوان قورئانو کتێبە ئاسمانییەکانی تر.

١٦ـ له باسی جیاوازی نێوان قورئان و کتێبه ئاسمانییەکانی تردا، باسمان له مێژووی نووسینەوەی ئینجیلەکان کردووه و بەراوردکاریەکمان به نووسینەوەی قورئانو نووسینەوەی ئەو کتێبانه کردووه و گەیشتوینەته ئەو ئەنجامەی که جێگەی خۆیەتی قورئان وەك کتێبێکی ئاسمانی ـ پارێزراو ـ له دەستی خەڵك سەیر بکرێتو سەرباری ئەوەی که قورئان پڕیەتی له ئیعجازی زانستیو تەشریعیو بونیەویو زمانەوانی که به کەس ناوترێت و کەس ناتوانێ وەك ئەو بڵێت.

١٧ـ لەم نووسنیەوەیەدا یەك بەشی گەورەمان لێ دەرهێنا، چونکه کتێبەکەی زیاد له سنوور گەوره و بەقەباره ئەکرد و ئەو ئامانجەکەی کتێبەکەی بۆ نووسراوه له دەست دەرئەچوو، که بریتی بوو له (ئەو گومانانەی ئەخرێنه سەر قورئانو وەڵامەکانانیان).

١٨ـ هەندێ له باس و خواستەکانی ئەم کتێبه خۆماڵی و بێ سەرچاوەن ئومێد ئەکەم لای خوای گەوره له راستی دوورنەکەوتبمەوەو هەقم وتبێت ئەوەندەشم بەسه شاعیر وتەنی:

**كثرت ذنوبي بين الورى فليس لي أحد في الحشر يحمني**

**اتيتك بالتوحيد يصحبه حبّ النبي وهذا القدر يكفيني**

١٩ـ له هەندێ باسدا پەلکێشم زۆر نەکردووه، چونکه له پرۆژەی تیشکدا بەرنامەی ئەوەمان هەیه ئەگەر خوا یارمەتیمان بدات لێکۆڵینەوەی تایبەتی لەسەر بنووسین وەك (ئەسباب نزول) بۆ نموونه.

ئەمانەو له ئەوەڵ و له ئەخیریشدا سوپاس و حەمدی خوا ئەکەم و درود و سەڵاواتیش ئەدەم لەسەر پێغەمبەر و ئالو ئەصحابی پێغەمبەر (**صلى الله عليه وآله وسلم**).

اکرام کریم

شەوی جومعەی پیرۆز

٢٠٠٨/١/٢٣

# سەرچاوەکان

سەرچاوەکان بەپێی بەکارهێنانیان لەسەرەتای کتێبەکەوە تا کۆتایی بەکارهاتوون.


١ ـ جامع الترمذي، الأمام الترمذي.

٢ ـ الإستقامة، إبن تيمية.

٣ ـ قالوا عن الإسلام، عمادالدين خليل.

٤ ـ قصة الحضارة، ول ديورانت.

٥ ـ الوحدة البنائية للقرآن المجيد، طه جابر العلواني.

٦ ـ إرشاد الساري، القسطلاني.

٧ ـ إضواء قرآنية، فتح الله گولن.

٨ ـ المنجد، المؤسسة الكاثوليكية.

٩ ـ مختصر صحيح البخاري، الزبيدي.

١٠ ـ النبأ العظيم، محمد عبدالله دراز.

١١ ـ مباحث في علوم القرآن، مناع القطان.

١٢ ـ المدخل في فقه القرآن، فرج توفيق.

١٣ ـ القرآن منهل العلوم، خالد العبيدي.

١٤ ـ التفسير المنير، وهبة الزحيلي.

١٥ ـ جامع الأحكام، الامام القرطبي.

١٦ ـ مجمع الزوائد، الهيثمي.

١٧ ـ البداية والنهاية، إبن كثير.

١٨ ـ علوم القرآن، أحمد عادل كمال.

١٩ ـ عثمان بن عفان، على الصلابي.

٢٠ ـ سير أعلام النبلاء، الذهبي.

٢١ ـ عثمان بن عفان، صادق عرجون.

٢٢ـ تأريخ القرآن، محمد طاهر الكوردي.

٢٣ ـ فتح الباري، إبن حجر العسقلاني.
٢٤ ـ جامع البيان، الطبري.
٢٥ ـ إضواء البيان في تأريخ القرآن، صابر أبو سليمان.
٢٦ ـ مفردات القرآن، محمد الحمصي.
٢٧ـ التبيان في آداب حملة القرآن، النوري.
٢٨ ـ جامع بيان العلم وفضله، إبن عبد البر.
٢٩ ـ شرح العقيدة الطحاوية، إبن أبي العز الحنفي، عبدالله التركي و شعيب الأرناؤوط.
٣٠ ـ عەقیدەی مەرضیە، مەولەوی، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس.
٣١ ـ أصول الأحكام، حمد الكبيسي و صبحي جميل.
٣٢ ـ تفسير الجلالين، السيوطى و المحلى.
٣٣ ـ السنة النبوية بين أهل الحديث وأهل الفقه، محمد الغزالي.
٣٤ ـ البرهان في علوم القرآن، الزركشي.
٣٥ ـ أزمة الأنسانية ودور القرآن الكريم في الخلاص منها، طه جابر العلواني.
٣٦ ـ الوحدة البنائية للقرآن المجيد، طه جابر العلواني.
٣٧ ـ رسالة الأنبياء دعوة للتدرج.
٣٨ ـ أصول الدين الإسلامي، رشدي عليان و عبدالرحمن الدوري.
٣٩ ـ الإتقان في علوم القرآن، السيوطي.
٤٠ ـ المصطلحات الأربعة، أبو الأعلى المودودي.
٤١ ـ موسوعة الإعجاز العلمي، يوسف الحاج أحمد.
٤٢ ـ یەك لە پەنا سفرو خاڵی بێ بڕانەوە، شەریعەتی، هەژار موكریانی.
٤٣ ـ دیوانی مەحوی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس.
٤٤ ـ دەوڵەتی خیلافەت، اکرام کریم.
٤٥ ـ دراسات قرآنية "الجمع بين القراءتين"، طه جابر العلواني.
٤٦ ـ المال في الإسلام، محمود غريب.
٤٧ ـ مفردات الألفاظ القرآن، الأصفهاني.

٤٨ ـ التعبير القرآني، فاضل السامرائي.
٤٩ ـ سروشت له تەرازوی ژیرییدا، محمد مەلا صالح شارەزووری.
٥٠ ـ مناهل العرفان، الزرقاني.
٥١ ـ أحكام التجويد، محمد سعيد ملحس.
٥٢ ـ فن التجويد، عزت الدعاس.
٥٣ ـ هيداية المستفيد، محمد محمود المشهور بـ(أبي ريمة).
٥٤ ـ مختصر تفسير إبن كثير، الصابوني.
٥٥ ـ كسر الصنم، أبو الفضل البرقعي.
٥٦ ـ المقدمة، إبن خلدون.
٥٧ ـ موجز الأصول في كيفية التعامل مع أحاديث الرسول، اكرام كريم.
٥٨ـ ثقافة الداعية، يوسف القرضاوي.
٥٩ـ عمر بن الخطاب، الصلابي.
٦٠ ـ سيدقطب من الميلاد الى الإستشهاد، د. صلاح الخالدي.
٦١ـ أصول الفقه الذي لايسع الفقيه جهله، عياض السلمي.
٦٢ـ تفسير النصوص، محمد أديب صالح.
٦٣ـ مجموع فتاوى، إبن تيمية.
٦٤ـ أصول الفقه الاسلامي في نسيجه الجديد، الزلمي.
٦٥ـ التبيان في رفع غموض النسخ في القرآن، الزلمي.
٦٦ـ السنة مصدرا للمعرفة والحضارة، يوسف القرضاوي.
٦٧ـ الوجيز في أصول الفقه، عبدالكريم زيدان.
٦٨ـ تأويل مشكل القرآن، إبن قتيبة.
٦٩ـ الاحكام في أصول الاحكام، الآمدي.
٧٠ـ الاصابة في تميز الصحابة، إبن حجر العسقلاني.
٧١ـ التوحيد والوساطة في التربية الدعوية، فريد الانصاري.
٧٢ـ تفسير القرآن الكريم، محمود شلتوت.
٧٣ـ تفسير الكشاف، الزمخشري.

٧٤ـ النبذ في أصول الفقه، إبن حزم.
٧٥ـ دراسات في الفرق والعقائد، عرفان عبدالحميد.
٧٦ـ مجلة البيان، عدد (٩٦).
٧٧ـ الحيدة، عبدالعزيز الكناني.
٧٨ـ لباب المنقول في أسباب النزول، السيوطي.
٧٩ـ الطب النبوي، ابن قيم الجوزي.
٨٠ـ تأريخنا المفترى عليه، يوسف القرضاوى.
٨١ـ عالج نفسك بالقرآن، حسن رمضان.
٨٢ـ نظرات في كتاب الله، حسن البنا.
٨٣ـ أصول التربية الاسلامية، سعيد اسماعيل علي.
٨٤ـ الجامع الصغير، السيوطي.
٨٥ـ جامع العلوم والحكم، ابن رجب الحنبلي.
٨٦ـ إعلام الموقعين، إبن قيم الجوزية.
٨٧ـ الفقه الاسلامي وادلته، وهبة الزحيلي.
٨٨ـ تربية الأولاد في الاسلام، ناصح علوان.
٨٩ـ نزهة المتقين شرح رياض الصالحين، مجموعة من العلماء.
٩٠ـ المغني، ابن قدامة المقدسي.
٩١ـ إحياء علوم الدين، أبي حامد الغزالي.
٩٢ـ أسس العقيدة الإسلامية: عبدالرحمن الميداني
٩٣ـ نظرات في أنجيل برنابا، محمد علي قطب.
هەندێ سەرچاوەی تریش کە لە پەراوێزەکاندا ئاماژەیان پێ کراوە.

# ناوەرۆك

# بڵاوكراوەكانی پرۆژەی ( تیشك )

| زنجیرە | ناوی كتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامكردنی كورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەكارییەكانی مەریوان هەڵەبجەیی لە كتێبی (سێكس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر كەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێندنامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواكەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەكەم" | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیكردن، دیدێكی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەكەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ١١ | مێژووی دێرینی كوردستان "بەرگی سێیەم" | ن: فازل قەرەداغی |

| | | |
|---|---|---|
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیست و سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلام و سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام و سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا<br>پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریایی و شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدورڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی سێیەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، رۆژهەڵاتناسی، ژن، رەخنەی ئەدەبی، رووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ - ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی رەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، رۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |

| | | |
|---|---|---|
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب رەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: رەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی "بەرگی یەکەم" | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |